# دەروونناسیی کۆمەڵایەتی

نووسینی
دکتۆر خەلیل عەبدولڕەحمان معایتە

وەرگێڕانی
سەلاح سەعدی

ناریں

پێشکەشە بە:

★ گیانی پاکی باوکم.

★ دایکی بەسۆزم.

★ هاوسەرم و منداڵانم

# پێشەکی

مرۆڤ لەگەڵ لەدایکبوونەوە چەند پێداویستییەکی سەرەکی هەیە کە تێرکردن و وەدیهێنانیان دەبێتە هۆی بەردەوامیبەخشین بە مانەوەی، وەك پێداویستیی خۆراك و خواردنەوە و پاشەڕۆکردن و سێکس و چەندان پێداویستیی دیکەی پێویست بۆ مانەوەی مرۆڤ و جۆر. جا لەبەرئەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی دابڕاو لە ژینگەکەی و بەتەنها و دوور لە خەڵك ناژێت، بەڵکو لەتەمەنی منداڵییەوە بەر لەوەی پشت بەخۆی ببەستێ، پشت بە خەڵکانی دیکە دەبەستێ، لە کۆمەڵەیەك دەژیەت کە پێی وابەستە دەبێت. بەمەیش پێویستی بە خۆشەویستی و رێزلێگرتن و هەستکردن بە پەیوەستبوون دەبێت، هەروەها پێویستی بەوە دەبێت خەڵکان قبوڵی بکەن و ئەویش خەڵکان قبوڵ بکات، هەر ئەمەیشە لەمیانی پەیوەندی و کارلێکە کۆمەڵایەتییەکانەوە و بەگشت ئەو سیفەتانەی کەوا لە کەسێتییەکەیدان و بەگشت تایبەتمەندی و ورووژێنەرەکانی کۆمەڵایەتییەوە، کاریگەریی بەسەر خەڵکانی دیکە دەبێت و خەڵکانی دیکەیش کاریگەریی لێدەکەن و دەیکاتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی

بابەتەکانی ئەم کتێبە تەژین لەو شتانەی کەوا پەیوەندییان بە تاك و دەورووبەرەکەیەوە هەیە لەمیانی کارلێکی کۆمەڵایەتییەوە.

بابەتی یەکەم بیرۆکەیەکی سەرەکی سەبارەت بە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و بوارەکانی توێژینەوەی نێو ئەم زانستە و گرنگییەکەی لە بوارەکانی ژیان و پەیوەندییەکانی بە زانستەکانی دیکەوە دەخاتەڕوو.

بەشی دووەم باس لە رێبازەکانی لێکۆڵینەوەی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و بیردۆزەکانی لێکۆڵینەوەکەی دەکات. بەشی سێیەمیش باس لە شیاندنی کۆمەڵایەتی دەکات بە گشت شێوە و دەستگەکان و رۆڵی لە پێکهێنانی بونیادی دەروونیی تاك.

بەشی چوارەم بەشێوەیەکی کەمێك دوورودرێژ باس لە چەمك و شێوە و تایبەتمەندییەکانی خود دەکات.

بەشی پێنجەم باس لە تایبەتمەندی و گرنگی و جۆرەکانی کۆمەڵە و دەستەوتاقمەکان و دینامیکیەتەکانی کۆمەڵە و پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و یەکگرتوویی کۆمەڵەکان و کارلێکی کۆمەڵایەتی و پشتگیریکردن و تەبایی و گونجانی نێوان تاکەکان دەکات. بەشی شەشەم باس لە چەمکە سەرەکییەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دەکات کە گرنگترینیان ئاراستەکانی کۆمەڵایەتی و دەروونی و بەهاکان و ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی و ڕای گشتی و دەمارگیری و سەرکردایەتیکردنە کە بەشێکی تایبەتی بۆ تەرخانکراوە.

بەشی هەشتەم باس لە ژینگە و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و کاریگەری و شوێنەوارە دەروونییەکانی شوێن و دیاردەی چڕیی دانیشتووان دەکات.

بەشی کۆتاییش باس لە پیادەکارییەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دەکات لە بوارەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکانی گشتی و ڕێکلام و پەیوەندییە دینامیکییەکەی نێوان کۆمەڵەی قوتابخانەیی.

بابەتەکانی ئەم کتێبە بەشێوەیەك دارێژراون کە تا ئاستێکی زۆر لەگەڵ پلانی بەرنامەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتیی نێو کۆلێژ و زانکۆکانی ئوردن بگونجێن، هیوادارم ئەم کتێبە سوود بە فێرخوازەکانمان و لێکۆڵەرەوە کۆمەڵایەتییەکانمان و مامۆستایانمان ببەخشێ.

(خودایش پشتو پەنایە)

نووسەر

* دەروازە
* پێناسەکردنی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی.
* بوارەکانی لێکۆڵینەوە لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی.
* کارلێکی کۆمەڵایەتی و کاریگەریی کۆمەڵایەتی.
* پێشکەوتنی مێژووییانەی شرۆڤەکردنی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی.
* قۆناغەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی.
* گرنگیی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لە بوارەکانی ژیاندا.
* دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و ئەو زانستانەی پەیوەندییان پێیەوە هەیە.
* دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەنێوان زانستی دەروونناسی و زانستی کۆمەڵناسی.

# دەروازە:

دەروونناسی، ئەو زانستەیە کە رەفتار و کردە ئەقڵییەکانی پشت رەفتار و پاڵنەر و دینامیکیەتەکان و کاریگەری و شوێنەوارەکانی بەشێوەیەکی زانستی ئەوتۆ شرۆڤە دەکات کە دەتوانین بەهۆیەوە لە رەفتار بگەین و پێشبینیی چەشنەکانی بکەین و پلانی بۆ دابنێین.

دەروونناسی وەها پێناسە دەکرێت بەوەی کە: **ئەو زانستەیە گرنگیی بە شرۆڤەکردنی رەفتاری بوونەوەری زیندوو دەدات لە گشت لەلایەنەکانی کەسی و جەستەیی و ئەقڵی و هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی.**

مرۆڤیش بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و لەگەڵ کۆمەڵدا دەژیەت و کاریگەریی لە کۆمەڵ دەکات و کۆمەڵیش کاریگەریی لەسەر بەجێدەهێڵی و رەفتارە کۆمەڵایەتییەکەیشی لەسەر بنەمای ئەو رەفتارە کۆمەڵایەتییەوە هەڵدەسەنگێندرێت کە هەمووان لەسەری رێککەوتوون.

منداڵ لە گەشەکردنی کاتی لەدایکبوونییەوە چەند گۆڕانکارییەکی بەسەردا دێت کە گشت لایەنە کەسییەکانی دەگرێتەوە و لە منداڵێکی دەستەپاچە و بێدەسەڵاتی نێو کۆمەڵە بچووکەکەی خانەوادەوە گەشە دەکات و دەبێتە ئەندامێکی بەرپرس تا دەگاتە ئەو کۆمەڵگەیە مەزنەی کە تیایدا دەژیەت و چەندان بەرپرسیاریەتی لەسەر شانە و لەسەری پێویستە هەوڵی خۆی لەپێناو کارلێکێکی دروست لەگەڵ کۆمەڵەکەدا بخاتە گەڕ.

تاك لەپەیوەندیی خۆی لەگەڵ کۆمەڵدا خۆی لە بەرانبەر چەندان پرسدا دەبینێتەوە کە گرنگترینیان پەیوەندیەکەیەتی لەگەڵ تاکەکانی نێو کۆمەڵەکە و دەبێ رەفتاری ئەوان هەڵبگرێت. رەفتاری کۆمەڵایەتیی تاکیش لە ئەنجامی کارلێکی نێوان خۆی و ژینگەکەیدا دیاری دەکرێت.

# پێناسەی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی:

* دەروونناسیی کۆمەڵایەتی ئەو زانستەیە کەوا شرۆڤەی رەفتاری تاك دەکات و لەمیانی هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتیدا پێکدێت.

* شرۆڤەکردنی رەفتاری وەڵامدانەوەیی (کاردانەوەیی) تاك لەهەمبەر (وروژێنەرەکان)ی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانی نێوانیان.

* شرۆڤەکردنی زانستیانەی رەفتاری تاکە لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتیدا، واتا لەمیانی ئەو هەڵوێستە کۆمەڵایەتییانەی کە تیایدا و لەگەڵیدا کارلێك دەکات.

* شرۆڤەیەکی زانستیانەی رەفتاری بوونەوەری زیندووە وەك بوونەوەرێکی زیندووی کۆمەڵایەتی.

* بابەتەکانی ئەم زانستە شرۆڤەیەکی زانستیانەی ئەو رەفتارانەیە کە مرۆڤ لەژێر کاریگەریی وروژێنەرە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانی نێوانیانەوە ئەنجامیان دەدات.

**مەبەست لە وشەی کۆمەڵایەتی:** وەسفکردنی ئەو پەیوەندیەیە کە لەنێوان تاك و خەڵکانی دیکەی هاورەگەزدا دروستدەبێت و دەرهاوێشتە رەفتارییەکانی ئەو پەیوەندیانەیە.

**هەڵوێستی کۆمەڵایەتی:** کۆمەڵێك هەلومەرج و وروژێنەری کۆمەڵایەتین کەوا چوار دەوری مرۆڤیان تەنیوە و لە ساتێکدا کاریگەریی لە تاك دەکەن، وەك: بینینی یەکێك، بیستنی هەواڵێك ....هتد.

شرۆڤەکردنی زانستی: لێکۆڵینەوەیەکی سیستماتیکە کە پشت بە ڕێبازی ئەزموونگەری دەبەستێت و و پێویستی بە تێبینیکردن و شیمانەکان و ئەزموون و پێوان و هەڵسەنگاندنی ورد و هەڵێنجان (استنتاجات) هەیە.

* ڕەفتار: بریتییە لە هەر گۆڕانێك کە لە جوولە و ئاستی چالاکی (ئەقڵی، جوولەیی، هەڵچوونی) لەکاتێکی دیاریکراو دێتەکایەوە یان هەموو ئەو چالاکییانە دەگرێتەوە کە سەرچاوەکەی بوونەوەری زیندوو بێت.

* وروژێنەر و ئاگادارکەرەوەکان: گشت ئەو گۆڕانکارییانەن کە لە ناوەوە و دەرەوەی تاکدا ڕوودەدەن و وەك پاڵنەرێك کاری لێدەکەن.

*کارلێك: کردەی کاریگەریی دوولایەنەی ئاڵوێرکراوی نێوان دوو سیستم و پترە کە یەکێك کار لە ئەوی دیکە دەکات و بەشێوەیەکی ڕەفتاری پێی کاریگەر دەبێت.

* بوونەوەری کۆمەڵایەتی: ئەو بوونەوەرەیە کە لەگەڵ خزم و کەس و هتد لەنێو کۆمەڵگەدا دەژیەت و کارلێکیان لەگەڵدا دەکات و کاری لێدەکەن و کاریان لێدەکات.

وروژێنەرە ڕاستەوخۆیە سادەکانی کۆمەڵایەتی: ناباوەکان:

- قیژەی بە هاناوەچوون کە دواتر نامێنێ.

– کەسێکم بینی دواتر ونبوو.

– نەخۆشێك دەکەوێتە دۆخی لەهۆشچوون دواتر هەڵدەستێتەوە و دەبینێ پەرستارێك بەسەر سەریەوەیە، دواتر لەهۆش خۆی دەچێتەوە.

**وروژێنەرە راستەوخۆیە ئاوێتەکانی کۆمەڵایەتی:**

- کەسێك چاوی بە هاوڕێیەکی دەکەوێت و گوێی لێدەگرێت لێرەدا (چەندان وروژێنەر) دێنەکایەوە، وەك: شێوازی قسەکردنی، شێوازی مامەڵەی، ئەو هەڵوێستانەی قسەیان لەبارەوە دەکات، ئاماژەکان، گۆڕانی قسە لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە و هتد.

- هەڵوێستی مامۆستا کاتێ چاوی بە فێرخوازانی دەکەوێت.

**بوارەکانی شرۆڤەکردن لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا**




**وروژێنەرە نا راستەوخۆیە سادەکانی کۆمەڵایەتی:**

- وێنەی کەسێك دێتە یادگەت بەبێ ئەوەی ناو و ئەو هەڵوێستەت بیربێتەوە کەوا مامەڵەت لەگەڵدا کردووە.

- ناوی کەسەکەت بیردێتەوە بەبێ ئەوەی شتێکی دیکەت لەبارەیەوە بیر بێتەوە.

**وروژێنەرە نا راستەوخۆیە ئاوێتەکانی کۆمەڵایەتی:**

- یادەوەرییە فرە رەهەندەکان بەتایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پەیوەندییەکمان لەگەڵیاندا هەبووە یان لە هەڵویستی جۆراوجۆردا مامەڵەمان لەگەڵیاندا کردووە.

– یادەوەریی کەسێك لەهەمبەر باوك و دایك و خوشك و برا و مامۆستا و هاوکارانی کار (لەچەندان رەگەز پێکدێت).

– وەبیرهاتنەوەی دامەزراوە و تەلار و گەشت و سەردانەکان و ئەو شارانەی سەفەرمان بۆیان کردووە و هتد.

□ کاردانەوە راستەوخۆیە باوەکانی کۆمەڵایەتی

– قسەکردن، ئاماژەکان، زەردەخەنەکان، پێکەنین، هەڵچوونە جۆراوجۆرەکانی وەك : توورەیی، ترس، غەم، دڵخۆشی، دڵنیایی: لەدوای ئەوەی کەسەکە وروژێنەرەکە بەکاردەهێنێت لە کەسەکەدا دەبیندرێت.

□ کاردانەوە راستەوخۆیە ناباوەکانی کۆمەڵایەتی:

زۆر بەکەمی و دەگمەنی روودەدەن، وەك: دوژمنکاری، لێدان، کوشتن، خۆکوشتن.

□ کاردانەوە نا راستەوخۆیە ئاسایی و نائاساییەکان (نەخۆشیاوییەکان):

واتا دواخراوەکان رووداوی رەفتارین لە شوێن و کاتی دیاریکراودا روودەدەن، وەك: تۆڵەکردنەوە، ئاراستەکان، بیروباوەڕەکان، پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی کە ناتوانین راستەوخۆ بیانبینین وەك" تایبەتمەندی و خەسڵەتە کەسییەکانی چەشنی زیرەکی و توانا تایبەتەکان و خەسلەتەکانی مگێزیی(میزاج)ی وەك هاوسەنگیی ویژدانی و گۆشەگیری.

دەتواندرێ خەسڵەتەکانی مگێزیش دابەش بکرێنە سەر ئاسایی (باو) و نائاساییەکان (ناباوەکان).

# کارلێککردن

کاریگەریی دوولایەنەی ئاڵۆزکراوی نێوان دوو سیستم و پتره (پەیوەندیی نێوان دوو لایەن) کە وەها لە رەفتارێکی یەکێکیان دەکات ببێتە وروژێنەری رەفتاری ئەوی دیکە. گشت هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکانی لەم جۆرە، وروژێنەر – کاردانەوە– وروژێنەر– کاردانەوە و بەم شێوەیەیە.

## کارلێکی کۆمەڵایەتی و کاریگەریی کۆمەڵایەتی:

هەندێ توێژەری دەروونناسیی کۆمەڵایەتی وەها لە کارلێکی کۆمەڵایەتی دەکەن ببێتە جۆرێك لە جۆرەکانی کاریگەریی کۆمەڵایەتی، پێشیانوایە کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بوارەکەی فراون دەبێتەوە بۆ ئەوەی شرۆڤەکردنی گشت جۆرەکانی کاریگەریی کۆمەڵایەتی بگرێتەوە.

یەکێك لەو توێژەرەوانە نیوکمبە کە جیاوازییەك دەخاتە نێو کاریگەریی کۆمەڵایەتیو دابەشیان دەکاتە سەر ئەم سێ جۆرەی خوارەوە:

**جۆری یەکەم: کاریگەریی یەکلایەنە:** لەم جۆرەدا کەسێك یان چەندان کەس کاریگەری لە کردەکانی دەروونیی یەك کەس و چەندان کەس دەکەن، تا لە لایەنێکی رەفتارییەوە بەرزەفتی رەفتار و ئاراستەکانی دەکەن.

**جۆری دووەم: کاریگەریی دوولایەنە:** ئەویش کاریگەریی دوو کەس یان پترە بەسەر یەکتریدا، کاریگەرییەکەیش زنجیرەیی و بەدوایەکدا هاتووە. چەندان تاقیکردنەوە لەسەر ئەم جۆرە کاریگەریانە ئەنجام دراون و ئاماژەیان بەوە کردووە ئەگەر هاتوو کەسەکان بەیەکەوە و لەیەك کاری هاوشێوە و وێکچوودا کاریانکرد،

توانای کارکردن پتر دەبێت و بەرهەم پتر دەکات. ئەلبێرت ئەم دیاردەیەی ناوناوە: (ئاسانکاری و فەراهەمکاریی کۆمەڵایەتی) بەوەیش لێکی دەداتەوە کە گۆشەنیگا و تێڕوانینی خەڵك و بیستنی دەنگیان لەو کاتەی یەك کار ئەنجام دەدەن توندیی ئەو وروژێنەر و ئاگادارکردنەوەیە پتر دەکات کە وەها لە مرۆڤ دەکات کار بکات.

جۆری سێیەم: هەماهەنگیی دوولایەنەی ئاڵوێرکراو: نیوکمب دەڵێت" من زاراوەی هەماهەنگیی دوو لایەنەی ئاڵوێرکراو بەکاردەهێنم بۆ ئەوەی ئاماژە بەو کردانە بکات کەوا کەسێك بەهۆیەوە کاریگەری لەوی دیکە دەکات و لەهەمان کاتدا بە رێگەیەکی "نیمچە رێژەیی"پێی کاریگەر دەبێت.

نیوکمب نموونەیەکی ئەم جۆرە کاریگەرییە کۆمەڵایەتییە یان هەماهەنگیی دوو لایەنەی ئاڵوێرکراو دەبەخشێت بەوەی کە پەیوەندییەکی موگناتیسیانەیە کاتێ لەنێوان دوو کەسدا پەیدا دەبێت، هەروەها ئەو هۆکارانەشی شرۆڤەکردووە کە یارمەتیی سەرهەڵدان و گەشەکردنەکەی دەدەن. کۆی ئەم باسەیشی لە لێکۆڵینەوە تایبەتەکەی خۆیدا باسکردووە، چوونکە جگە لەوەی نموونەیەکی لێکۆڵینەوەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتییە و دەڕژێتە نێو شرۆڤەکردنی دیاردەی کارلێکی کۆمەڵایەتییەوە، لەهەمان کاتیشدا لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا بە بەڵگە و بنەمایەکی رێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی دادەندرێت.

هەروەها " سویف" حەز بەوە دەکات بواری دەروونناسیی کۆمەڵایەتی فراوان بکات، پێشیوایە بریتییە لە شرۆڤەکردنی کۆی وروژێنەرە کۆمەڵایەتییە راستەوخۆیەکان و ناڕاستەوخۆییەکان و سادە و ئاوێتەکان. هەروەها لەخۆگری شرۆڤەکردنی کۆی کاردانەوە راستەوخۆ و ناراستەوخۆ و ئاسایی و نائاسایی و

نەخۆشییاوییەکانە. ئەو هەڵوێستانەی وروژانی کۆمەڵایەتی – کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی شرۆڤەیان دەکات– دابەش دەکاتە سەر ئەمانەی خوارەوە:

**یەکەم: هەڵوێستەکانی تایبەت بە کەسان و خەڵکانی دیکە کە دابەش دەبنە سەر:**

١- ئەو هەڵوێستانەی خەڵکانی دیکەیش دەگرێتەوە.

٢– ئەو هەڵوێستانەی کۆمەڵەکان دەگرێتەوە.

٣– هەڵوێستەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتیی وەك هەڵوێستەکانی حەشامەتی خەڵك و بینەران، رەنگە کەسانی بەشداربووی نێو ئەم کارلێکە بەچەند رایەڵەیەکی کەسی و کۆمەڵایەتی و بەیەکەوە پەیوەستبن، رەنگە وەهایش نەبن.

**دووەم: هەڵوێستەکانی تایبەت بە وروژێنەرە رۆشنبیرییەکان، کە دابەش دەبنە سەر:**

١- هەڵوێستەکانی تایبەت بە رۆشنبیریی مادیی وەك: دەرەنجامە کردارییەکانی کارلێکی خەڵك کە دەتواندرێ ببینرێن و هەستیان پێبکرێت، بۆنموونە: بەرهەمەکانی تەکنۆلۆژی و ئامرازەکانی گواستنەوە و هاتووچوو.

٢– هەڵوێستەکانی تایبەت بە رۆشنبیریی نامادیی وەك: زمان و ئاین و ئۆرگانەکانی کۆمەڵایەتی.

نزیکترین پێناسەیەك کە بواری دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات زۆرێك لەو روخسار و دیمەنانە دیاریی دەکات کە لە دیاردەی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا بوونیان هەبوو و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی شرۆڤەی دەکرد. پێناسەکەی هارتلیە و هارتلی دەڵێت" دەروونناسیی کۆمەڵایەتی گرنگیدانی خۆی لەسەر ئەو لایەنانەی رەفتاری

كۆمەڵایەتیـدا چـڕ دەكاتـەوە كـە لـەكاتی كـارلێكی نێـو پەیوەندییـە بەرچـاوەكانی كۆمەڵایەتیی خەڵك لەگەڵ یەكتریدا بوونیان شكلگیر دەبێت ".

لەمەوە دەبینین كە دەروونناسیی كۆمەڵایەتی لە ڕێگەی پێشكەوتنی خـۆی، بـەرەو لای دیـاریكردنی بوارەكـەی خـۆی چـووە و تـەنها لـە دیـاردەی كـارلێكی كۆمەڵایەتیـدا كورتبووەتـەوە. ئەمـەیش مەسـەلەیەكی سروشـتییە، چـوونكە ئەگـەر شـرۆڤەی گـشت ورووژێنەرەكانی كۆمەڵایەتی بكات لە كاریگەری دروستكردن لەسەر ڕەفتاری تاكاكانـدا، مانای ئەوەیە كـە شـرۆڤەی گـشت شـتێكی دەروونناسـیی تـاك دەكـات، چـوونكە هـیچ ڕەفتارێكی تاكەكەسی نییە بـە ورووژێنـەری دەرەكـی و نـاوەكیی كۆمەڵایـەتی كاریگـەر نەبێت. كاتێ تۆ لـە بەیانیـدا پۆشـاكێك بـۆ پۆشـین هەڵدەبـژێریت ئـەوا دەكەویتـە بـەر ورووژێنەری كۆمەڵایەتییەوە، چوونكە تۆ حسێب بۆ ئەو كەسە دەكەیت كـە دەیبینیـت. كاتێ پۆلیسی هاتووچوو لەسـەر ڕێگەیەكدا ئاماژەیـەكت بـۆ دەكـات، بەهـەمان شـێوە دەكەویتە بەر ورووژێنەری كۆمەڵایەتییەوە. هەروەها كاتێ هاوپۆلانی كۆلێـژ دەبینیـت و بە ڕەنگێك سەرسام دەبیت و بیر لە كێشانی جگەرە دەكەیتەوە و ڕۆژی سـەفەركردنت بیردێتەوە بۆ ئەوەی لە شارەكەتەوە بچیتە شارێكی دیكە و لەوێ بخـوێنی، دیسانەوە دەكەویتە بەر ورووژێنەری كۆمەڵایەتییەوە. تۆ لە گشت ساتەكانی ژیانتدا دەكەویتە بەر ئەم ورووژێنەرە كۆمەڵایەتییانەوە، جا لەماڵەوە بیت یانیش لە ڕێگە و زانكۆ و یاریگـە و مۆزەخانە و هتد. جا ئەگەر دەروونناسیی كۆمەڵایـەتی كـۆی ئـەم ڕەفتارانـەی شـرۆڤە بكردبایـە كـە تـاك بـەهۆی ورووژێنەرەكانـەوە ئـەنجامی دەدات، ئـەوا گـشت بوارەكـانی دەروونناسـیی دەگرتـەوە و دەبوویـە دەروونناسـیی پـەروەردەیی و دەروونناسـیی گشتیو دەروونناسـیی ئـەكلینیكی و دەروونناسـیی گەشـەكردن، بـەڵام دەروونناسـیی

کۆمەڵایەتی هەڵوێستێکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی هەڵدەبژێرێت، ئەویش هەڵوێستی تاکە لەو کاتەی کە لەگەڵ کەسێك یان کۆمەڵە کەسێکدا چەند ورووژێنەرێکی کۆمەڵایەتی بەردەوامی دوولایەنە ئاڵوێردەکات، دەرەنجامی رەفتاریش لەم هەڵوێستەدا تەنها رەفتاری خۆی و رەفتاری کەسی بەرانبەر و کەسانی دیکە نییە، بەڵکو دەرەنجامی رەفتاری ئەم هەڵوێستە پوختەی رەفتارییە کە تیایدا هەردوو لا تێکەڵ و ئاوێتەی دەبن و بیرۆکەی هەر لایەك لەهەمبەر ئەوی دیکەدا و سەبارەت بە بابەتە هاوبەشەکە دەچێتە نێو پێکهاتەکەیەوە.

# پێشکەوتنی مێژووییانەی شرۆڤەکردنی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی

ئەوەی گرنگی بە شرۆڤەکردنی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دەدات، دەتوانێت دەستنیشانی چوار سەرچاوەی سەرەکیی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بکات کە لەلایەن سارجنت وولیامسۆن دیاریی کراوە بەوەی کە :

نووسینەکانی فەیلەسووفانی کۆمەڵایەتی و ڕێبەرانی ئەنترۆپۆلۆژیا و زانایانی بواری پێشکەوتن و زانایانی کۆمەڵناسن.

## یەکەم: فەیلەسووفانی کۆمەڵناس:

ئەو نووسینانەی کە چەندان گەورە فەیلەسووفی کۆمەڵایەتی پێشکەشیانکردووە چەندان هزر و بیردۆزی قووڵ لەبارەی سروشتی مرۆیی و سروشتی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا و ڕەمەك و خووەکان و چەندان گرفتی دیکە لەخۆ دەگرێت کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی شرۆڤەی دەکات، بۆنموونە: نووسینەکانی ئەفلاتون سەبارەت بە کۆمارەکەی و نووسینەکانی ئەرستۆ سەبارەت بە سیاسەت و ئاکار و نووسینەکانی جۆن لۆك و جان جاك ڕوسۆ کە چارەسەری گرفتەکانی مرۆڤ دەکەن وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی لە هەمان خولگەدا دەخولێنەوە. هەروەها ئەو نووسینانەی سەبارەت بە یاسا و سیستم و دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و ئاوەدانکردنەوەی مرۆیی و ئاین و زمان و هتد نووسراون پەیوەندیی پتەویان پێیەوە هەیە.

## دووەم: ڕێبەرانی ئەنترۆپۆلۆژیا:

**ئەنترۆپۆلۆژیا:** ئەو زانستەیە کە شرۆڤەی ڕەگەزە زیندووەکان و رۆشنبیرییەکانی مرۆڤ دەکات، چوونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و لەنێو چەند کۆمەڵەیەکدا لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دەژیەت و توانای قسەکردن و هەڵێنجان و گشتاندن و پەیوەندی و گواستنەوەی کارامەیی و شارەزاییەکان و ئاڵوێرکردنی هەیە.

هەروەها زانستی ئەنترۆپۆلۆجیا گرنگیی بە شرۆڤەکردنی رۆشنبیریی مرۆیی دەدات لە رابردوو و ئێستە و ئایندەدا و شرۆڤەی خوونەریت و رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەکان دەکات. لەم باسەدا ئەوەمان بۆ روونده‌بێتەوە کە گرنگیدانی ئەنترۆپۆلۆژیا لەسەر شرۆڤەکردنی چۆنیەتیی وەدەستهێنانی ئەو رۆشنبیرییەدا چڕ دەبێتەوە کە تاك لە کۆمەڵدا وەدەستیدەهێنێت، ئەوەیش دیاریی دەکات کە خوو و خدەکان چۆن سەرهەڵدەدەن و چۆن لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە.

## سێیەم: زانایانی بواری پێشکەوتن:

زۆرێك لە لێکۆڵەرانی زانستەکانی کۆمەڵایەتی وەك کارڵ مارکس و سپێنسەر کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی داروینەوە، داروینیش لە زۆر لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیی هاوشێوەدا بەشداری کردووە، چوونکە لە کتێبەکەی بەناوی(اصل الانواع)دا شوێنپێی پێشکەوتنی مرۆڤی لە شێوە هەرە نزمەکەی بەرەو شێوە بەرز و هەڵکشاوەکەی هەڵگرتووە و جەختی لەسەر گرنگیی بەرهەمە شارستانییەکانی وەك زمان و دامێنانەکان و سیستمەکانی هاوکاری و هاوسۆزی و هەستیاربوون لەهەمبەر رەخنە و هاندانا کردووەتەوە.

داروین روونیکردووەتەوە کە مانەوەی مرۆڤ بەندە بە کردەی هەڵبژاردن و بژاری سروشت بە مانا دەروونیی کۆمەڵایەتییەکەی پتر لە مانا بایۆلۆژییەکەی زاراوەکە، مانەوە بۆ باشتریش لە رووی لایەنەکانی ئەقڵی و کۆمەڵایەتی و لایەنەکانی ئەندامییەوەیە.

هەروەها هێربێرت سپێنسەر ئەوەی باسکردووە کە چاکە و دەستپێشخەریی لە بەکارهێنانی رێبازی پێشکەوتن و گەشەکردن و هێزی خۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا

هەبووە، چاکە و دەستپێشخەریەکەیشی لەوەدا بووە لە نووسینەکانیدا جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە ژیان کردەی هەماهەنگی و گونجانی بەردەوامە کە تیایدا ژیانی ناوەکی لەگەڵ پەیوەندییەکانی دەرەکیدا دەگونجێت، ئەم مەسەلەیە خودی پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتیش دەگرێتەوە. هەروەها پێشبینیی سەرهەڵدانی " زانستی کۆمەڵایەتی" کردووە کە شرۆڤەی تاك دەکات و تاکیش دەبێتە ئەندامێکی کۆمەڵە و چۆنیش کۆمەڵ دەبێتە یەکەیەکی ئەندامی.

### چوارەم: زانایانی کۆمەڵناس

ئۆگست کومت بە دامەزرێنەری زانستی کۆمەڵایەتی دادەندرێت، ناوبراو پێیوایە کە مرۆڤ بە سیفەت و سروشتی خۆیەتی و ئەقڵی مرۆییش تەنها لە کۆمەڵگەدا گەشە دەکات و دەبێ هەمیشە تاك لەرووی ئەو هەلومەرجانەوە شرۆڤە بکرێت کە تیایدا دەژیەت. لەیەکەمین زاناکانی کۆمەڵناسی فەرەنسیش ئەمیل دورکایمی خاوەنی بیردۆزی ئەقڵی بەکۆمەڵە، ئەم بیردۆزەیش دەچێتە سەر ئەو مەسەلەیەی کە کۆمەڵ هەست و بیرکردنەوە و رەفتاری خۆی هەیە کە جیاوازە لە بیرکردنەوە و هەست و رەفتاری تاکەکان.

## دامەزرێنەرانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی:

ئەو زانا کۆمەڵایەتی و فەیلەسووفە کۆمەڵایەتییانەی پێشتر باسمانکردن، رێگەیان بۆ بەدیارکەوتنی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی خۆشکرد. ئێستە دەتوانین باسی چوار کەس بکەین لەوانەی کە بە دامەزرێنەری دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دادەندرێن، ئەوانیش:

١- تارد: پیاوێکی و دادگەی فەرەنسی و یاسایی بوو؛ شرۆڤەکانی لەهەمبەر تاواندا پاڵنەرێك بوو بۆ ئەوەی ئەو باوەڕەی لەلا دروستبکات کە لاساییکردنەوە بنەمای کردەکانی کۆمەڵایەتی و گەیەنەرە بەرەو ژیانی کۆمەڵایەتی و بنەمای کارلێکی کۆمەڵایەتییە.

٢- لیبۆن: کتێبێ جەماوەری نووسیوە، ئەم کتێبە لەبارەی سایکۆلۆژیای جەماوەر بەیەکەمین لێکۆڵینەوەکانی دادەندرێت و پێیوایە جەماوەر ئەقلێکی بەکۆمەڵی هەیە. ناوبراو رۆڵێکی مەزنی لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا هەبوو و چەمکەکانی پزیشکیی ئەقڵی لە لێکدانەوەی رەفتاری بەکۆمەڵدا بەکارهێناوە.

٣- رۆس: بەوە پێناسەی زانستی کۆمەڵایەتی کردووە کە " لقێکی مەعریفەیە و خەریکی شرۆڤەکردنی کارلێکی دەروونیی نێوان مرۆڤ و ژینگە کۆمەڵایەتییەکەیەتی". ناوبراو پێیوایە ئەو دەروونناسییە کۆمەڵایەتییەی شرۆڤەکردنی کاریگەرییە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی پشتگوێدەخات پڕ لە کەموکورتی دەبێت و هیچ سوودێك نابەخشێت. بەبێ کارلێکی کۆمەڵایەتیش گەشەکردنی منداڵ لەرووی دەروونییەوە لە ئاستێك دەوەستێت کە لە ئاستی دەبەنگ و کەودەکان بەرزتر نییە.

٤- ولیام ماکدۆگل: شرۆڤەکانی خۆی لە بواری دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای تاك ئەنجام داوە و پێیوابووە چەند رەمەکێك هەن کە بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی و کارلێکی کۆمەڵایەتین و وەك خولیا و ئاراستەگری وەهان و بۆ حەوت

رەمەکی سەرەکیی پۆلینیکردوون کە هەر یەکێکیان دۆخی هەڵچوونیی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئەوانیش:

* هەڵاتن: هەڵچوونەکەیشی ترسە.
* نەگونجان و دژایەتی (النفور) هەڵچوونەکەیشی بێزهاتنەوەیە.
* حەزی شتزانین (استطلاع) هەڵچوونەکەیشی سەرسامبوونە.
* شەڕکردن و هەڵچوونەکەیشی تووڕەییە.
* سۆز بۆ دایباب.
* چوونە ژێربار، هەڵچوونەکەیشی (ملکەچبوون و گوێڕایەڵیە).
* جەختکردنەوە لەسەر خود هەڵچوونەکەیشی (شانازیکردنە).

دواتر دەروونناسیی کۆمەڵایەتی کەوتە ژێر کاریگەریی شێوازە مەنهەجییەکانی زانستی کە لەسەر بنەمای تاقیکردنەوە و پێوان و تێبینییەکانەوە داڕێژراون.

## قۆناغەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لە ١٩٤٠-١٩٨٠

بارۆن و بایرن لە کتێبەکەی خۆیاندا بەناوی **"دەروونناسیی کۆمەڵایەتی تێگەیشتنی کارلێکی مرۆیی"** باسی ئەوەیانکردووە کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە زۆر بەخێرایی پێشکەوتووە و بوارەکانی لەچەندان ئاراستەوە فراوانبووە.

**یەکێك لە پرسە گرنگەکانی پەنجاکان:** "پرسی کاریگەری و ئەندامیەتیی کۆمەڵە بوو لەسەر رەفتاری تاك و بابەتی پەیوەندیی نێوان خەسلەت و تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکانی کەسی و لایەنەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی بووە.

گرنگترین رووداوەکانی ئەم قۆناغەیش گەشەکردنی بیردۆزی (نەگونجان و دژایەتیی مەعریفی) بوو، کە لە رەهەند و ئاراستەکانی خۆمان و رەفتارەکانماندا دەیبینین، ئەم

بیردۆزە چەندان کەسی بەرەو لای خۆی راکێشا کە چەندان لێکۆڵینەوەیان لەبارەیەوە ئەنجام دابوو.

لەو پرسانەی کە لە شەستەکاندا بەدیارکەوتن:" راکێشان و خۆشەویستی و دوژمنایەتی و توندوتیژی و درککردنی کۆمەڵایەتی بوون.

لەو پرسانەیش کە لە حەفتاکاندا بەدیارکەوتن: بابەتی ئەو هۆکارانە بوون کە لەپشت رەفتار دەوەستن یانیش دەچنەوە سەر رەفتار و دەخرێنە پاڵیەوە ئەویش" پرسی مەعریفەی کۆمەڵایەتی بوو کە بەهۆیەوە هەواڵی خەڵکانی دیکەمان بیردێتەوە و تێیدەگەین" واتا بابەتی کاریگەریی هۆکارەکانی ژینگەیی وەك کاریگەریی گەرما و هەراوزەنا بەسەر رەفتاری کۆمەڵایەتیەوە.

ئەو بابەتانەی کە لە هەشتاکاندا بەدیارکەوتن بریتی بوون لە: دوژمنایەتی" ئاراستەکان" بەکێشکردن و تێکەڵ و ئاوێتەبوون" سازشکردن و گونجان و و قەرەبالغی و دوورکەوتنەوەی کۆمەڵایەتی" کردەکانی کۆمەڵ: سەرکردایەتی و بریاردان" درککردنی کەسی" پەیوەندیی نا واچەیی" کاریگەریی کۆمەڵایەتی" رەفتاری یارمەتیدان" گەشەکردنی کەسێتی و کۆمەڵایەتی" رۆڵەکانی سێکسی و جیاوازیی نێوان دوو رەگەزەکە."



## گرنگیی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لە بوارەکانی ژیاندا:

مادام تاك و کۆمەڵگە و کردەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی هەن، دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەبوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا گرنگییەکی مەزنی هەیە.

ئێستە باس لە گرنگیی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دەکەین لە بوارەکانی ژیاندا:

### یەکەم: لە بواری پەروەردە و فێرکردندا:

پەروەردە کردەی ژیانە کە تاك تیایدا فێری ژیانکردن دەبێت و کەسێتییەکەی لەهەموو لایەنەکانی کەسیدا بەشێوەیەکی تەواو گەشەدەکات. دەروونناسیی کۆمەڵایەتی ئەو زانیاریانە پێشکەش بە مامۆستا دەکات کە تێگەیشتن و بۆچوونی لەهەمبەر بنەمای گەشەکردنی کۆمەڵایەتیانەی تاك پتەو دەکەن. هەر بەهۆی ئەم زانستەشەوە زانیاری لەهەمبەر سروشتی ئەو پەیوەندییانە وەدەستدەهێنیٚ کە لەنێوان تاکەکانی فێرگەدا سەرهەڵدەدات (بەڕێوەبەر، فەرمانبەران، دەستەی وانەبێژ، فێرخوازان).

گرنگترین ئەو بابەتانەی دایبابان و مامۆستایان لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا گرنگیی پێدەدەن، ئەمانەی خوارەوەن:

- ☐ سەرکردایەتی و ڕێگەکانی لە کردەی پەروەردەییدا.
- ☐ ئاراستە و خولیاکانی کۆمەڵایەتی.
- ☐ پێکهێنانی خانەوادەی فێرگە (وەك کۆمەڵەیەك) و بونیاد و یەکگرتوویی و کارلێکی نێوانیان.
- ☐ کۆمەڵەکانی پەروەردەیی و دەروونڕوستی لە فێرگەدا.
- ☐ فێرگە وەك یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی.
- ☐ خانەوادە وەك یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی.

### دووەم: لە دەروونڕوستی و چارەسەری دەروونیدا

لەکاتی شرۆڤەکردنی نەخۆشییەکانی دەروونیدا، هەردەبێ ئەو هۆیانە شرۆڤە بکرێن کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشی دەروونی و ماکەکانی دەستنیشانبکرێن و دواتر نەخۆشییەکان دیاریی بکرێن و دواتر چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە

هۆ و ماکەکانی نەخۆشییەکانی دەروونی کۆمەڵایەتین، دەستنیشانکردنەکەیشی پشت بە شرۆڤەکردنی لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی نەخۆش دەبەستێت و لەخۆگری چارەسەری دەروونی و کۆمەڵەییە.

**هۆیە کۆمەڵایەتییەکانی نەخۆشییەکانی دەروونی ئەمانەن:**

- ژینگەی کۆمەڵایەتی پڕ لە فشار و ژینگەی هەژار و خراپ.
- ژیار و شارستانیەت و پێشکەوتنی خێرا.
- جەنگ و شەڕوشۆڕ
- شیاندن و پەروەردەکردنی نادروستی کۆمەڵایەتی.
- کار و هەلومەرجە نەگونجاوەکانی وەك بێکاری و بارودۆخی خراپی کرێکاران و نەگونجانی پیشەیی.
- تێکچوون و شڵەژانی پەیوەندییەکانی خانەوادەیی.
- گرفتی کەمینە نەتەوەییەکان و کارو رەفتاری تێکدەرانە.
- هاوڕێی خراپ و رەفتاری ناوازە لە کۆمەڵ و نەگونجانی کۆمەڵایەتی.

**□ ماکە کۆمەڵایەتییەکانی نەخۆشییەکانی دەروونی:**

- نەگونجانی کۆمەڵایەتی.
- کەسێتیی سایکۆباسی و لادانەکان.
- هەستی دوژمنایەتی.
- داهێنان لەبواری تاوانکاریدا.

□ **لـەکاتی دەستنیـشانکردنی نەخۆشـییەکانی دەروونـی پـسپۆڕی کۆمەڵایەتی ئەم شتانە ئەنجام دەدات:**

- چاوپێکەوتن و سەردانەکانی مەیدانی.
- شرۆڤەکردنی مێژووی دۆخەکە و کۆکردنـەوەی زانیـاری و شـرۆڤەکردنی ژینگـەی کۆمەڵایەتیی نەخۆش.
- لێکۆڵینەوە لە مێژووی تەندروستیانەی نەخۆش و مێژووی خانەوادەکەی، کەشـی خانەوادە، مێژووی پـەروەردەیی، مێـژووی پیـشەیی، هاوسـەری و حـەز و مەیلـەکان و هتد.

□ **لە چارەسەکردنی نەخۆشییەکانی دەروونـی چارەسـەری کۆمەڵایـەتی ئەمانە دەگرێتەوە:**

- چارەسەری بەکۆمەڵ بەگشت شێوازە جۆراوجۆرەکانی.
- چارەسـەرکردن بـە گەمـە و چارەسـەری سـەرقاڵکردن و کـات بەسـەر بـردن و هەواگۆڕی.
- چارەسەرکردن بە کار.
- شیاندنی کۆمەڵایەتی.
- ئاساییکردنەوەی کۆمەڵایەتی.

**سێیەم : راژەی کۆمەڵایەتی:**

گرنگترین ئامانجەکانی راژەی کۆمەڵایـەتی وەدیهێنـانی ژیـانێکی باشـترە بـۆ تـاك و کۆمەڵگـە و کارکردنـە بـۆ چـاودێریکردن و سەرپەرشـتیکردنی کاریگـەریی دوولایەنـەی ئاڵۆێرکراو و کارلێکی نێوان تـاك و کۆمەڵـە و کۆمەڵگـە و گرنگیـدان بـە چـاودێریکردنی کۆمەڵایەتی و دەروونیی تاکەکانی کۆمەڵگە.

ئەرك و کاری پسپۆڕی کۆمەڵایەتی لە گشت بوارەکاندا گرنگیی بە زۆرێك لە بابەتەکان دەدات. لەو پرسانەی کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی گرنگییان پێدەدات:

* کۆمەڵە (جۆرەکانی، بونیادەکەی، کارلێکەکەی، هتد).
* گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و کردەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی.
* سایکۆلۆژیای سەرکردایەتیکردن.
* گۆڕانی کۆمەڵایەتی.

شرۆڤەکردنی دۆخ و نەخۆشییەکانی کۆمەڵایەتی

## چوارەم: راگەیاندن و پەیوەندییەکانی گشتی:

یەکێك لەو بوارانەی کە رۆڵێکی مەزنی لە کردەکانی کاریگەری بەسەر رەفتاری تاك و کۆمەڵەکاندا هەیە راگەیاندن و پەیوەندییەکانی گشتین کە رۆڵی هوشیارکردنەوەی جەماوەریان لەسەر شانە، هەروەها پسپۆڕی بواری پەیوەندییەکانی گشتی کار بۆ بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەویی نێوان کارگەران دەکات.

پێشکەشکردنی مادەکانی راگەیاندن و پەیوەندیکردن بە جەماوەر و ئاگادارییەکان پێویستی بەوە هەیە کەسی پسپۆڕ شارەزایی لەم بوارانەی خوارەوەدا هەبێت:

* ئامرازەکانی راگەیاندن و پەیوەندیی بەکۆمەڵ.
* شرۆڤەکردنی جەماوەر و کۆمەڵە و رای گشتی.
* رێگەکانی راپرسی و روپێو و شرۆڤەکردنی رای گشتی.
* پەیوەندییەکانی گشتی و رۆڵی لە پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە.

## پێنجەم: بەرهەم

گرنگیی پیادەکاریی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەبواری پیشەسازی و کار و چەندان لایەنی دیکەی وەك تێگەیشتن لە پەیوەندییەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و شرۆڤەکردنی گرنگیی پەیوەندییەکانی مرۆیی لە کرێکاران و گرنگیی کارلێك و پەیوەندیی نێوانیان و نێوان ئەو کەسانەدا بەدیار دەکەوێت کە لە بەرهەمدا سەرپەرشتیان دەکەن، هەروەها باس لە گرنگیی بەشداری کرێکاران دەکات لە پلاندانان و سەرپەرشتیکردن و جێبەجێکردندا، هەروەها دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بەشداری لە بواری پیشەسازی و کاریشدا دەکات، ئەویش لەم دۆخانەی خوارەوەدا:

* هەڵبژاردن و راهێنان لە پیشەسازیدا.
* گرفتەکانی وازهێنان لە کار و دواکەوتن و نەهاتن بۆ سەر کار.
* رۆڵی کۆمەڵایەتیی سەرپەرشتیاران و بەڕێوەبەران و کارگێڕان و کرێکاران.
* گیانی مەعنەوی لە کار و ئەو هۆکارانەی کاری تیادا دەکەن.
* دینامیکیەتەکانی کۆمەڵە و دەروونڕوستی لە کۆمەڵەدا.
* ئاراستەکانی هەمبەر کار و کۆمەڵەی کرێکاران.

## شەشەم: هێزەکانی چەکدار

هێزەکانی چەکدار رۆڵێکی گرنگ لە کۆمەڵگەدا دەگێڕن، دەروونناسیی کۆمەڵایەتیش گرنگییەکی مەزنی لە بواری سەربازیدا هەیە و لەم خاڵانەی خوارەوەدا روونده‌بێتەوە:

* شرۆڤەکردنی بنەماکانی رەفتار و کارلێکی کۆمەڵایەتیی نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان و یەکەکانی سەربازیدا لە کاتی شەڕ و ئاشتیدا.

* شرۆڤەکردنی ڕەفتاری کۆمەڵایەتییانەی تاکەکان لە کۆمەڵەی بچووک و یەکە گەورەکاندا.

* شرۆڤەکردنی ئەو کردە جۆراوجۆرانەی دەبنە هۆی ئەوەی تاکەکان ئەو شێوازە ڕەفتاریانە فێرببن کە لەسەریان پێویستە لە ژیانی سەربازیدا پێوەی پابەند بن.

* شرۆڤەکردنی کارلێکی کۆمەڵایەتیی نێوان تاکەکانی کۆمەڵە و سەرکردایەتی و نێوان کۆمەڵە و کۆمەڵەکانی دیکە.

* شرۆڤەکردنی کردەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی.

* شرۆڤەکردنی ئەو هۆکارە دەروونیی کۆمەڵایەتیانەی کە کاریگەرییان لە گۆڕینی ڕەفتاری نێو جەنگی دەروونیدا هەیە، وەك: پروپاگەندە و ئاگاداری و ڕاگەیاندن و گۆڕینی ئاراستەکان و دەمارگیری و شرۆڤەکردنی ڕای گشتی.

## کۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتی:

دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەکاتی شرۆڤەکردنی تاك و کۆمەڵەکاندا گرنگیی بە بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی باشتر دەدات کە لەسەر ڕەفتاری هەر یەکە لە تاك و کۆمەڵگە وەستابێت، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی گرنگیی بە کاروبارەکانی نێو کۆمەڵگە دەدات و ئەم گرنگیدانەیشی لەمانەی خوارەوەدا کۆدەبێتەوە:

– دروستکردنی پەیوەندیی دروستی نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان.

– گرنگیدان بە شرۆڤەکردنی سەربەستی و دیموکراسی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیو جەماوەر و سەرکردایەتی و لاساییکردنەوەی کۆمەڵایەتی و بەهاکان و پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و پشتبەخۆبەستان لە بەرهەم و هێزی پاڵنەر و ئاراستەکان و هتد.

# دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و ئەو زانستانەی پەیوەندییان پێیەوە هەیە




## دەروونناسیی گەشەکردن: Developmental Psychology

دەروونناسیی گەشەکردن زانستێکە و شرۆڤەی گەشەکردنی منداڵ و پێشکەوتن و ئەو هۆکارە جۆراوجۆرانە دەکات کەوا کاریگەرییان بەسەر گەشەکردن و پێشکەوتنەوە هەیە.

دەروونناسیی گەشەکردن ئەو پێشکەوتنە ئەقڵی و هەڵچوونی و جەستەیی کۆمەڵایەتیانە دەگرێتەخۆ کە هەر لەگەڵ لەدایکبوونەوە تا کاتی تەواوپێگەیشتن بەسەر مرۆڤدا دێت. هەروەها گرنگی بە داتا و سیستمە کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەرییان دەدات بەسەر منداڵ لە قۆناغەکانی گەشەکردنیدا.

گشت مرۆڤێك پێویستی بەو زانستە هەیە بۆ ئەوەی کردەی فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵ رێکبخات و دەرفەتەکانی گەشەکردنی تەواوی ئاسایی هاوسەنگی بۆ دەستەبەر بکات.

## ٢- دەروونناسیی فیسیۆلۆژی Physiological Psychology

دەروونناسیی فیسیۆلۆژی شرۆڤەی پەیوەندی و وابەستەییەكانی نێوان چالاكییەكان یان كردەكانی فیسیۆلۆژی و رەفتار دەكات، چوونكە چالاكیی ماسوولكەیی پشت بە پێكهاتەی جەستەیی و بەتایبەتیش ئۆرگانی دەماری (جهاز العصبي) و ئەندامەكانی هەستكردن و ماسوولكەكان و رژێنەكان و كردەكانی كیمیایی دەبەستێت.

دەروونناسیی فیسیۆلۆژی یارمەتیدەری زانین و ئاشنابوونە بەو مەڵبەندانەی مێشكو دەماغ كە تایبەتن بە بیركردنەوە و وەبیرهاتنەوە و بیستن و بینین و جۆرەها كردەی دیكەی نێو ئەم مەڵبەندانە.

دەروونناسیی فیسیۆلۆژیی بە سنووری جیاكەرەوەی نێوان دەروونناسی و زانستی توێكاری و دەمار دادەندرێت، هەروەها زۆرترین ئەو ئەركە فیسیۆلۆژیانەی كە پەیوەندییان بە دیاردەكانی دەروونییەوە هەیە كردەی دەماریی رێكخەر و هاوسەنگكەری كردەكانی دیكەیە و كامڵبوونی بوونەوەری زیندوو دێنێتەكایەوە.

دەروونناسیی فیسیۆلۆژی دەكەوێتە نێوان دەروونناسی و زانستی توێكاری و شرۆڤەی كاریگەریی زانستی توێكاریی دەكات بەسەر دەروونناسیدا.

## ٣- دەروونناسیی كۆمەڵایەتی و لێكۆڵینەوەكانی كۆمەڵایەتی (زانستی كۆمەڵناسی و ئەنترۆپۆلۆژیا).

كۆمەڵناسی ئەو زانستەیە كە شرۆڤەی سەرهەڵدان و پەیدابوونی سیستم و دیاردەكانی كۆمەڵایەتی وەك ئاین و زمان و یاسا و ئاكار و پێشكەوتنیان دەكات، هەروەها شرۆڤەی رەفتارەكانی كۆمەڵەكان و پایە ئابووری و سیاسییەكانی دەكات.

هەروەها شرۆڤەیەکی زانستییە لەمەڕ پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزکراوی نێوان خەڵك و ئەو هۆکارانەی کار لە پەیوەندییەکان و دەرەنجامەکانی دەکەن.

لەوەی پێشوودا ئەوەمان بۆ روونده‌بێتەوە کە کۆمەڵناسی شرۆڤەی گەشەکردنی رێکخستنی کۆمەڵایەتی و بنەماکانی کۆمەڵایەتی و رەفتاری کۆمەڵەکان دەکات نەك رەفتاری تاکەکان لە کۆمەڵە و کۆمەڵگەکاندا، چوونکە شرۆڤەکردنی رەفتاری تاك لە کۆمەڵەکاندا ئیشی دەروونناسییە. هەروەها شرۆڤەی رەفتاری کۆمەڵەکان دەکات نەك رەفتاری تاکەکان لە کۆمەڵە و کۆمەڵگەدا هەروەك چۆن دەروونناسیی کۆمەڵایەتی ئەنجامی دەدات. دەتوانین باس لە گرنگترین ئەو بوارانە بکەین کە کۆمەڵناسیی دەیخاتە بەر شرۆڤەکردنی خۆیەوە:

– شرۆڤەکردنی بیردۆزەکان و رێگەکانی لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگەکان و یاساکانی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی کۆمەڵگەکان کە ئەمەیش کۆمەڵناسیی گشتی شرۆڤەی دەکات.

– شرۆڤەکردنی دابەشبوونی دانیشتووان و گردبوونەوەکانیان لە شار و لادێیەکاندا (زانستی مرۆفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی شرۆڤەی دەکات).

– شرۆڤەکردنی دیاردەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی وەك ئاین و ئاکار و ئابووری کە (زانستی فیسیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی) شرۆڤەی دەکات.

– شرۆڤەکردنی گرفتەکانی کۆمەڵایەتی و خراپ رێکخستنی کۆمەڵایەتی و گەڕاندنەوەی کۆمەڵگە کە (زانستی پاثولوجیا) شرۆڤەی دەکات.

□ زانستی ئەنترۆپۆلۆژیا **Antropology** مرۆڤناسی.

ئەو زانستەیە کە شرۆڤەی رەگەزە زیندوو و رۆشنبیرییەکانی مرۆڤ دەکات.

ئەم زانستە گرنگی بە شرۆڤەکردنی رۆشنبیریی مرۆیی دەدات بە چەمکە فراوان و چەشنە جۆراوجۆرەکانی ئەم رۆشنبیرییە لە ژینگە مرۆییە جۆراوجۆرەکان لە رابردوو و ئێستە و ئایندەدا.

ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی شرۆڤەی چوار جۆر بزاڤی مرۆیی دەکات:

١- لایەنەکانی ئەو بزاڤەی کە پێداویستییە زیندووە دەروونییەکانی وەك برسیەتی‌و سێکسی مرۆڤ دەستەبەر دەکات.

٢- لایەنەکانی ئەو بزاڤانەی دەبنە هۆی رێکخستنی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵەکان وەك دابونەریتەکان.

٣- لایەنەکانی ئەو بزاڤ و ئاراستانەی کە بەرەو بوونی هێزی بان سروشتیی دەچن وەك ئاین و ئەفسوون.

٤- لایەنەکانی ئەو بزاڤەی کە پەیوەندییان بە گوزارشتکردنە لە جوانییەکان(چالاکیی ستاتیکی وەك هونەر و مۆزیك و شیعر).

پەیوەندییەکانی نێوان زانستەکان و کۆمەڵناسی و زانستی ئەنترۆپۆلۆژیا و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکی زۆر پتەو و توندوتۆڵە، چوونکە کۆمەڵناسی و زانستی ئەنترۆپۆلۆژیا تایبەتن بە شارەزایی و رەفتاری بەکۆمەڵ، هەروەها دەروونناسیی کۆمەڵایەتی تایبەتە بە شرۆڤەکردنی شارەزایی و ئەزموون و رەفتارەکانی تاك لەمیانی کارلێککردن لەگەڵ ژینگەی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، چوونکە لە چوارچێوە کۆمەڵایەتیەکەدا شرۆڤەی تاك دەکات.

### ٤- دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و زانستەکانی ئابووری:

لە بوارەکانی پەیوەندییە مرۆییەکانی نێو پیشەسازی و بازرگانی و پەروەردە و فێرکردندا سوود لە شرۆڤەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی وەردەگیرێت، چوونکە بەرهەمی کۆمەڵەکان جێگەی گرنگیپێدانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتییە لەمیانی:

– تێگەیشتن لە پەیوەندییە دەروونیی کۆمەڵایەتییەکان.

– شرۆڤەکردنی گرنگیی پەیوەندییە مرۆییەکان لە کار لەنێو کرێکاران خۆیان و هەروەها کرێکاران و سەرپەرشتیارانیان.

### ٥- دەروونناسیی گشتیی:

دەروونناسیی گشتی شرۆڤەی تاك دەكات بەبێ ئەوەی گرنگیی بە ژینگەی كۆمەڵایەتی و گشت ئەو لادانانە بدات كەوا بەهۆی كاریگەرییەكانی كۆمەڵایەتییەوە دروست دەبن و وەك شتێكی گۆڕاو یان هۆكاری كاریگەری گۆڕاو لێكدەدرێنەوە كە دەبێ جێگیر بكرێن بۆئەوەی یاساكانی رەفتار بدۆزرێنەوە.

ئامانجی دەروونناسیی گشتی دۆزینەوەی ئەو رەفتارانەیە كە بەهۆی جیاوازیی گەشەكردن و شیاندنی كۆمەڵایەتییەوە كاریگەر نابێت، وەك: یاساكانی پاڵنەرایەتی و درككاری و فێربوون و یادگە و بیركردنەوە، بەڵكو بەشێوەیەكی داماڵراو لە تاك دەنواڕدرێ. بەڵام دەروونناسیی كۆمەڵایەتی شرۆڤەی رەفتارەكانی تاك دەكات لەهەمبەر ورووژێنەرەكانی كۆمەڵایەتی، هەروەها لە هەڵوێستەكانی كۆمەڵایەتیدا شرۆڤەی رەفتاری مرۆڤ دەكات.

٦- دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و زانستەکانی مرۆیی:

دەروونناسیی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکی پتەوی بە زانستی گەلان (ئەنترۆپۆلۆژیا)وە هەیە و دەچێتە نێو زانستی سیاسی و وابەستەیی لەگەڵ فەلسەفەشدا هەیە، چوونکە پسپۆڕانی ئەم زانستانە گرنگیی بە دەرەنجامی کۆتایی کارلێکی کۆمەڵایەتی و گشتاندنە تایبەتەکانی هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتی دەدەن بەبێ رەچاوکردنی رەفتارە تاکیەکانی تاکەکان. پسپۆڕی دەروونناسیی کۆمەڵایەتیش گرنگیدانی خۆی لەسەر بنەمایەکانی رەفتاری مرۆییدا چڕ دەکاتەوە.

# دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەنێوان دەروونناسی و کۆمەڵناسیدا

دەروونناسیی گشتی شرۆڤەکردنی زانستیی ژیانی ئەقڵییە بە گشت لایەن و روخسارەکانییەوە. دەروونناسیی شرۆڤەی کردە ئەقڵییەکانی وەك درککاری و تاسینەوە و فێربوون دەکات. زانایانی نوێی دەروونناسیی گرنگییەکی زۆر تایبەت بە شرۆڤەکردنی هەستوسۆز و پاڵنەر و هاندەرەکان و ئەو رۆڵە دەدەن کە لە دیاریکردنی چەشنەکانی کەسێتیدا دەیگێڕن. دەروونناسیی رەگی قووڵی لەنێو زانستی زیندەوەرناسی و ئەرکی ئەندامەکان هەیە و تا ئێستەیش ئەم پەیوەندییە پتەوەی پاراستووە. تێبینیی کراوە کە لایەنێکی گەورەی لێکۆڵینەوەکانی زانایانی دەروونناس کە باس لە درککردنی بیناییانە و گوێبیستیانە دەکەن بۆ رەفتاری کۆمەڵایەتی گرنگییەکی گەورەیان نییە، بەڵام پەیوەندییەکی روون لەنێو ئەو لێکۆڵینەوانەدا هەیە کە تایبەتن بە سۆز و پاڵنەرەکان و هتد، هەروەها ئەوانەیش کە تایبەتن بە بەشداریکردنی تاك لە پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و زۆربەی جاریش شرۆڤەکارانی درککاری و فێربوون و کردەکانی ئەقڵی هەوڵ دەدەن بە سیستەمەکانی ئەرکەکانی دەروونی بگەن، مەبەستمان ئەو سیستمانەیە کە جیاوازیی نێوان تاکەکان و تەنانەت یەك جۆریش تێدەپەڕێنێ. بەڵام ئەوانەی شرۆڤەی سۆز و رەفتاری نەریتی دەکەن زۆربەی جار گرنگی بە تاك و مۆرکە جیاکەرەوەکەی کەسێتییەکەی دەدەن، ئەمەیش بەشێوەیەکی تایبەت بەسەر کەسانی بواری دەروونناسیی ئەکلینیکیدا پیادە دەبێت.

چەمکی(کەسێتی) لەلای ئەو زانا دەروونیانەی کە گرنگیی بە لایەنە سایکۆلۆژییەکان دەدەن چەمکێکی تەوەریانەیە هێندە گرنگیی بە لایەنەکانی فسیۆلۆژی نادەن. چەمکی(کەسێتی) لەلای زانای دەروونی هاوتای چەمکی

(کۆمەڵگە)و (ڕەوتی کۆمەڵایەتی) زانای کۆمەڵناسە، کەواتە دەروونناسی هەوڵ دەدات بەبێ زیاد و کەم و لەمیانی ئەرکی ئەندامەکانی جەستە و مێشك و ئۆرگانی دەروونی و ئەزموونە بێهاوتاکانی تاکەوە لێکدانەوە بۆ ڕەفتار بکات، بەڵام کۆمەلناسیی بەپێچەوانەوە لەمیانی ئەو ڕەفتارەی لە کۆمەڵگەدا دەردەکەوێت و لەمیانی هەندێ هۆکاری وەك ژمارەی دانیشتووان و ڕۆشنبیری و ڕێکخستن و هتد لێکدانەوە بۆ ڕەفتارەکان دەکات.

ئەگەر لە زانستی کۆمەڵناسیی بنوارین دەبینین کە بەڕاستی هەندێ پرس و بابەت هەن هیچ شتێك بەقەد سیستەمەکانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و هتد دەستیان تیایدا نییە و ڕۆڵ ناگێڕن، دەتوانین بەکورتی بڵێین کە سێ بابەتی سەرەکیی هەیە کەوا کۆمەڵناسی دەیانگرێتەخۆ، ئەوانیش: کۆمەڵگەکان، سیستەمەکانی کۆمەڵایەتی، پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتین.

بیرۆکەکەیش ئەوەیە کە بابەتی کۆمەڵناسی ئەو پەیوەندییانەن کە ڕەگەزەکانی کۆمەڵگە بە قبوڵکردن و پێشوازییەکی گەرمەوە بەیەکەوە گرێ دەدات، هەرچەندە هەندێ کەس پێیانوایە کە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی وەك خانەوادە و دامەزراوەکانی ئاینی و فێرگە و پارتی سیاسی لەخودی خۆیاندا چەند پرسێکن کە لەسەر کۆمەڵناسیی پێویستە لەسەر بنەمای ئەوەدا بیانگرێتەخۆ کە کۆمەڵگە بەڕاستی یەکەیەك لە شیکردنەوەی زانستیانەی مێژوو و ئەنترۆپۆلۆژیا پێکدەهێنی، بەڵام ئەم ڕەوت و ئاراستە هاوچەرخە مەیلی بەلای شرۆڤەکردنی تایبەتمەندییە گشتییەکانی سیستەمەکانی کۆمەڵایەتیدا دەچێت.

هەندەی نەماوە کۆمەڵناسی و دەروونناسیی لە خاڵێکی دیاریکراودا بەیەك بگەن کە خۆی لەخۆیدا باسگەیەکی تایبەتمەند پێکدەهێنێت ئەویش دەروونناسیی کۆمەڵایەتییە. لەڕووی بۆچوونێکی تەواو سایکۆلۆژیانەشدا دەبینین کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی گرنگیی بە تاوتوێکردنی ئەو هۆکارانە دەدات کە لەمیانیانەوە کەسێتی(یان رەفتار) ملکەچی تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تاك و دۆخە کۆمەڵایەتییەکەی دەکات. دەتوانین بە لێکۆڵینەوەکانی (سلۆمۆن ا ش) بەڵگەی درککاریی بهێنینەوە. ناوبراو ئەوەی روونکردووەتەوە کە کردەی سایکۆلۆژی (درککاری) بە هەڵوێستی کۆمەڵایەتییەوە کاریگەر دەبێت، ئەمەیش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی شڵەژانێکی دیاریکراو لە تاکدا.

بەڵام لە روانگەی سۆسیۆلۆژییەوە دەبینین کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی گشت لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە کردەکانی کۆمەڵایەتی دەگرێتەخۆ و هەوڵدەدات ئەوە روونبکاتەوە کە چۆن تایبەتمەندییەکانی سایکۆلۆژیی هەر تاکێك یان ئامادەییە کەسییەکانی چەند تاکێکی دیاریکراو و رەفتارکردن بەشێوەیەکی دیاریکراو لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا کاریگەریی لەسەر مرۆکی کردەکانی کۆمەڵایەتی دەکات.

کەواتە، دەروونناسیی کۆمەڵایەتی شرۆڤەی ئەوە دەکات کە چۆن مرۆڤ بیردەکاتەوە و هەڵدەچێت و لە هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتیدا رەفتار دەکات. هەروەها شرۆڤەی ئەوەیش دەکات کە چۆن ژینگە و دەورووبەر کار لە هزر و هەستوسۆز و کردارەکانمان دەکات و چۆن درك بە رەفتار و پاڵنەری خەڵکی دەکەین و لێکیدەدەینەوە و چۆن بیروباوەڕ و خولیاکانمان هەوێن دەبێت و چ شتێك وادەکات کەسانێکمان خۆشبوێت و رقمان لە هەندێ کەسیش بێتەوە؟.

هەروەها دەروونناسیی لە لێکۆڵینەوەکانی خۆی لەهەمبەر ئەم دیاردانەی رەفتاری مرۆییدا پشت بە دوو تێبینیی سەرەکی دەبەستێت ، یەکەم: رەفتار دەرەنجامی کەس و هەڵوێستە، وەك دەزانین رەفتاری کەسەکان لە یەك هەڵوێستی دیاریکراودا دەگۆڕێت، رەفتاری هەر کەسێکیش پێکهاتە و سیفەتە زەقەکانی تایبەت بەکەسەکە پیشان دەدات، هەر ئەمەیش بواری تایبەتی سایکۆلۆژیای کەسێتی و جیاوازییە تاکەکەسییە زەقەکانی تاکەکانە. جگە لەمانەیش هەمان تاك لە هەڵوێستە جۆراوجۆرەکاندا بەشێوەی جیاجیا رەفتار دەکات، چوونکە هەر هەڵوێستێك کۆمەڵێك هەلومەرج و هێز لەخۆ دەگرێت کەوا کاریگەرییان بەسەر رەفتاری تاکەکەوە هەیە، هەر ئەمەیش بواری پسپۆڕیی دەروونناسیی کۆمەڵایەتییە.

بەڵام تێبینیی دووەم ئەوەیە کە ئەگەر تاکەکان وەك شتێکی راستەقینە درکیان بە هەڵوێستەکە کرد، ئەوا دەرەنجامەکانیشی راستەقینە دەبن، بە واتایەکی دیکە: خەڵك کاردانەوە و وەڵامدانەوەیان لە هەمبەر رەگەزە واقیعی و راستەقینەکانی نێو هەڵوێستەکە نابێت، بەڵکو کاردانەوە و وەڵامدانەوەیان بۆ لێکدانەوە خودییە تایبەتەکانی خۆیان دەبێت لەهەمبەر هەڵوێستەکەدا.

ئەمە یەکێکە لەو هۆیانەی کە وادەکات خەڵکان لە هەمبەر یەك هەڵوێستی بابەتیدا رەفتاری جیاواز پیشان بدەن، بۆنموونە: کاتێ کەسێك دەکەوێتە نێو هەڵوێستێکی رووگیرەوە، وەهای لێکدەداتەوە کە خەڵکانی دیکە داویان بۆ داناوەتەوە، بۆیە بەشێوەیەك کاردانەوەی دەبێت زۆر جیاوازە لەو کەسەی کە کەوتنە نێو هەڵوێستە رووگیرەکە دەخاتە پاڵ کەموکورتی و بێدەسەڵاتیی خۆیەوە. لەبەرئەوە، دەروونناسیی کۆمەڵایەتی گرنگیی بە کردەکانی کۆمەڵایەتی و لێکدانەوەیان دەدات، واتا گرنگی بەشێوازەکانی مامەڵەکردن دەدات لەگەڵ زانیارییەکان، هەروەها گرنگیی بەو شێوازانەی لایەنگری دەدات کە لە نێو ئەم شێوازانەدا هەن.

- ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی.
- رێبازی ئەزموونی.
- رێبازی وەسفی.
- رێبازی مێژوویی.
- ئەزموونگەریی مەیدانی.
- رێگەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان.
- هۆکارەکانی لایەنگری (تحیز) لە لێکۆڵینەوەکانی پەروەردەیی.
- ئەو بیردۆزانەی دەروونناسیی کە رەفتاری کۆمەڵایەتی لێکدەدەنەوە.
  - ★ بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی.
  - ★ بیردۆزی رەفتاری.
  - ★ بیردۆزی بوار.
  - ★ سۆسیۆمەتری
  - ★ تمپلی کۆمەڵایەتی
  - ★ سایکۆلۆژیای گەلان و مۆرکی نەتەوەیی.
  - ★ سایکۆلۆژیای جەماوەر.
  - ★ بیردۆزی رەمەکەکان.
  - ★ بیردۆزی کرچفێڵد.
  - ★ بیردۆزەکانی دانەپاڵ (دانەپاڵ)

# ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی

ئامانجی سەرەکیی زانست پێشکەشکردنی لێکدانەوەی راستگۆیانەی دیاردەکانی سروشتییە، ئەم لێکدانەوەیەش بە بیردۆز ناودێرکراوە، ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەی زانستیش: لێکدانەوە و پێشبینیکردن و کۆنترۆڵە.

## لێکدانەوە (التفسیر)

دەبێ لێکۆڵینەوەی زانستی لە وەسفی دیاردەکەوە بەرەو لێکدانەوەی بچێت، دوای ئاشنابوون و زانینی هۆیە شیمانەییەکانی دیاردەکەیش توێژەر گشتاندنێك دادەرێژێت کە ئەگەری وەدیهاتنی هەبێت، واتا بتواندرێ وەدیبهێندرێت. چوونکە توێژەر تەنها بەوە ناوەستێ بزانێ دیاردەکە چییە، بەڵکو لەهەمان کاتیشدا دەیەوێ بزانێت چۆن ئەم دیاردەیە بەم شێوەیە روویداوە.

## پێشبینیکردن:

توێژەر بۆ لێکدانەوەی دیاردەکە تەنها بە دارشتنی چەند گشتاندنێك دەست هەڵناگرێت، بەڵکو لەهەمان کاتیشدا دەیەوێت بزانێت پێشبینیی ئەو رێگەیەش بکات کە گشتاندنەکە لە ئایندەدا لەسەری دەروات و کاری پێدەکات، زانیارییە باو و زانراوەکان و گشتاندنە بەجێیەکانیش وەردەگرێت و بەشێوەیەك دادیدەرێژێت کە دەتوانێت پێشبینیی رووداوێکی ئایندەیی یان دیاردەیەك بکات کە تا کاتی ئێستەیش تێبینیی نەکراوە.

## بەرزەفتکردن (الضبط)

واتا بەرزەفتکردن و دەسەڵات پەیداکردن بەسەر هەندێك لەو هۆکارە بنەڕەتیانەی کە دەبنە هۆی پەیدابوونی دیاردەکە.

# ڕێباز و بەرنامەی ئەزموونی

لێکۆڵینەوەی ئەزموونی بۆ تاقیکردنەوەی پەیوەندیی هۆیەکە بە دەرەنجامی نێوان دوو گۆڕاو یان پتر ئەنجام دەدرێت، فاکتەری هۆیەکیش بە گۆڕاوی سەربەخۆ ناودەبرێت و لێکەوتەکانیشی بە دەرەنجام ناودەبرێت، ئەم کاریگەری و شوێنەوارەیش بە گۆڕاوی پاشکۆ ناودەبرێت.

لێکۆڵەری ئەزموونیی کۆنترۆڵی گۆڕاوە سەربەخۆیەکە دەکات بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لەسەر کاریگەرییەکەی بکات لەسەر پاشکۆیەکەدا. بنەمای لێکۆڵینەوەی ئەزموونیش کۆنترۆڵکردنی گۆڕاوە سەربەخۆیەکەیە، بۆ نموونە: کاریگەریی بەکارهێنانی ژمێرە (حاسبە)ی ئەلیکترۆنی لە خوێندنی بیرکاریدا.

ڕێبازی ئەزموونگەری لە دەروونناسیدا بە وردترین ڕێبازەکانی لێکۆڵینەوە دادەندرێت و باشترین ڕێبازی لێکۆڵینەوەیە، ئەویش لەبەر ئەم دوو هۆیەی خوارەوە:

* لە بابەتیبوون زۆر نزیکە و خودی نییە.

* لێکۆڵەر دەتوانێت کۆنترۆڵی ئەو هۆکارە جۆراوجۆرانە بکات کە کاریگەریی لەسەر ئەو دیاردە ڕەفتارییە دەکەن کەوا لێکۆڵەر مەبەستیەتی لێی بکۆڵێتەوە و بەئارەزووی خۆی دەتوانێت گۆڕانکارییان تیادا بکات و ئەوانەیش جێگیر بکات کە کردەی لێکۆڵینەوەکەی ئاسان دەکەن.

لێکۆڵینەوە بەپێی ئەم ڕێبازە بەم قۆناغەبەندیە بەڕێوە دەڕوات: (دیاردە– گرفت– ئامانج– شیمانەکان– تاقیکردنەوە– ڕاستییەکان– یاساکان– بیردۆز).

لێکۆڵینەوەکە سەبارەت بە دیاردەیەکی دەروونی کۆمەڵایەتی دەبێت و دواتریش زەرورەتی دیاریکردنی گرفتەکە دێت، پاشان دەرخستنی ئامانجی لێکۆڵینەوە دێت و

دواتریش ئەو قۆناغە دێت کە رێنوێنی توێژەر دەکات بۆئەوەی بگاتە دۆزینەوەی راستییەکانی زانستی.

شیمانەیش بریتییە لە لێکدانەوەی کاتییانەی دیاردەکە و خەملاندنی زیرەکانە و پێشبینیکردنی کاتی. دوای ئەمەیش ئەو تاقیکردنەوەیە دێت کە لێکۆڵەر ئەنجامی دەدات. لێرەدا لەسەری پێویستە گرنگیی بە هەڵبژاردنی تاقیکردنەوە و پێوەرە باوەرپێکراوە جێگیرە بابەتییەکان بدات، هەروەها پێویستە گرنگی بە پێوەرەکانی ئاراستەکان و تاقیکردنەوە باوەکانی زیرەکیی وەك بینیە و ووکسلر و گۆدانف و چەندانی دیکە بدات، هەروەها دەبێ گرنگی بە تاقیکردنەوەکانی هەڵسەنگاندنی پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و تاقیکردنەوەکانی لکاندنی وەك تێگەیشتن لە بابەت و لەکەکانی مەرەکەب بدات. کۆی ئەم شتانەیش ئامرازی بەردەستی توێژەرن بۆ هەڵبژاردنی نموونە (عینە)ی توێژینەوەکە بە رێگەی زانستی. هەروەها کاتێ هەر گۆڕاوێك بەجیا شرۆڤە دەکات دەبێ گرنگیی بە بەرزەفتکردنی گۆڕاوەکانی دیکەیش بدات و جێگیریان و گۆڕاوە سەربەخۆ و پاشکۆ و دەستوەردەرەکانیش بدات. لە شیکردنەوەی داتەکاندا ورد بێت و سوور بێت لەسەر لێکدانەوەی ئەو دەرەنجامانەی کە وەدەستینادەهێنێت بۆئەوەی بگاتە ئەو راستییە زانستیانەی کە پەیوەندییان بە دیاردەکەوە هەیە، دەبێ چەند یاسایەك دابڕێژێت و بیردۆزێکی زانستی دابنێت. یەکێك لەو مەرجانەی کە دەبێ لە بیردۆزی زانستیدا هەبن کورتی (ایجاز) و سەرتاپاگیری و تاکایەتی و لێکدانەوە و پێشبینیکردن بن.

## - ڕێبازی وەسفی (نا ئەزموونی)

ئامانجی ڕێبازی وەسفی کۆکردنەوەی وەسفە وردە زانستییەکانی دیاردەکانی کۆمەڵایەتییە لە دۆخەکانی ئێستەییان و شرۆڤەکردنی ئەو پەیوەندییانەیە کە لەنێوان دیاردەکانی کۆمەڵایەتیدا هەن. گرنگترین ڕێگەکانی ڕێبازی وەسفی تێبینیی زانستییە. لەم ڕێبازەدا توێژەر گرنگیی بە شرۆڤەکردنی دۆخی ئێستەی دیاردەکە و وەسفکردنی وردی دەدات و ئامانجیشی دیاریکردنی سروشتی هەلومەرج و کارکردەکان و ئارستە باوەکانە، بەواتایەکی دیکە گەڕان و پشکنینە بەدوای چەند وەسفێکی وردی چالاکی و شت و کردەکان و کەسەکان. هەروەها لێکۆڵەر گرنگیی بە گشت جۆرەکانی تێبینیی دەدات. بەرجەستەترین نموونەی لێکۆڵینەوە وەسفییەکانیش لێکۆڵینەوەکانی ڕۆپێوی‌و پیشکەوتنی (درێژی و پانی) و لێکۆڵینەوەکانی شیکردنەوەیی (شیکردنەوەی کار، شیکردنەوەی ناوەڕۆک و ناواخن).

# ڕێبازی مێژوویی

ئەو ڕێبازەیە کە توێژەران بۆ زانینی ڕووداوەکانی ڕابردوو دەیگرنەبەر. توێژەران هەوڵ دەدەن ئەزموون و شارەزاییەکانی ڕابردووی کۆمەڵگەی مرۆیی زیندوو بکەنەوە، لەبەرئەوە ڕاستییەکان کۆدەکەنەوە و دەیپشکنن و بژاری دەکەن و بەپێی چەند بنەمایەکی دیاریکراو ڕێکیدەخەن. هەروەها ڕێبازی زانستی لە توێژینەوەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەیەك بەکاردەهێنن. توێژینەوە لەم بوارەدا ئامانجی دڵنیابوونە لە مانا و ڕاستگۆیی ڕاستییەکانی دێرین.

کاتێ توێژەرێکی بواری دەروونناسیی کۆمەڵایەتی شرۆڤەی مێژوو دەکات، هەندێ چالاکیی ئەنجام دەدات کە توێژەرەکانی دیکەش تیایدا بەشدارن، بەڵام سروشتی مادەکەی ڕووبەڕووی هەندێ گرفتی تایبەت دەبێتەوە و ئەوەی بەسەردا دەسەپێنێت کە چەند بنەما و شێوازێکی تایبەت پیادە بکات، بەتایبەت لەکاتی هەڵبژاردنی گرفتێكو کۆکردنەوەی مادەکانی و دارشتنی شیمانەکان و لێکدانەوەی ئەو دەرەنجامانەی کە پێیاندەگات.

### لە کۆکردنەوەی مادەی زانستیشدا توێژەر پەنا دەباتە بەر:

سەرچاوە سەرەتاییەکانی وەك وتەکان و ڕاپۆرتە بەرچاوە باوەڕپێکراوەکان و بەڵگەنامە و دۆسیە فەرمی و کەسییەکان و شوێنەوارە مادییەکان و چاپکراو و دەستنووسەکان.

# ئەزموونگەریی مەیدانی.

ئـەم جـۆرە لێکۆڵینەوەیـە پـتر لـە واقیعـی زانـستی نزیکـە کـە تیایـدا گۆڕاوەکـان بـەرزەفت دەکـرێن و زۆر لـە پـەروەردە و زانـستەکانی مرۆییـدا بـەکاردێت و گـۆڕاوە سـەربەخۆیەکان دەکەونـە ژێـر کـۆنترۆڵی توێـژەرەوە، بـەڵام بەشـێوەیەکی کـەمتر لـە لێکۆڵینـەوەکانی ئـەزموونیی تاقیگـەیی. توێـژەر دەتوانێـت تیایـدا تاقیکردنـەوەکانی پێشوویی و تاقیکردنـەوەکانی دواتـر بـەکاربهێنێت. دوای هەڵبـژاردنی ئـەو نموونەیـەی توێژینەوەی لەسەر دەکرێت، دابەشیان دەکاتە سەر دوو کۆمەڵە: کۆمەڵەی تاقیکراوەو کۆمەڵەی تاقینەکراوە و گۆڕاوە سەربەخۆیەکە دەچێتە نێو کۆمەڵە تاقیکراوەکەوە.

# ڕێگەکانی کۆکردنەوەی زانیاری

## تێبینیکردن:

جۆرەکانی بریتین لە ڕاستەوخۆ و نا ڕاستەوخۆ. هەروەها تێبینیکاریش بەشداربووو نابەشداربووە، هەروەها تێبینیی بەمەبەستی (زانستی) و تێبینیی بێمەبەست (کتوپڕ) هەیە کە تایبەتمەندییەکانی ئەوەیە زانیاریی بەرچاو و دیار لە هەڵوێستەکانی ژیان دەردەخسێنێ، بەڵام مرۆڤێکی خودیانە بەسەریدا زاڵە. تێبینیش بریتییە لەو شتانەی کە دەیانبینێت و گوێبیستیان دەبێت ئەمەیش بەهۆی بزاڤێکەوە دەبێت کە لێکۆڵەرەوە لەمیانی قۆناغێکدا ئەنجامی دەدات کە لێکۆڵینەوەکە پیایدا تێپەڕ دەبێت، نموونەی تێبینییەکانیش : کوڕاسەی تێبینیکردنە بۆ خەملاندن و هەڵسەنگاندنی تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی کەسێتی و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی، کوڕاسەکەش لە شەش بەش پێکدێت: داتا و زانیاریی گشتی و داتا و زانیاریی تایبەت بە خانەوادە و زانیاریی تایبەت بە دۆخی جەستەیی و توانای ئەقڵی و پلەی خوێندن و تایبەتمەندی و خەسلەتەکانی ڕەفتاری کومەڵایەتی و کەسێتی " تێبینیی گشتی لەسەر کەسێتی" و لایەنەکانی لادانی دەروونی.

## چاوپێکەوتن

قسە و باس و گفتوگۆیەکە کە لەنێوان کەسی ئەنجامدەری گفتوگۆیەکە و کەسی پشکێنراوەوە ئەنجام دەدرێت (پەیوەندیی زارەکیی ڕاستەوخۆ لەنێوان دوو کەس یان پتر)، مەبەستیش لێی هەڵبژاردنی تاکەکان و ئاراستەکردنیانە بەرەو کاری گونجاو. کەسی پشکێنەر دەرفەتی ئاشنابوون و ناسینی ئەو لایەنانە دەرەخسێنێ کە زۆربەی

ئامرازەکانی ڕۆپێوکردن و پشکنین ناتوانن ڕوپێوی بکەن و بیپشکنن، وەك: چۆنیەتیی قسەکردنی کەسەکە و دیمەنی دەرەوە و کەموکورتییەکانی جەستەیی و خێرایی و کەموکورتییەکانی قسەکردن و هتد.

جۆرەکانیشی بریتین لە تاکەکەسی و بەکۆمەڵ و کۆتوبەندکراو و سەربەستانە. گرنگترین تایبەتمەندییەکانیشی بەکارهێنانیەتی لەو بابەت و هەلومەرجانەی کە زەحمەتە بنووسرێنەوە و بخوێندرێنەوە، بەشێوەیەکی قووڵیش دەچێتە نێو بنجوبنەوانی بابەتەکان. بەڵام یەکێك لە کەموکورتییەکانی ئەوەیە کە پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە و لایەنی خودی بەسەریدا زاڵە.

### ڕێگەی شرۆڤەکردنی مێژووی دۆخەکە:

زانیاریی تەواو لەهەمبەر ژیاننامەی رابردووی تاکە، ئەم زانیاریانەش تایبەتن بە خانەوادە و پێگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فێرکردن و ئاین و دۆخی جەستەیی و مگێزی. مادەی شرۆڤەکردنی مێژووی دۆخە لەچەندان سەرچاوەی وەك: نووسینی ژیاننامە و یادگارییەکانی ڕۆژانە و چاوپێکەوتنەکان و دۆسیەی دەستگە کۆمەڵایەتییەکان و هتد وەردەگیرێت.

### ڕێگەکانی ئاماری

چارەسەرکردنی ئامارییانەی داتا و زانیارییەکانی لێکۆڵینەوەکە بریتییە لە گوزارشت لێکردنیان بەشێوەی چەندایەتی و ژمارەیی کە لێکۆڵەر لەمیانیەوە هەوڵ دەدات بگاتە چۆنیەتیی ڕوودانی دیاردەیەکی دیاریکراو بەشێوەی دووبارە بووەوە، هەروەها ئامرازە تایبەتەکانی پێوانی وەك ڕێژەکانی مامناوەندی و ڕێژەی سەدی و پەیوەندییەکان و پێوەرەکانی جیاوازیی نێوان کۆمەڵەکان.

## ڕێگەکانی ئەزموونی

هەر ئەو باسەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا سەبارەت بە ڕێبازی ئەزموونی باسکراوە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە بەسە.

### شێوازی هەواڵنێران:

پسپۆڕی کۆمەڵایەتی لەکاتی شرۆڤەکردنی کۆمەڵگە بچووکەکانی وەك گوند و تیرەو هۆزەکانی بیاباننشیندا شێوازی کارکردنی هەواڵنێران بەکاردەهێنێت، ئەمەیش بۆ زانین و ئاشنابوونە بە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیان. لەبەرئەوە پەیوەندیی بەو تاکەکەسانە دەکات کە گشت شتێك سەبارەت بە بارودۆخی کۆمەڵەکان دەزانن بۆئەوەی هەواڵ و زانیاری پێشکەش بکەن. ئەم زانیاری و هەواڵانەیش بۆ شرۆڤەکردنی ئەو دیاردەیەی کە هەوڵی پەردە لەسەر لادانی دەدات، یارمەتیدەری دەبن وەك: ئاستی بژێویی گوند و ڕادەی نزیکایەتی و پەند و قسە نەستەقە باوەکان و دابونەریتەکانیان و هتد.

### شێوازی دەستنیشانکردن:

شێوازی دەستنیشانکردن لە شرۆڤەکردنی کەسێتی و ڕەهەندەکانی ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا بە کاریگەرترین ڕێگەی ئەم لایەنانە دادەنرێت، گشتاندنە زۆر پیادەکراوەکانیش دەبنە هۆی بەکارهێنانی ژمارەیەکی زۆری تاکەکان و چەند تایبەتمەندییەکی بێهاوتاشی تیادایە کە لەهیچ ڕێگە و شێوازێکی دیکەدا نییە، چوونکە جگە لەوەی ئامانجی لە هەڵوێستی چارەسەریدا سوودگەیاندنە بەتاك، لەهەمان کاتیشدا ئاراستە و خولیا و بیروبۆچوون و ئەو دیاریکراوە نەستیانەی تاکیشمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە لەپشتیانەوە دەوەستن، یەکێك لەم ڕێگە و شێوازانە، شێواز و

ڕێبازی شیکردنەوەی دەروونییە کە لەلایەن (فرۆید)ەوە داهێنراوە، هەروەها ئەو شێوازەی دەستنیشانکردنەیشە کە کارل رۆجر بەکاریهێناوە.

## دۆخی ئابووریی کۆمەڵایەتی:

توێژەر لەکاتی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیی ئاستی ئابووری وکۆمەڵایەتی بە لایەنەکانی رەفتاری تاکەوە پێویستی بە ئاشنابوون و زانینی زۆرێك لە دۆخەکانی وەك: ئاستی زیرەکی و ئاستی خوێندنی تاك هەیە. فۆرمی کۆکردنەوەی زانیارییەکانی سەرەتایی و داتاکانی کۆمەڵایەتی خانەوادەیی لەبارەی خانوو و موڵکومالّ و دەرامەتی خانەوادە و بەسەربردنی کاتەکانی دەستبەتاڵی و هتد ڕۆڵێکی مەزن لەمەدا دەبینن.

## تاقیکردنەوەکان

بەڕێوەبردن و ئەنجامدانی سیستماتیکە بۆ هەڵسەنگاندن و پێوانی چەند نموونەیەکی رەفتاری" ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری" کە گرنگترینیان تاقیکردنەوەکانی زیرەکی و لکاندنی و پێوەرەکانی خولیا و ئاراستە و بەها و رای گشتی و تاقیکردنەوەکانی تواناکانن.

# هۆکارەکانی لایەنگری (تحیز) لە لێکۆڵینەوەکانی دەروونیدا

١- قورسیی بەرزەفتکردنی گۆڕاوەکان: ڕەفتاری تاك لە بواری کۆمەڵایەتیدا لە کاتی شرۆڤەکردنیدا بەهۆی چەندان هۆکاری دیکەوە کاریگەر دەبێت، هەردەبێ ئەمەیش بەرزەفت بکرێت و جیابکرێتەوە بۆئەوەی شرۆڤەی پەیوەندییەکانی نێوان گۆڕاوەکان بکرێت.

٢- کاریگەریی دۆخی ئەزموونی قەڵپ (ساختە) بەتایبەت ئەگەر کەسەکە زانی کەوتووەتە بەر تاقیکردنەوە و تێبینیکردنەوە.

٣- نەبوونی کاردانەوە و هاوکاریی پێویستی کەسەکە بەهۆی ترسان لەوەی نەوەك وەڵامە تۆمارکراوەکانی ببنە هەڕەشە بەسەریەوە و بەهۆیەوە سزا بدرێت، وەك (دۆخی ترسان لە دەسەڵات).

٤- ڕەفتاری تاك لەبواری کۆمەڵایەتیدا بەپێی ئەو هەڵوێستانە دەگۆڕێت کەوا ڕووبەڕووی دەبنەوە. جگە لەچەند هۆکارێکی دیکەی وەك:

* نەبوونی پێوەرایەتی زاراوەکان و نەبوونی پێناسەی پەسند بۆیان.

* کاریگەری ئەنجامدان و بەڕێوەچوونی نا تۆکمە و پێڕەو نەکردنی هەنگاوەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی بەشێوەیەکی دروست لەلایەن توێژەرەوە.

* کاریگەریی شیکردنەوەی زانیارییەکان و شینەکردنەوەی بەشێوەیەکی ورد.

* لایەنگری لە تاقیکردنەوەکان لەهەمبەر کۆمەڵە تاقیکراوەکە و تاقینەکراوەکەوە (الضابطة).

# ئەو بیردۆزە دەروونیانەی بەشداری لە لێکدانەوەی رەفتاری کۆمەڵایەتیدا دەکەن.

## یەکەم: بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی/ فرۆید

سیگمۆند فرۆید پێیوابوو کە سایکۆلۆژیای کۆمەڵە پێش سایکۆلۆژیای تاك دەکەوێت، شیمانەی ئەوەیشی کردبوو کە حەشامەتی یەکەم primal Horde یان کۆمەڵەی یەکەم یەکەمین یەکەی کۆمەڵایەتی- سیاسی بووە، دۆخی پێش ئەمەیش، یان ئەوەی بە دۆخی سروشتیی مرۆڤ دادەندرێت، دۆخی ناسەقامگیری و نەبوونی دەسەڵات و سەرکردایەتی بووە.

بەتواناترین کەسێك دوای فرۆید کە درکی بەم مەسەلەیە کردبێ ویلفریدبیونی شیکەرەوەی دەروونی بووە، ناوبراو دەڵێ: تاك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و لە جەنگێکی بەردەوامدایە ئەویش نەك لەگەڵ کۆمەڵە بەڵکو لەگەڵ خۆیدا، ئەمەیش لەبەرئەوەیە کە ئەندامێکی کۆمەڵەکەیە، هەروەها جەنگ بەدژی ئەو لایەنانەی کەسێتییەکەی دەکات کە مەیلی کۆمەڵیانەی بەسەردا دەسەپێنن.

ئەم بیرۆکەیە بناغەی ئەو بەشدارییەیە کە بەشداریکردنی شیکردنەوەی دەروونی لە درککردنی کاریگەربوونی تاك بە کۆمەڵە لەسەری بونیادنراوە، ماناکەیشی ئەوە نییە کە کۆمەڵە زادە و هەڵقوڵاوی ئەو تاکانە بێت کەوا پێکی دەهێنن، بەڵکو واتاکەی ئەوەیە هەندێ لایەنی رەفتاری تاك هەن کە بەدیارناکەون تەنها لەکاتی بوون و ئامادەیی تاك نەبێت لەنێو کۆمەڵەدا.

## چ شتێك تاکەکان بە کۆمەڵەکانەوە دەبەستێتەوە؟

فرۆید پێیوابووە کە ئەو شتەی تاك بە کۆمەڵەکان دەبەستێتەوە یەکبوون و توانەوەی تاکە لەنێو کۆمەڵەدا و یەکبوون و توانەوەی ئەندامەکانە لەگەڵ سەرکردەدا چوونکە یەکبوون و توانەوە لەنێو سەرکردەدا یەکسانە بە یەکبوون و توانەوە لەگەڵ باوکدا، بە واتایەکی دیکە (سەرکردە- باوك) بەهۆی کارکردن وەك باوك و شوانی کۆمەڵە، کار بۆ کاڵکردنەوەی نیگەرانی و گرژیی نێوان ئەندامەکان دەکەن، لەم چەمکەدا دینامیەتی کۆمەڵە فراوانیی بەخۆیەوە بینیوە و پێیوایە ئەو شتەی لەپایەی یەکەمدا کۆمەڵە یەکدەخات بەشداریکردنیەتی لە یەك میکانیزمی بەرگری دژ بە نیگەرانی و گرژی، چوونکە تاکەکان بەهۆی بەشداریکردن و هاوبەشبوون لەهەمان بەرگرییەکانی دژ بە نیگەرانییەکان یەکدەگرن، نەك بەهۆی بەشداریی ملکەچبوونیان بۆ یەك سەرکردە.

ئەوە روونە کە ئەندامەکان بەپلەی جیاواز بەدەست ئەم نیگەرانیەوە دەناڵێنن، چوونکە پلەی پەیوەندی و وابەستەیی و نیگەرانیی هەر یەکێکیشیان جیاوازە، بەلأم لەهەمبەر هەمان کۆمەڵەدا نیگەرانی باڵ بەسەر هەموویاندا دەکێشێت. لەبەرئەوە بۆ کەمکردنەوەی ئەو نیگەرانییە ئەو میکانیزمانەی بەرگری بەکاردەهێنێت کە کۆمەڵگە پێشکەش و دەستبەری دەکات، واتا بە مۆرکی کۆمەڵەکە رەنگدەکرێت و لەگەڵیدا دەگونجێت. لە راستیدا کۆمەڵە یارمەتیی ئەندامەکانی دەدات کە دژ بە قووڵترین نیگەرانییە کەسییەکانیان خۆیان پڕ چەك بکەن. نیگەرانیش لەپێناو کۆمەڵەدا پوختکردنەوەی گشت جۆرەکانیەتی. جا ئەگەر ئەم نیگەرانییە دووچاری مرۆڤ بوو، ئەوا هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گیانداریکی کۆمەڵخوازە- هەروەك بیۆن

دەڵێت-. ئەم نیگەرانییە دڵتەنگکەرە کرۆکی ترسە لەوەی کۆمەڵە نەتوانێ ئەو بەڵێنانە بباتە سەر کە بەردەوام بە گوێیدا دەچرپێنێ. بۆیە بەپێی پێویست پێناگات و هەژموونێکی وەهای نابێت ڕێگەی بۆ خۆشبکات پارچە پەرشوبڵاوەکانی خۆی کۆبکاتەوە و بەتوندوتۆڵی بمێنێتەوە و بەرەو ئامانجەکانی خۆی هەنگاو هەڵێنێت. ئەم جۆرە نیگەرانیەش پێیدەگوترێت نیگەرانیی دڵتەنگکەر لەبەرئەوەی تاکەکان سەبارەت بە توانای کۆمەڵە بۆ وەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی دووچاری بێهوایی دەبن. زۆربەی جار کۆمەڵە کار بۆ دەستەبەرکردنی دڵارامی و دەربازبوون لەو بێهیواییە دەکات بەوەی کە کەموکورتییەکە بخاتە پاڵ خەڵکانی دیکە و سەرزەنشتیان بکات" ئەگەر کۆمەڵەکەی دیکە و دەڵێت: فڵانە شتی نەکردبایە، دەگەیشتینە خواست و مەبەستەکانمان.

لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە لەگشت کۆمەڵەیەکدا سێ جۆرە میکانیزمی بەرگری هەن، ئەوانیش: جیابوونەوە splitting و یەکبوونی لکاندنی Progective identification و نکۆڵیکردنە Denial.

ئەو وانە و پەندانە چین کە لە پیادەکردنی بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی بۆ سەرهەڵدان و کارایی کۆمەڵەکان دەتوانین سوودیان لێوەربگرین.

١- کاتێ مرۆڤ کۆنترۆڵی چارەنووسی خۆی دەکات، واتا بەشداری لە کردەی دیموکراسیانە دەکات، کارێکی زۆر گرنگ ئەنجام دەدات، چوونکە دەبێتە هۆی کۆنترۆڵکردنی خود و ڕووبەڕووبوونەوەی بەرپرسیاریەتەکان. ئەمەیش قورسترین ئەرکو کارێکە کەوا کۆمەڵەکان ئەنجامی دەدەن، قورسیەکەشی بەپلەیەکی بەرز

دەگەڕێتەوە بۆ بێهوابوون (نیگەرانیی دڵتەنگکەر)، چوونکە ئەندامان لە هەستی دوژمنکارانە و دەمارگیری و زرگنی و هەڵپە و رقی خۆیان دەترسن. رەنگە ئەمەیش ببێتە هۆی تێکچوونی کۆمەڵەکە و ئەوانیش لەوە بێهزترن کە بتوانن لەهەمبەریدا شتێك بکەن، دەرەنجامەکەیشی ئەوە دەبێت کەوا زۆربەی جار کۆمەڵەکان گرنگی بە لادانی بەرپرسیاریەتیی سەرشانیان دەدەن و سەرزەنشت و گوناهەکەیش دەخەنە ئەستۆی دوژمنانی دەرەکیی خۆیان (ئیسرائیل، گروپە ئیسلامییە توندڕەوەکان و هتد). بەردەوامیش بەدوای دروستکردنی قۆچی قوربانی و نکۆڵیکردندا دەگەڕێن. بەڵام بەشداریکردن بەپێچەوانەوە هۆکاری ئافراندنی ئەندام و تاکی کامڵە و هانیان دەدات بەتەواوی سەرقاڵی چالاکییەکانی کۆمەڵە بن، بەمەیش ڕێگەیان لێدەگرێت و زۆر بەقورسی دەتوانن لە بەرپرسیاریەتەکانیان هەڵبێن و لەبەرانبەر هەڵەتنەکەشدا پاداشت وەربگرن.هەندێ دەستکەوتی دەروونی هەن کەوا کاتێ تاك خودی خۆی تاقیدەکاتەوە دێنەکایەوە، بەوەی کە هەست دەکات گشتێکی تەواوە، کەواتە دەستکەوت بەرپرسیاریەتیە. ئەوە روونە کە تەنها بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و راپرسییەکاندا بۆ وەدەستهێنانی ئەو دەستکەوتانە بەس نین، چوونکە زۆربەی دەنگدەران ئەو پاڵێوراوە هەڵدەبژێرن کە یارمەتیی کۆمەڵەکە دەدات بۆئەوەی لە بەرپرسیاریەتی هەڵبێن، نەك هەر ئەمە بەڵکو ئاستێکی هەرەبەرزی بەشداریکردن وەدیهێنەرێکی تەواو نییە.

٢- سەرکردەکان گرنگیی مەزنیان هەیە، لەهەمان کاتیشدا هەرگیز گرنگ نین، هەردوو رستەش راستن. چوونکە سەرکردە (باشەکان) بۆ لەخۆگرتنی نیگەرانیی کۆمەڵە سوودبەخشن، بەمەیش ئەو باوەڕەی لەلا دروستدەکەن کە بۆ رووبەڕووبوونەوەی واقیع توانای پێویستی (نەتەوەیی و سیاسیان)هەیە (واتا ناز بە

جەماوەر نابەخشن و بە درۆ و فریسی کردن هەوڵی وەدەستهێنانی رەزامەندییان نادەن)، چوونکە لەمیانی کاری مکوڕ و دەردەسەری و فێربوون لە شارەزایی و ئەزموون و هەوڵدان و هەڵەکردنەوە کۆمەڵە دەتوانێ گرفتەکانی چارەسەربکات، هەروەها کۆمەڵەکان یارمەتیی سەرکردەکان دەدەن بەڕوونی گوزارشت لە ئەرکەکانی کۆمەڵە بکەن.

٣- بە بۆچوونی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی مێژوو کۆتایی نییە، واتا کۆتاییەك بۆ ئەو ئەرکانە نییە کە کۆمەڵەکان ئەنجامی دەدەن، هەروەها کۆتایش بۆ ئەو هەوڵوکۆششەش نییە کە دەبێ بخرێتە گەڕ بۆئەوەی ئاراستەی خۆی بەرەو وەدیهێنانی ئەرکەکانی بپارێزێت و لێی لانەدات. ئەرکی ئەو دەروونناسییە کۆمەڵایەتیەی گرنگیی بە گونجاندنی حەز و مەیلەکانی تاك و ئەرکەکانی کۆمەڵە دەدات ئەوەیە هاوسەنگییەك لەنێوان واقیع و نێوان بەرگری و نیگەرانیەکان دروستبکات و ئەوەیش بەدیاربخات کە پاراستنی هاوسەنگیی بە ئاراستەی واقیع بۆ کۆمەڵە سوودبەخشترە، لەو رووەی کە باشترین هەلومەرجی رێتێچوو پتر بەرەو گەڕان بەدوای دڵدانەوە و نقوومبوونی نێو خەیاڵی پووچ و دوورکەوتنەوە لە واقیعی دەبات.

ئەو بەشدارییانەی کە شیکردنەوەی دەروونی پێشکەشی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی کردووە، لەم خاڵانەی خوارەوەدا بەدیاردەکەون:

- شیاندنی کۆمەڵایەتیانەی تاك.
- بونیادنان و کارلێکی خانەوادەیی.
- سایکۆلۆژیای کۆمەڵە.

- بنەچە و بناغەی کۆمەڵگە.

- سروشتی شارستانیەتی مرۆیی.

١- **شیاندنی کۆمەڵایەتییانەی تاك:** فرۆید پێیوایە منداڵ لە ساڵەکانی یەکەمی تەمەنیدا ئەو شێوازە کۆمەڵایەتییە دەنوێنێ کە لەنێو کەلتوور و رۆشنبیری نێو ژینگەکەیدا هەیە، ئەمەیش لەمیانی چوونە نێو دەورو چوونە نێو رۆڵی دایباب دێتەکایەوە، ئەم نواندنەیش دواتر لەمیانی کردەی چوونە نێو دەورەوە لە ژیانی منداڵ بەدیاردەکەوێت لەهەمبەر ئەو کەسانەی کە نوێنەرایەتی دایباب دەکەن و لە کۆمەڵگەدا لەپێگەی ئەوانن.

ئەم یەکبوونەش (توحد) کاریگەریی بەسەر گەشەکردنی کەسێتییەکەیدا هەیە و زۆر بە باوکی دەچێت، بەتایبەت هەرکاتێك باوك ئەو ئامانجانەی بەدەستهێنا کە منداڵ بە پەسندیان دەزانێت و خۆشیانی دەوێت. جا ئەگەر دایباب ئامانجەکانی منداڵانیان نەهێنایە کایەوە، ئەوا منداڵانیان روودەکەنە ئاراستەیەکی دیکە بۆئەوەی بەدوای نموونە و سەرمەشقێکی گونجاودا بگەڕێن. کۆمەڵگەیش شێوازی پاداشت و سزا بەکاردەهێنێت بۆئەوەی منداڵ بخاتە بواری قبوڵکردن لەلایەن خەڵکانی دیکەوە و رۆڵی بەرزترین دەسەڵاتی دەرەکی دەگێڕێت بۆ ئەوەی تاك هاوتەریبی کۆمەڵگە بڕوات و لەگەڵیدا بگونجێت.

٢- **بونیادنان و کارلێکی خانەوادەیی:** فرۆید رەخنەی لە جەختکردنەوەی زیاد گرتووە لەسەر رۆڵی دیاریکەرە بایۆلۆژییەکان و گرنگی بە جەختکردنەوەی سەر رۆڵی رۆشنبیریی کۆمەڵایەتی داوە لە پێکهێنان و گەشەکردنی کەسێتیدا. رەنگە نموونە

کۆمەڵایەتییـەکان و سیـستمەکانیش جـۆری دیـاریکراوی کەسـێتی بەرهـەمبهێنن. کاتێکیش فرۆید باسی خانەوادەی کردووە و شرۆڤەی کردووە بەوەی کە لـە دایبـاب و منداڵ پێکدێت، پێیوابووە کە پەیوەندیی دایك و باوك بەر لە بوونی منداڵەکە هەبووە و پەیوەندییەکـە و لـە خانـەوادەدا کاریگەرییـەکی نکـۆڵی لێنـەکراوی بەسـەر منـداڵ و پێگەکـەی هەیـە ، خانـەوادە نـەك هـەر تـەنها سـەرگەی هـەنگاوەکانی تاکـە بـەرەو پەیوەنـدیی بەخـەڵکانی دیکـەوە، بـەڵکو لەهـەمان کاتـدا نموونـەی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانی دواتریشە، چوونکە منداڵ هەمان ئەو ئاراستە و خولیایـە بـۆ کۆمەڵـە دەگوازێتـەوە کـە کـە لـەکاتی ژیـانی خانەوادەییـدا پێکهـاتووە. خانـەوادە پێداویـستییەکانی تـاك وەدیـدەهێنێت و رەمەکـەکانی تێـر دەکـات، ئـەم تێرکـردن و وەدیهێنانەیش وای لێدەکات سنووری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی فراوانتر بکات.

٣- **سایکۆلۆژیای جەماوەر:** سەبارەت بە سایکۆلۆژیای جەماوەرەوە چوونە نێـو دەور بـەڕای فرۆیـد بـە کلیلـی کردنـەوەی دەرگـەی چـەمکە دینامیکییـەکانی کۆمەڵـە دادەنرێت، چوونکە بە بۆچوونی ناوبراو کۆمەڵەی سەرەتایی کۆمەڵێك تاکن کـە لـە نێـو کەسـێتیی سـەرکردەدا یەکـدەگرن و دەتوێنـەوە بـەم شـێوەیەش پەیوەندییـە هەڵچوونییەکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵە و نێوان گشت ئەنـدامان و نێـوان ئەنـدامان و سـەرکردە شـکلگیر دەبێـت. کاریگـەری و شـوێنەوارەکانی کۆمەڵـەش لـە چـەپاندن و بـەرزەفتکردنی هەڵـچوون و ئەرکەکانیـدا شـکلگیر دەبێـت، تـاکیش ئەنـدامی کۆمەڵـەی جۆراوجۆرە، لەبەرئەوە یەکبوون و توانـەوە سـۆزییەکەی چـەندان ئاراسـتە بەخۆیـەوە دەگرێت، منە میسالیەکەشی رەنگدانەوەی چەندان سەرکردەی جۆراوجۆرە.

**٤- بنەچە و بناغەی کۆمەڵگە:** فرۆید زۆر بەورد و دووردرێژی باسی ئەم بابەتەی کردووە و دەڵێت کە لەسەرەتای پێکهاتنی کۆمەڵگەدا مرۆڤ لە چەند هۆزێکی بچووك و لەژێر کۆنترۆڵی نێرێکی بەهێز ژیاوە، نێرەکەیش باوکی گشت هۆزەکە بووە و هێزێکی بێسنووری هەبووە، ئەم هێزە زۆرەیش لەهەمبەر منداڵەکانیدا تا سنووری سادیزمی بردووە. گشت مێیەکانی هۆزەکەیش موڵکی ئەو بوون، لەبەرئەوە گشت نێرەکانی هۆزەکەی کردووەتە ئامێرێکی سێکسی، ئەگەر رۆڵە کوڕەکان باوکیان تووڕە بکردبایە دەیکوشتن یانیش لە هۆزەکە وەدەری دەنان، لەبەرئەوە کوڕەکان ناچار بوون لەگەڵ هۆزی دیکە هاوسەرگیری بکەن. ئەمەیش دەبێتە هۆی پتربوونی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەنێو هۆزەکە و هۆزەکانی دیکەدا، بۆنموونە (هۆزی تابۆ واتا حەرامکراوەکان).

**٥- سروشتی شارستانیی مرۆیی:** فرۆید وەهای پێناسە دەکات کۆمەڵێك دەستکەوت و دەستگەیە کە ژیانی مرۆڤ لە ژیانی ئاژەڵ جیا دەکاتەوە. شارستانیش دوو ئەرکی هەیە: یەکەم: پاراستنی تاکەکان لە مەترسییەکانی جیهانی دەرەکی، دووەم: رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان خەڵکان.

هەروەها بوونی مرۆییانەی کۆمەڵگەکانیش تەنها لەو کاتەدا دەبێت کەوا کۆمەڵێك پیاو یەکدەگرن. ئەوسا کۆمەڵەکە بەسەر گشت تاکێکدا سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت و بەسەریدا زاڵدەبێت. جا ئەگەر هێزی کۆمەڵە یەککگرتووەکە گۆڕا بۆ هەژموونی یەك پیاو ئەوا بەڕای فرۆید دەبێتە کۆتایی شارستانیەت، چوونکە دوژمنایەتی دەبێتە ئەو هێزەی کە رێگە لە پێشکەوتنی شارستانی دەگرێت.

## فرۆیدییە نوێیەکان و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی:

### ئادلەر

ئادلەر پێیوایە رەفتار لەلایەن هاندەرەکانی کۆمەڵایەتییەوە پاڵی پێوەدەنرێت وشکلگیر دەبێت، چوونکە مرۆڤ بەرای ناوبراو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و خۆی بەخەڵکانی دیکە دەبەستێتەوە و کار لە چالاکییەکانی هەرەوەزی دەکات و شێوازی ژیانکردنیشی مۆرکێکی کۆمەڵایەتی بەسەریدا زاڵە، ئادلەر دەڵێت: گرنگیدانی کۆمەڵایەتی لە مرۆڤدا شتێکی رەمەکییە.

### ئەریك فرۆم

فرۆم دەڵێت: مرۆڤ پێویستی بە چوارچێوەیەکی مەرجەعی هەیە، واتا پێویستی بە شێواز و رێبازێکی نەگۆڕ هەیە بۆئەوەی لە جیهانی دەرەکی بگات و درکی پێبکات. ناوبراو لەهەمبەر پرسی پەیوەندیی مرۆڤ بە کۆمەڵگەوە پێیوایە کە ئەو وێنە و دیمەنانەی تیایاندا پێداویستی و ئەو رێگەیانە دەردەکەون کە مرۆڤ بەهۆیانەوە توانای ناوەکیی وەدەستدێنێ، ئەو رێکارە کۆمەڵایەتییانە دیارییان دەکەن کە لەسایەیدا دەژیەت. چوونکە گەشەکردنی کەسێتیی تاك لەسەر ئەو دەرفەتانە وەستاوە کەوا کۆمەڵگە بۆی دەستەبەر دەکات. هەروەها دەڵێت: مرۆڤ و سۆزەکەیشی زادە و دەرەنجامی رۆشنبیرییە.

### کارین هۆرنیێ

لێکدانەوەی هۆرنیێ بۆ زۆرێك لە هەڵوێستەکان (ئابلۆقەدانە)ە، چەمکەکەیشی لەلای ئەو جەخت لەسەر ئاستی پەیوەندیی کۆمەڵگە بە منداڵ دەکاتەوە، ناوبراو سەبارەت بە ئابلۆقە دەڵێت: ئەو هەستەیە کە بەهۆی گۆشەگیربوون و بێدەسەڵاتیی لەهەمبەر جیهانێکی پڕ لە دوژمنایەتی و زۆرێك لەو هۆکارە ژینگەییانەوە دروست دەبێت کە تاك پێشوازی لێدەکات، وەك: فێربوون و رێزنەگرتن لە پێداویستییە تایبەتەکانی منداڵ و

ستەم و بەجێنەهێنانی بەڵێن. دابڕانیش لە منداڵانی دیکە دەبێتە هۆی هەستکردن بە نائارامی و بێ ئاسایشی. لێرەوە منداڵ گەشە بە چەند شێوازێك دەدات بۆئەوەی بەهۆیانەوە رووبەڕووی گۆشەگیرییەکەی خۆی ببێتەوە، یەکێك لەو شێوازانەیش: دەبێتە کەسێکی دوژمنکار و تۆڵە لەو کەسانە دەکاتەوە کە بێزاندوویانە، یانیش دەبێتە کەسێکی ملکەچی ئەڵقە لەگوێ، یانیش دەچێتە نێو پێستی میسالیەتێکی نا واقیعی بۆئەوەی رووبەڕووی هەستی خۆ بەکەمگری و کەموکورتی ببێتەوە.

**هاری ستاك سۆلیفان:** پێیوایە کە قسەکردن سەبارەت بە تاك تەنها لە کاتی شرۆڤەکردندا بەهای نییە، لەبەرئەوەی تاك دوور لەخەڵکان نازیێت، زراسك (منداڵی تازە لەدایکبوو) هەر لە رۆژی یەکەمەوە بەشێکە لە هەڵوێستێکی ئاڵۆزکراو و بەدرێژایی ژیانیشی ئەندامێکی بواری کۆمەڵایەتییە. هەروەها جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کە مرۆڤ بەرهەم و زادەی کارلێکەکانی کۆمەڵایەتییە.

## دووەم: بیردۆزی وروژاندن و کاردانەوە و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی (ڕەفتاری)

چەمکە سەرەکییەکانی بیردۆزی وروژاندن و کاردانەوە خۆی لەچەند خووخدە و عادەت و فێربوون و پاڵنەر و بەڵگە و کاردانەوە (پاڵپشتیکردن و خامۆشکردن) دا دەبینێتەوە.

* خوو وخدە (عادەت): وروژان و کاردانەوە بەشێوەیەکی نەگۆڕ بەیەکەوە دەبەستێتەوە. زانایان سەرنجی خۆیان خستە سەر شرۆڤەکردن و لێکۆڵینەوەی چۆنیەتیی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە پەیوەندییانە و نەمانیان و زانینی ئەو هەلومەرجانەی کە خووخدەکان لەسایەدا سەرهەڵدەدەن یانیش پارچە پارچە دەبن و شیدەبنەوە.

⋆ فێرکردن: واتا گۆڕینی رەفتاری سەرچاوەگرتوو لە وروژاندن. ئەمانەی خوارەوە پەیوەندییان بە فێربوونەوە هەیە و پێی وابەستەن:

– پاڵنەر: وروژێنەرێکی بەهێزە کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت کار و کاردانەوە و رەفتار بکات. دوو جۆر پاڵنەریش هەن، یەکەمیان: پاڵنەری سەرەتایی (زگماکین) و خۆیان لەنێو لایەنە فیسیۆلۆژییەکاندا دەبیننەوە، وەك پاڵنەری (تینوویەتی و برسیەتی)، جۆری دووەمیشیان: پاڵنەری ناوەندیی (وەرگیراون) کە لەمیانی شیاندن و پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتییەوە دێنەکایەوە، وەك: ئاراستەگری و خولیاکان و حەز و مەیل و سۆز و هتد.

- بەڵگە: ئەگەر پاڵنەر پاڵ بەتاکەوە بنێت رەفتارێك بکات، ئەوا بەڵگە دەبێتە بیانووی وەڵامدانەوەکە کە شوێن و کات و جۆرەکەی دیاریکراوە شێوەیەکە ئارستەگری و خولیایی لەخۆی دەگرێت.

- کاردانەوە: کاتێ کاردانەوە ئەنجامگیردەبێت ئەوا بەردەوامبوون و پایەداری و نەبوونەکەیشی پشت بەو پاڵپشتی و خامۆشکردنە دەبەستێت کە بەدوایدا دێت، پاڵپشتیکردن بە پاداشت دەبێت لەهەمبەر ئەو کردار و رەفتارەی کە منداڵەکە یان کەسە پێگەیشتووەکە ئەنجامی داوە، خامۆشکردنەکەش بە سزادان دەبێت،بەو مانایەی کە پاداشتکردنی منداڵ و بەردەوامبوونەکەی خۆشەویستی کاری (پتەوکردن) لەلا بەهێز دەکات، بەڵام سزادانەکەی دەبێتە هۆی پشتکردن لە کارەکە.

هەروەها کاردانەوە بەسەر هەڵوێستەکانی هاوشێوەشدا دەگشتێندرێت، چوونکە ئەو خووەی کە وروژاندن و کاردانەوەکە بەیەکەوە گرێ دەدات و لە دۆخێکی دیاریکراودا فێری دەبین، حەز دەکەین بیگوازینەوە و بەسەر هەڵوێستی دیکەشدا بیگشتێنین، ئەمەیش لەو کاتەدا دەبێت کە روخسار و رەهەندەکانی هەڵوێستەکان وێکچوو بن.

## بیردۆزی وروژێنەر و کاردانەوە و رەوتی کۆمەڵایەتی

ئەو رەفتارەی تاك پیشانی دەدات و ئاشکرای دەکات ، زۆر بەو کۆمەڵگەیە کاریگەر دەبێت کە تیایدا دەژییت. هەریەکە لە دۆلارد و میلەر جەخت لەسەرئەوە دەکەنەوە کە ناکرێ لە رەفتاری مرۆیی تێبگەین تەنها بە درککردنی تەواوی ئەو بوارە کۆمەڵایەتییە نەبێ کەوا رەفتارەکەی لێ روودەدات. کەواتە ناتوانین پێشبینیی رەفتاری مرۆڤ بکەین

تەنها بە زانینی سیستمی ژینگەی کۆمەڵایەتییەکەی و پەیوەندییەکەی لەگەڵ خەڵکانی دیکە و ئەو کاردانەوانەی نەبێت کە بەهۆیەوە پاداشت دەکرێت یانیش سزا دەدرێت.

## بیردۆزی وروژاندن و کاردانەوە و شیاندن و پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی

لایەنگران و پێڕەوانی بیردۆزی وروژاندن و کاردانەوە لەگەڵ زانایانی شیکردنەوەی دەروونی کۆکن لەسەر ئەوەی کە ساڵەکانی یەکەمی تەمەنی منداڵ بناغە و چوارچێوەی کەسێتییەکەی لە ژیانی ئایندەدا دیاریی دەکات. هەروەها ئەو شتەی کە لەمیانی قۆناغی نێو لانك و ساواییدا فێری بووە لەژیانی ئایندەی منداڵدا بناغەی شڵەژانە هەڵچوونییەکانی دیاریی دەکەن. ئەم دەرەنجامەیش بەهۆی هەلومەرجی ژینگەی کۆمەڵایەتیی منداڵەوە دێتەکایەوە و یەکەمین جاریش سەرچاوە لە دایباب و ئاستی پەیوەندییان دەگرێت لەگەڵ منداڵەکەوە لەڕووی خۆشەویستی بەخشین و سۆزو توندوتیژی لەپەرەوەردەکردندا، ئەمەیش بە ڕۆڵی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی دەوروبەری دایبابەوە کە ئاخۆ سەقامگیرە یان ناسەقامگیر، ئەم پێچەوانەیەش وەها لە دایباب دەکات ڕەفتاری پێچەوانە و دژبەیەك لە هەمبەر منداڵەکەیاندا بکەن. ئەو هەڵوێستە شارستانیانەی کار بۆ دروستکردنی پێچەوانەیی و کێشمەکێش دەکەن ئەمانەی خوارەوەن:

- هەڵوێستی خۆراك بەخشین بە منداڵ لە قۆناغی نێو لانکدا.
- هەڵوێستی ڕاهێنانی منداڵ بۆ پیساییکردن و چۆنیەتیی خاوێنکردنەوەی.
- ڕاهێنانی زووی سێکسی.
- ڕاهێنان بۆ کۆنترۆڵکردنی تووڕەیی و هەستی دوژمنایەتی.

بۆنموونە ئەگەر منداڵ بەبرسیەتی بەجێهێڵدرا، دواتر لە تەنیایی دەترسێت، ئەگەر کەمکردنەوەی گرژیی برسیەتیەکەش تەنها لەدوای ئامادەبوون و هاتنەوەی دایبابەوە

کەمکرایەوە، ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ ئامادەبوونەکە و کاردانەوەی ترس بەیەکەوە گرێ بدات، چوونکە ئەو منداڵەی لەبرسان دەگریەت و درك بەوە دەکات کە گریانەکەی دەبێتە هۆی دەستکەوتنی خۆراك، ئەوا کاردانەوەی ئەرێیی لە منداڵەکەدا دروستدەکات.

## سێیەم: بیردۆزی بوار و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی (کیرت لیڤین)

بونیاد و بناغەی ئەم بیردۆزە لەسەر (بواری سایکۆلۆژی) دارێژراوە، چوونکە گشت رووداوێکی سایکۆلۆژی بەدەرەنجامی ئەو بوارە لێکدراوەتەوە کە لە تاك و ژینگە پێکدێت. ئەوانیش یەك کۆمەڵە هۆکارن و هەرهەموویان پشت بەیەکتری دەبەستن. گشت رووداوێکی سایکۆلۆژیی وەك خەون و درککردن و بیرکردنەوە وەها لێی دەنواڕدرێ کە دیاریکەری تایبەتمەندییەکانی تاك و ژینگەکەیەتی و پەیوەندیی ئاڵۆزکراوی نێوان راستییە هەمەکییەکانی نێویانە و لە تایبەتمەندییەکانی تاك و بونیادی ژینگەکەی پێکدێت.

### بنەمایەکانی بیردۆزی بوار

لیڤین پێیوایە کە بیردۆزی بوار جەخت لەسەر ئەم خاڵانە دەکاتەوە:

١- هەڵوێست و رووداو و رەفتارەکان دەرەنجامی زۆرێك لە هۆکاری تێکچڕژاوی کارلێککەرن، ئەم هۆکارانەیش هەردەبێ لە هەڵوێستەکەدا بەتەواوی خۆیان بنوێنن، بۆنموونە: سەرکەوتن لە گەمەی تۆپی پێ بەندە بە چەندان هۆکارەوە، لەوانە: هاوکاری و وردی و توانای ماسوولکەیی و خێرایی جوولەکردن و دەرکردنی بڕیار بۆ شووتکردنی تۆپ، جا گۆڕانی یەکێك لەو هۆکارانە دەبێتە هۆی گۆڕانی ئەنجامەکە.

٢-هەڵوێست لە ساتێکی دیاریکراودا چەند تایبەتمەندییەکی هەیە کە هەردەبێ بە پیادەکردنی ئەم دوو کردە جیاوازەی خوارەوە دەستنیشان بکرێن:

- یان بە پشتبەستن بە مێژوو و رووداوەکانی پێشوو (شیکردنەوەی دەروونی) چەند دەستوور و بڕیارێك ئەنجام بدرێت.

- یانیش بۆ دۆخی هەنووکەیی چەند تاقیکردنەوە و توێژینەوەیەك ئەنجام بدرێت (دەروونناسیی ئەزموونگەری).

بەڵام کەسانی سەر بە بیردۆزی بوار راوبۆچوونیان لە خەڵکانی دیکە جیاوازە، چوونکە ئەوان لەساتێکی دیاریکراودا وەها لە هەڵوێستەکە ناڕوانن کە تەنها بەردەوامیی زەمەنیانە و درێژیی ماوەی زەمەنی بێت هەروەك لیڤین رای وەهایە بەندە بە ئاست و مەودای هەڵوێستەکەوە، جا هەرچەندە ماوەی هەڵوێستەکە لە ساتێکی دیاریکراودا زیادبوو، هەڵوێستەکە لە رەهەندە بواری و کاتییەکەیدا چارەسەر دەکرێت.

٣- لیڤین پێیوایە کە رابردوو و ئێستە و ئایندە لە ساتێکی دیاریکراودا چەند بەشێکن لە بواری دەروونی، چوونکە بوار هزری تاك لەهەمبەر رابردوو و ئایندەی دەگرێتەوە، روانگە و بینینی تاك بۆ ئێستە لەمیانی ترس و حەز و خەون و پێشبینی و چاوەڕوانییەکانی هەمبەر ئایندەی دەبێت.

## بەشداریی بیرۆدزی بوار لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا

کیرت لیڤین لەکارەکانی خۆیدا بە دوو ئاراستە بەشداری لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا کردووە:

- لێکۆڵینەوە لە کردار.
- کارلێکی کۆمەڵە و دینامیکیەکانی کۆمەڵە.

## لێکۆڵینەوە لەکار Action Resarch

کیرت لیڤین گرنگیی بە رۆڵ و گرنگی و بەهای لێکۆڵینەوە و پەیوەندییەکەی بەکار (کردار)ی کۆمەڵایەتی دەدات، چوونکە زانیاریی زانای کۆمەڵایەتی لەهەمبەر کردە سەرەکییەکانی کۆمەڵایەتی پتر دەکات. ناوبراو بۆچوونی وەهایە کە چەند

دەستگەیەکی کۆمەڵایەتی و پیشەسازی هەوڵیانداوە زۆرێك لەو گرفت و تەنگوچەڵەمانە چارەسەر بکەن کە رووبەڕووی کەسانی نێو ئەو دەستگەیانە دەبێتەوە، وەلێ هەرچەندە هەوڵێکی زۆریشیان دا نەیانتوانی ئەمە بکەن. لیڤین پێیوایە هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی پێوەرەکانی پێوانی رادەی خوێندن و پێشکەوتن و کاری کرێکاران، ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی خاوەنکار لێیان ناڕازی بێت. هەروەها لەو بوارەی کە پێوەری بابەتیی نییە، پێشکەوتن و فێربوون وەدینایەت، لەبەرئەوە هەردەبێ چەند پێوەرێك بۆ پێوان و هەڵسەنگاندنی پەیوەندیی نێوان هەوڵ و رادەی خوێندن هەبێت، ئەمەیش بەهۆی لێکۆڵینەوە وردەکانەوە دەبێت.

## دینامیکیەکانی کۆمەڵە Group Dynamic

کێرت لیڤین جەختی لەسەر گرنگیی پەیوەندیی کار بە لێکۆڵینەوە کردووەتەوە، بەتایبەتیش پەیوەندیی لێکۆڵینەوە بە بیردۆز. ناوبراو هەستی بە ئەگەری روودانی کاملبوونی نێوان زانستەکانی کۆمەڵایەتی کردووە، ئەمەیش بە جوولانی لە تەنها وەسفکردنێکی ژیانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵەوە بەرەو شیکردنەوەی تیۆری و شرۆڤەکردنی ئەزموونیانەی ئەو گرفتانەی کارلێك لەگەڵ ژیانە گۆڕاوەکەی کۆمەڵەدا دەکەن، لەمەدا لەژێر ناونیشانی "کارلێکی کۆمەڵە" دا ئاماژەی بەمە کردووە. نووسینەکانی لیڤین باسیان لە دینامیکیەکانی کۆمەڵە کردووە، بەلام پسپۆڕانی دەروونی بەشێوەیەکی گشتی نکوڵییان لە حەقیقەتی بوونی کۆمەڵە کردووە. یەکێك لەو کارە گرنگانەی لیڤین کردوویەتی، وایکردووە پسپۆڕانی دەروونیی باوەڕ بەو

بیرۆکەیە بهێنن کە کۆمەڵە تایبەتمەندیی خۆی هەیە و ڕەفتاری تاکیش بەو کۆمەڵە جۆراوجۆرانە کاریگەر دەبێت کە وابەستەیی لەهەمبەریاندا هەیە و تیایاندا دەژیەت.

لیڤین کارلێکی نێوان تاکەکان بە بناغەی کۆمەڵە دادەنێت و پێیوایە کە ڕەنگە وێکچوونی ئەندامان بۆ کارلێککردن بنەمایەکی چاکبێت ئەگەر هاتوو مەبەستەکە وێکچوونی ئاراستەگری و ئامانجەکان بێت. هەروەها ڕەنگە کارلێککردن بەهۆی وێکچوونەوە بێت یانیش هۆیەك بێت بۆی. دەتوانین خەسلەتە سەرەکییەکانی بیردۆزی بواریی – لیڤین– لەم خاڵانەی خوارەوەدا پوخت بکەینەوە:

١– ئەو ڕەفتارانەی دەلالەت لە بوار دەکەن لەوکاتەی ڕەفتارەکەی تیادا ڕوویداوە.

٢– شیکردنەوەکە وەك گشتێك بە هەڵوێستەکە دەستپێدەکات، لە هەڵوێستەکەشدا بەشە پێکهێنەرەکان جیادەبنەوە و تایبەتمەندیی خۆیان وەردەگرن.

٣– دەتوانرێ کەسە ڕاستەقینەکە و هەڵوێستە ڕاستەقینەکە بنوێنددرێت.

لیڤین جەخت لەسەر گرنگیی ئەو هێزانە دەکاتەوە کە بەشداریی لە دیاریکردنی ڕەفتارەکاندا دەکەن. ئەو گوزارشت لەوە دەکات کە وەسفی سایکۆلۆژی بوار باشترە لە هەردوو وەسفی فیزیایی و فیسیۆلۆژی، وەهایەیش پێناسەی بوارەکەی دەکات کە: کۆبوونەوەی ڕاستی و ڕووداوەکانن بەیەکەوە، بەوەیش درکیان پێدەکرێت کە هەندێکیان پشت بە هەندێکی دیکەیان دەبەستن. لیڤین چەند چەمکێکی تیۆری بواری لەسەر دیاردە دەروونی و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا پیادەکردووە هەر لە قۆناغی منداڵی و نەوجەوانیی مرۆڤەوە تا دەگاتە کەمینەکان و مرۆکی نەتەوەیی و دینامیکییەکانی کۆمەڵە. لە وتارێکدا کە لە گۆڤارێکی ئەمریکی لەساڵی ١٩٣٨دا بەناونیشانی (بیردۆزی بوار و ئەزموونگەری لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا)

بڵاوکرایەوە، گرفتەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا چڕکردبوویەوە:

١- دروستکردنی کاملّیی نێوان روخسار و رەهەند و لایەنە جیاجیاکان و هێنانەکایەی زمانێکی زانستی یان چەند چەمکێك کە بتوانێ لەسەر بنەمایەکی هاوبەش مامەڵە لەگەڵ راستی و رووداوە رۆشنبیری و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و فیزیاییەکاندا بکات.

٢- تاوتوێکردنی رووداو و راستییەکانی پێشوو لەسەر بنەمای پشتبەستنیان بەیەکتری.

٣- چارەسەرکردنی گرفتەکانی مێژوویی و سیستمی.

٤- چارەسەرکردنی گرفتەکانی تاك و کۆمەڵەکان.

٥- تاوتوێکردن و لەخۆگرتنی کۆمەڵەکان بەگشت (قەبارەکانی)، چوونکە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی گرنگی بە گرفتی گەلان و نەتەوەکان دەدات،لە هەمان کاتیشدا گرنگیی بە کۆمەڵەیەکی منداڵانیش دەدات کە لەسێ منداڵ پێکهاتبن و بۆ گەمەکردن کۆبووبێتنەوە.

٦- گرفتی کەشی کۆمەڵایەتی وەك فشار و هتد.

٧- لەسەر دەروونناسیی ئەزموونگەریی کۆمەڵایەتی پێویستە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمەڵە گەورەکان لە چوارچێوەیەکی بچووکدا رێگەیەك بدۆزێتەوە کە زەمینە بۆ هەوڵ و کاری تاقیگەیی خۆشبکات.

هەمەڕەنگی و جۆراوجۆری ئەو رووداو و راستیانەی کە لەسەر دەروونناسیی کۆمەڵایەتی پێویستە چارەسەریان بکات، لەلای بوێرترین ئەقڵی زانستی ترس و تۆقین

دروستدەکات، چوونکە بەهاکانی وەك (بیروباوەڕەکان و ئاکار و ئایدۆلۆژیـەکان)ی وەك لیبرالی و سۆسیالستی و شێوازەکانی ژیـان و بیرکردنـەوە و چەندان راستیی دیکـەی (رۆشـنبیری) دەگرێتـەوە، ئەمـە بێجگـە لـە گرفتـەکانی سۆسـیۆلۆژیی وەك بونیـادو پلەبەندیی کۆمەڵە و جەشنەکانی دەستگەکان و جیـاوازیی نێـوان کۆمەڵـەکان. لەتـەك ئەمانەیشدا گرفتی فیسیۆلۆژیی وەك تەندروستی و نەخۆشـی و لاوازی و هێـز و رەنگـی پێست هەن کە ئەم زانستە گرنگییان پێدەدات. لـە کۆتاییـشدا چـەندان گرفتـی مـادی وەك رووبەر و ئەو شوێنە جوگرافیە هەن کەوا کۆمەڵە داگیریان دەکات.

بوار و کایـەی دەروونـی لەیەکـەم جـاردا لـە پانتـایی ژیـانی ئـەو تاکە پێکدێت کـە ژینگەیـەکی دەروونــی دەوری داوە، کەسـەکە لەناوچـەی (درککـاریی – جوولـەیی) و ناوچـەی کەسـی – نـاوەکی تایبەتمەنـد دەبێـت و جیادەکرێتـەوە. ناوچـەی کەسـی – نـاوەکی بـەرۆڵی خـۆی دابـەش دەبێتـە سـەر چـەند کۆمەڵەیـەك خانـەی دەوروبـەری و خانەی سەنتەری. هـەروەها ژینگـەی دەروونـیش بەچـەند ناوچـەیەك جیادەکرێتـەوە و پانتـایی ژیـانیش رووپۆشـێك دەوری داوە کـە بـەناوی رووپۆشـی نـامۆ نـاودێرکراوە و بەشێك لە ژینگەی دەروونـی یـان بابـەتی پێکدەهێنێت. لـەنێوان ناوچـەی کەسـەکە و ناوچەی ژینگەکەیش سنوورێکی جیاکەرەوە هەیە کە بـە تایبەتمەنـدیی توانـای چـوونە ژوورەوە دەناسرێتەوە و گشت ناوچەکانی پانتایی ژیانیش لەنێو خۆیاندا تێکدەچرژێن، بەشێوەیەك رووداوی ناوچەیەك کاریگەریی بەسەر ناوچەیەکی دیکە دەبێت. کـاتێکیش ئـەم کاریگەرییـە لـەنێوان دوو واقیعەکـەدا روودەدات پێیـدەگوترێت رووداو، پلـەی پەیوەنـدیی نێـوان ناوچـەکان و ئاسـتی کاریگـەریی ئـاڵوێرکراوی نێوانیـان، لەلایـەن توندوتۆڵی سنوورەکانی نێوان هەردوو ناوچە کارلێککەرەکـە و تایبەتمەنـدیی رووپـەڕی

ناوچەکانەوە دیاریی دەکرێت. ئەوەیش دەگوترێ کە ناوچەکانی ژینگەکە پەیوەندی و وابەستەیی لەگەڵ یەکتریدا پەیدادەکەن کاتێ مرۆڤ یان کەسەکە دەتوانێت لەنێو ناوچەکاندا جوولە بکات. هەروەها ئەوەیش دەگوترێ کە ناوچەکانی کەسەکە پەیوەندی و وابەستەییان لەنێواندا هەیە کاتێ ئەو ناوچانە دەتوانن پەیوەندیی لەگەڵ یەکتریدا بەرقەرار بکەن. پانتاییەکانی ژیان دوو رەهەندی دیکەشیان هەیە، ئەوانیش: واقیع و نا واقیع و رابردوو و ئێستەیە.

لیڤین چەمکەکانی پێشوو بە زاراوەی شوێنی دەنوێنێ، بەشێوەیەك دەتوانین بەهۆی لقێکی بیرکاری تاوتوێی بکەین کە پێیدەگوترێت تۆبۆلۆژیا. زانستی تۆبۆلۆژیاش تاوتوێی پەیوەندییەکانی شوێنی دەکات و گرنگیی بە قەبارە و شێوە و رووبەر و دووری وچەندان تایبەتمەندیی دیکەی تەقلیدیانەی شوێن نادات، بەڵکو تاوتوێی پەیوەندییە شوێنییەکانی وەك " ئاوێتەبوونی شتێك بە شتێکی دیکە و بەش‌و هەمەکی و پەیوەندی و ناپەیوەندی دەکات.جا لەبەر ئەوەی لیڤین چەمکە بونیادیەکانی خۆی بەشێوەیەکی تۆبۆلۆژیانە دەنوێنێ، ئەم بەشەی بیردۆزەکەی (یان رێبازەکەی) بە دەروونناسیی تۆبۆلۆژی ناودێردەکرێت.

بۆئەوەی لیڤین چەمکە دینامیکیەکانی وەك ئاراستە و دووری و هێز وێنا بکات و بینوێنی، لەسەری پێویست بوو جۆرێکی دیکەی شوێن دابهێنێ کە ناوی لێناوە شوێنی هۆدۆلۆژی. هۆدۆلۆژیا زانستی رێنگە (ممرات) و رەوتەکانە. رێنگە و رەوت لەلای ناوبراو یەکسانە بە جوولە، تایبەتمەندیی شوێنی هۆدۆلۆژیش ئەوەیە کە دەکرێ بە وێنەی نەخشەیی گوزارشتی لێبکرێ و گشت ناوچەیەك بە خاڵ و سنووری نێوان ناوچەکانیش بەهێڵێك دەستنیشانبکرێت کە ئەم خاڵانە بەیەکتری دەبەستێتەوە.

سەرتاپای چەمکی دینامیکی لیڤین ئەو شتە پێکدەهێنێت کە بە سایکۆلۆژیای ئاراستەکراوەکان Vector Psychology ناودێری کردووە.

## دینامیکییەکانی کەسێتی:

دەرخستنی کێرڤیانەی پانتاییەکانی ژیان بە نەخشەی ڕێگە دەچێت، چوونکە نەخشەی باشی ڕێگە کۆی ئەو زانیاریانەی تیادایە کە مرۆڤ پێویستە بیزانێ بۆئەوەی هەر جۆرە سەیران و سەفەرێك بکات، ڕێك وەك دەرخستنی ڕوونکردنەوەیی کێرڤیانەی باش بۆ کەس و ژینگەکەی کۆی ئەو ڕاستی و واقیع و ڕووداوانەی تیادایە کە مرۆڤ پێویستیەتی بۆئەوەی بتوانێ لێکدانەوە بۆ هەر جۆرە ڕەفتارێکی گریمانەیی بکات. بەڵام هەروەك چۆن نەخشەی ڕێگە ناتوانێت ئەو گەشت و سەیرانەمان بیربێنێتەوە کە مەبەستمانە ئەنجامی بدەین، بەهەمان شێوەیش هیچ وێنەیەکی پوخت و تێروتەسەلی پانتایی ژیان ناتوانێ پێمان بڵێت ڕەفتاری کەسێك سەد لەسەد چۆن دەبێت. بەهەمان شێوەش چەمکە بونیادی و تۆبۆلۆژیەکانیش بەتەنها ناتوانن ڕەفتاری بەرچاوی نێو هەڵوێستێك لێکبدەنەوە، چوونکە ئەم جۆرە تێگەیشتنە پێویستی بە تێگەیشتنی دینامیکی هەیە.

چەمکە دینامیکیە سەرەکییەکانی لیڤینیش بریتین لە: وزە، گرژی، پێویستی، یەکسانی، هێز یان ڕێژەی ئاراستەکراو.

تێبینی دەکەین کە چەمکی پێویستیی تاکە چەمکە کە بە گشت وێناندنە دینامیکییەکانی دیکەوە گرێدراوە، چوونکە پێویستی وزە دەردەپەڕێنێ و بەهایش دەبەخشێت و هێزیش دروستدەکات، ئەمە چەمکی سەرەکیی یان مەڵبەندیی لیڤینە کە چەمکی دیکە لە دەوروبەریدا ڕێکدەخرێن.

لەوانەیە دینامیکیەکانی ژینگەی دەروونی بە چوار ڕێگەی جۆراوجۆر گۆڕانیان بەسەردا بێت، ڕێگەکانیش:

١- ڕەنگە بەهای ناوچەکە بەشێوەیەکی ڕێژەیی (چەندایەتی) بگۆڕێت، بۆنموونە لەناوچەیەکی کەم ئەرێنییەوە ببێتە ناوچەیەکی ئەرێنیتر، هەروەها ڕەنگە بەشێوەیەکی چۆنایەتیش گۆڕانی بەسەردابێت، واتا لە ناوچەیەکی ئەرێنییەوە ببێتە ناوچەیەکی نەرێنی. هەروەها ڕەنگە یەکسانیی نوێ بەدیاربکەون و یەکسانیی کۆن بزر ببن.

٢- ڕەنگە توندیی ڕێژە ئاراستەکراوەکان بگۆڕێن یان خودی ئاراستەکەیان بگۆڕێت، یانیش ئاراستە وتوندییەکەیان بەیەکەوە بگۆڕێت.

٣- ڕەنگە سنوورەکە زۆر پتەو و توندوتۆڵ و بەهێز بێت، هەروەها ڕەنگە زۆر لاوازیش بێت، یان بەدیاربکەوێت یان بزرببێت.

٤- هەروەها ڕەنگە تایبەتمەندییە مادییەکانی شوێنەکەیش بگۆڕێت، بۆنموونە نەرمی و چەقبەستنەکەی بگۆڕێت.

سەرلەنوێ بونیادنانەوەی ژینگەی دەروونی لەئەنجامی کردەکانی مەعریفییەوە و بەهۆی گۆڕانەکانی سیستەمەکانی گرژی لەلای کەسەکەوە ڕوودەدات، هەروەها سەرلەنوێ بونیادنانەوەی بونیادی مەعریفیش لەو کاتەدا ڕوودەدات کە کەسەکە بۆ چارەسەرکردنی گرفتێك ڕێگەی نوێ دەدۆزێتەوە (ڕۆشنبینی)، یانیش کاتێ شتێکی لەبیرکراوی بیردێتەوە، یانیش درك بە شتێکی ژینگەکەی دەکات کە پێشتر درکی پێنەکردووە، سەرلەنوێ بونیادنانەوەکە لەکاتی هەڵکوتانی چەند هۆکارێکی نامۆی ڕووپۆشێکی نامۆ فەراهەم دەبێت کە دێتە نێو ژینگەی دەروونییەوە.

دوا ئامانجی گشت کردەکانی دەروونی سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی کەسەکەیە بۆ دۆخی هاوسەنگی، دەشتوانرێ بەچەند ڕێگەیەکی جۆربەجۆر ئەو ئامانجە وەدیبهێنرێ، ئەمەیش ئەو شتەیە کە پشت بە جۆری ڕووداوەکە دەبەستێت.

باوترین رێگەی وەرگرتنەوەی دۆخی هاوسەنگی، جووڵە و چالاکییەکی گونجاوە لە ژینگەی دەروونیدا، هەر جووڵە و چالاکیی گونجاویشە کەسەکە بەرەو ناوچەی بابەتە تێرکەرەکەی ئامانجەکە دەبات. جا ئەگەر کەسەکە لەدۆخی گرژی بێت بەهۆی ئەوەی بێکار و دەستەپاچەیە، ئەوا وەدەستهێنانی کار دەبێتە هۆی لابردنی گرژییەکە. لەم جۆرە دۆخانەیشدا کردەکانی درککاری و جووڵەیی هۆکارێکی کارایە لە وەدیهێنانی کەمکردنەوەی گرژییەکە. رەنگە زۆر پێویست بێت کە سەرلەنوێ بونیادی پێکهاتەی ژینگەکە بنرێتەوە بۆئەوەی توانای هەبێت بگاتە ئامانجەکە، هەروەها رەنگە سەرلەنوێ بونیادنانەوەی ئەم کردە مەعریفیە ئاڵۆزە کاتێک بخایەنێت. چوونکە ئەو کەسەی کە هیواخوازە ببێتە سەرۆکێك، بەرلەوەی سەرکەوتن وەدەستبهێنێ چەند ساڵێکی تەمەنی لە مامەڵکردن لەگەڵ ژینگەکەدا دەباتە سەر، رەنگە لەم دۆخەیشدا سەرکەوتن وەدەستنەهێنێ و لەدۆخی ناهاوسەنگیی بەردەوامدابێت.

رەنگە جووڵانەوە و بزافی جێگرەوەیش ببێتە هۆی کەمکردنەوەی گرژی و وەرگرتنەوەی هاوسەنگی، ئەم کردەیەش پێویستی بەوە هەیە متمانەیەکی ئاڵوێرکراوی توندوتۆڵ لەنێوان هەردوو پێداویستییەکەدا هەبێت بەشێوەیەك تێرکردنی حەزێکیان ببێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی گرژیی نێو سیستمی پێداویستییەکەی دیکە.

لەکۆتاییدا رەنگە جووڵە و بزافە خەیاڵبکراوە بێگەردەکان ببنە هۆی دابەزاندنی ئاستی گرژی، چوونکە ئەو کەسەی وەها خەیاڵ دەکات کە پۆستێکی گرنگ وەردەگرێت تەنها بەهۆی ئەو زیندەخەونانەی کە تایبەتن بە سەرکەوتن، تێربوونێکی جێگیرەوە بەدەستدەهێنێ. چەندان زیندەخەونی ئامادەمان هەیە لەسەر شێوەی چیرۆك و شانۆیی و فیلمەکانی سینەماییەوە.

## چوارەم: سۆسیۆمەتری لەلای جاکوب مۆرینۆ

جاکوب مۆرینۆ لە کتێبەکەی خۆی بەناوی (مانەوە بۆکێ) دا کە لەساڵی ١٩٥٣دا چاپیکردووە، بنەمایەکانی بیردۆزەکەی خۆی لەهەمبەر پێوانی سۆسیۆمەتریدا راڤەکردووە، ئەم جۆرە هۆکارانەی توێژینەوە بوونەتە شتێکی باو و بەشێوەیەکی زۆر بەربلاو لە توێژینەوەکان و لێکۆڵینەوەکانی دینامیکییەکانی کۆمەڵەدا بەکاردەبرێن. ئامانجی ئەم شێواز و رێبازەیش دۆزینەوەی ئەو تۆڕانەی پەیوەندیی کۆمەلایەتین کە تاکەکان بەشێوەیەکی واقیعی لە کارلێکی رۆژانەی راکێشران و دوورکەوتنەوە و کەمتەرخەمی جیادەکاتەوە و خەسڵەتێکی تایبەت بەخۆیانیان پێدەبەخشێت. هەروەها ئامانجی دۆزینەوەی نا فەرمیانەی کۆمەڵەکان و پێگەکانی کۆمەلایەتیی تاکەکانە. سۆسیۆمەتریش رێباز و شێوازێکی شیکردنەوە و ئامرازێکی کۆکردنەوەی زانیارییەکانە. مۆرینۆ پێیوایە کە بەردی بناغەی رێباز و بەرنامەکەی، لەیەک کاتدا تیۆرو پیادەکردنیشە. مۆرینۆ لە نەمسا خوێندوویەتی و بەرلەوەی بچێتە ئەمریکاو لەوی بگیرسێتەوە وەك پزیشکێکی دەروونی کاری کردووە.

سۆسیۆمەتری لەلای ناوبراو سێ وێنە و روخساری هەیە، ئەزموونی سۆسیۆمەتری، چارەسەرکردنی بەکۆمەڵی دەروونی، سایکۆدراما کە تیایدا ئەندامانی کۆمەڵەکە لەسەر سروشتی خۆیانن و بەپێی سروشتیان رەفتار دەکەن و زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی و دوور لە زۆر لەخۆکردن کارلێکدەکەن، لەسەر بنەمای پتەویەکەشی لەخۆوەیی (تلقائیەتی) کۆمەڵە ناکەنە قوربانی. دووبەرەکی و کێشمەکێشی نێو کۆمەڵەکە هێندە گرنگ نییە مادامەکی گوزارشتێکی راستگۆیانەی شتە دەروونییەکانی تاکەکان، پتەوی‌و یەککگرتوویی کۆمەڵەیش بە پلەی هاوکاری و هەماهەنگی و ئەو کامڵبوونە

دەپێـوریێ کـە لـەنێوان تاکـەکان و کۆمەڵـە لاوەکییـەکانی دیکـەی نێـو کۆمەڵـە سەرەکییەکەو چەندان کۆمەڵەی دیکەدا هەن و لەسەر بنەمای ئـەو ئامانجە دەپێورێت کە کۆمەڵەکە لەپێناویدا پێکهاتووە. رێی تێدەچیێ لـە کۆمەڵگەکانی تلقائی– ئەوانـەی پەیوەندییـەکانی نێـوی زۆر بـە سەربەسـتی دێتەکایـەوە– پتـەوی و توندوتۆڵییەکـە تێکبچێت یانیش بەپێی زیادبوونی ژمارەی کۆمەڵە سەربەخۆییەکانی نێوی و ژمـارەی ئەو ئامانجانەی هەوڵی بۆ دەدات، پتەوییەکە پتر ببێت.

کەواتە سۆسیۆمەتری لەچوارچێوەی کۆمەڵە راستەقینەکان و پێشبینکراوەکانەوە کاردەکـات، لەسـەر دووبنـەمایش بونیـاد دەنرێـت، یەکـەمیان: دینامیکیـەکان و رەفتارەکانی کۆمەڵەکەیە و دووەمیشیان پێوانی ئـەو پەیوەندییـە دینامیکیانەیـە کـە بەهۆی لەیەکتر نزیکبوونەوە و دوورکەوتنەوە لەیەکتر سەرهەڵدەدەن.

مرۆینـۆ بیرمەنـدێکی سۆسیالـستی بـوو، سۆسیۆمەتریشی بـەو ئەڵقـە دینامیکییـە دانـابوو کـە زانـستی کۆمەڵناسـی و بـیردۆزی سۆسیالـستیی مارکـسی لەیـەکتری نزیکدەکاتـەوە، جـا ئـەوەی لـە پیـادەکردن بەسـەر کۆمەڵـەکانی بچووکدا سـەرکەوتن وەدەستدەهێنیێ رەنگە بەسەر کۆمەڵەکانی گەورەتریشدا سـەرکەوتن وەدەستبهێنی و بگـشتێنریێ. سۆسـیۆمەتری بەچـەند بەڵگـە و سـەلمێنراوێکی سـەرەتایی (یەکـەمی) دەسـتپێدەکات و گرنگترینیـان ئەوەیـە کـە مرۆڤایـەتی یەکەیـەکی کۆمەڵایـەتی و ئەندامییە، بەمەیش لەنێوان گشت بەشـە جۆربەجۆرەکانیـدا حـەز و مـەیلی لەیـەکتری نزیکبوونـەوە و پـشت لەیـەکترکردن سـەرهەڵدەدات. ئەمـەیش لەچـەند بەڵگـە و ئاماژەیەکی روونی راستییە بـایۆلۆژی و کۆمەڵایـەتی و دەروونییەکانـەوە خـۆی بـەدیار دەخات.

سۆسیۆمەتری لەلای مۆر دوو جەمسەری هەیە، کە باڵێکیان بەرەو دۆزینەوە و ئاشکراکردنی قووڵترین ئاستەکانی بونیادی کۆمەڵگە ئاراستە دەگرێت، لەکاتێکدا ئەوەی دیکە بەرەو ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەیەدا ئاراستە دەگرێت کە لەسەر ئەو راستی و رووداوانەدا بونیاد نراوە کە بونیادەکەی ئاشکرا دەکەن. مۆرینۆ هەوڵ دەدات بەمە گۆڕان و کارلێککردن ئامادە و ئاسان بکات لە گشت یەکەیەکدا کۆیانبکاتەوە. مۆرینۆ بۆئەوەی رەسەنایەتی و جیاوازیی خۆی بسەلمێنێ و خۆی لە گشت کەسانی خاوەن بیردۆزی مەزنی دەروونناسیی و کۆمەڵناسی جیابکاتەوە، سووربووە لەسەر داهێنانی چەند زاراوەیەکی تایبەت بە رێبازەکەی خۆی بۆنموونە: بەکارهێنانی واژەی چاوپێکەوتن encounter بۆئەوەیە تا گوزارشت لەگشت شێوەکانی پەیوەندی بکات (یەکتربینین، پەیوەندی و بەیەکگەیشتنی جەستەیی، رووبەڕووبوونەوە، کێشمەکێش، بینین و درککردن، لەمس و بەریەککەوتن، بەشداریکردن، خۆشەویستی، بەردەوامی..). هەروەها زاراوەی تێلی Tele داهێناوە (کە واژەیەکی یۆنانیە و واتای کاریگەری دروستکردن لە دوورەوە دەگەیەنێ). دەتوانین بەکێشکردنیش وەها لێکبدەینەوە بۆئەوەی گوزارشت لەو شتە بکات کە تاکو کۆمەڵەکان بەیەکەوە لەخۆی دەگرێت، تێلیش (بەکێشکردن) بەو چەسپە لێکدەداتەوە کە کۆمەڵەکان بەیەکەوە دەلکێنێت بەشێوەیەك پتەوی و یەکگرتوویی و ئاڵۆزکردنی پەیوەندی و بەرژەوەندی و شارەزایی و زانیارییەکان گشتیان دەبنە چەند ئەرکێکی تێلی (بەکێشکردن).

# پێنجەم: بیردۆزی نمایش و ناساندنی کۆمەڵایەتی

# Social Representation

ئەمەیش ئەم بیردۆزەیە کە لە میانی ئەم بیست ساڵەی دواییدا سەبارەت بەو کردە مەعریفیانەوە سەریهەڵدا کە حوکم بەسەر رەفتاری کۆمەڵایەتیدا دەکات. ئەم بیردۆزە لەسەر دەستی لێکۆڵەرانی فەرەنسییەوە هاتەکایەوە، بەلام بنەما و رەگوڕیشە تیۆرییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ چەمکی نمایش و ناساندنی بەکۆمەڵ Collective Representation کە دۆرکایم لەساڵی ١٨٩٨ دا هێنایە ئاراوە بۆ ئەوەی خەسڵەتەکانی بیرکردنەوەی بەکۆمەڵ لە بیرکردنەوەی تاکانە جیابکاتەوە. ئەمەیش پرسێکە و بۆ دەروونناسیی کۆمەڵایەتی زۆر گرنگە، بەلام تاوتوێکردنی دواکەوتنی دەرەنجامی هەژموونی هەر دوو شەپۆلە گەورەکەیە کە بریتین لە رەفتاریەت لە دەروونناسیی و(وضعية) لە فەلسەفەی زانستەکان، ئەمانەیش گرنگییان بەوە دا کە زانستەکانی کۆمەڵایەتی بخەنە نێو بواری زانستەکانی سروشتی.

مۆسکۆ فیچی زانای فەرەنسی لەساڵی ١٩٦١ دا بانگەشەی بۆ ئەم بیرۆکەیە کرد کە لەسەر بنەمای پێداگری لەسەر ئەرکە سومبولییەکان و رۆڵی لە بونیادنانی واقیع دارێژراوە، واتا رۆڵی زمان و پەیوەندیی هێمایی لە بونیادی واقیعی کۆمەڵایەتیدا. ئەم ئەرکە هێماییانەشی بە سیستمێك لە بەها و هزر و کارکردی دوو لایەنە داناوە: یەکەم: دروستکردنی سیستم و رێککارییەك کە وەها لە تاکەکان دەکات لەنێو جیهانە مادییە کۆمەڵایەتییەکەیاندا خۆیان ئاراستە بکەن و بەسەریدا زاڵبن، دووەمیش دەستەبەرکردنی پەیوەندی و بەردەوامیی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەکە بەوەی کە کۆدێك

یـان زمـانێکی تایبـەتیان بـۆ دەسـتەبەر بکـات بـۆ ناولێنـان و پـۆلینکردنی لایەنـە جۆربەجۆرەکانی جیهان و مێژووی تاکەکەسی و بە کۆمەڵیان.

ئەم چەمکە لە چەمکەکە هاوشێوەکانی وەك راوبۆچوون و ئاراستە و وێنە جیـاوازە، لـەوەی کـە ئـەم چـەمکانە واتـا کاردانـەوە و وەڵامدانـەوە لەهەمبـەر وروژێنـەرێکی دەرەکیو دواتریش ئامادەیی بۆ ئەنجامدانی کارێك لـەخۆی دەگرێت. بـەلاَم نمـایش و ناساندنی کۆمەلاَیەتی هەریەکە لە وروژێنەر و کاردانەوە دیاریی دەکات، چـوونکە لـەوە پترە تـەنها بەڵگەیـەکی رەفتاربێـت، بـەڵکو ئـەو رەگەزانـەی ژینگـە دادەرێژێتـەوە کـە دەبنە هۆی رەفتار لە چوارچێوەی خۆیدا، بەمەیش مانایەکی پێدەبەخشێت و تێکـەڵی رەوتێکی گەورەتری پەیوەندییەکانی دەکات. کۆمەڵەکانیش بەپێی نوانـدن و ناسـاندنە کۆمەلاَیەتییەکانیانــەوە واتــا لــەمیانی دونیابینیەکانیانــەوە جیادەکرێنــەوە. کەواتــە نواندنو ناساندنی کۆمەلاَیەتی رێگە و رێبازی مەعریفەیەکی تایبـەت بـە کۆمەڵگەیـەکی دیاریکراوە و ناکرێ کورت و کاڵ بکرێتەوە یان بـەرەو رێگەیـەکی دیکـە رەتبکرێتـەوە. بەکورتی رۆڵی نواندن و ناساندنی کۆمەلاَیەتی ئەوەیە نامۆ بکاتە ئاشنا، لۆژیکی پـشت ئـەم کردەیـەش ئەوەیـە کـە دەرەنجامـەکان حـوکم بەسـەر پێـشکەییەکاندا دەکـەن، چوونکە دەرەنجامی رەفتاری کۆمەلاَیەتی دەستنیشانی جۆرەکانی رەفتارەکانی دواتـر دەکات. توێژینـەوە ئەزموونگەرییـەکان پەیوەنـدیی پتـەوی نێـوان نوانـدن و ناسـاندنە کۆمەلاَیەتییــەکان و رەفتاریــان بەدیارخــستووە. لــە دەرەنجامەکانیــشیاندا وەهــا دەردەکەوێت کە نمایش و ناساندنە جۆراوجۆرەکانی کۆمەلاَیەتی لە یەك پێگە و دۆخدا (کار، هاوبەشەکان، هەڵوێستەکان، کۆمەڵەکان و هتد) جۆرەکانی رەفتاری هەمەچەشن دیاریی دەکەن. ئێمە بە تێبینیکردنی چۆنیەتیی سـەرهەڵدان و پێـشکەوتنی نواندن و

ناساندنی کۆمەڵایەتی و هاوشێوەیی و چوونیەکیی نێوان سەرهەڵدان و ئەرك و ڕۆڵەکەی لە بەردەوامبوون و پەیوەندیی دا ڕەنگە بگەینە دیاریکردنی وردترین ڕۆڵی کردەکانی مەعریفی لە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا.

درککردنی خەڵکان پەیوەندییەکی پتەوی بە مەسەلەی شرۆڤەکردنی ئاراستەکانەوە هەیە، وەك باوە بە ئامادەییەکی وەرگیراوی ڕەفتاریی خاوەن سروشتێکی پێوەرکاریی دادەندرێت، جا ئایا ئاراستەکان تا چ ئاستێك کاریگەریی لە ڕەفتار دەکەن؟ ڕاوبۆچوونەکان لەهەمبەر ئەم مەسەلەیەدا جیاوازن، بەڵام زۆربەی توێژینەوەکانی نوێ کۆکن لەسەر ئەوەی کە لەژێر سایەی هەلومەرجی دیاریکراودا دەتوانرێ ئاراستەکان بەهۆی پێوەرە باو و ناسراوەکانەوە بپێورێن، هەروەها لە پێشبینیکردنی ڕەفتاری تاك و کۆمەڵەکاندا دەتواندرێ متمانە بە دەرەنجامەکانی بکرێت. لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا زۆرترین لێکۆڵینەوەی لەبارەی لە گۆڕینی ئاراستەکان ئەنجام دراوە. دەبینین زۆربەی بیردۆزەکان و بەتایبەتیش بیردۆزی دوورکەوتنەوە و پشتێککردن(تنافری) مەعریفی و گۆڕینی ئاراستەکان بەهۆی بینینی ئەو ناکۆکیانەوە ڕوودەدات کە دەکەوێتە نێوان ئاراستە سەرەتاییەکانی تاك و ئەوانەی کە سەرچاوەی نوێی زانیاری پێشکەشیان دەکات، وەهایش باشترە کە ئاراستەکان بە بەشێکی نمایش و ناساندنی کۆمەڵایەتی و سیستمی بەهایەکان دابنێین.

توێژینەوە پیادەکارییەکانی ئاراستەکان گرنگییان بە پرسەکانی وەك دەمارگیری و هەڵاواردن داوە و بیردۆزەکانی یەکەمیش جەختیان لەسەر گرنگیدان بە ڕەگەزە کەسییەکان کردووەتەوە (نموونەیەك بۆ ئەم مەسەلەیەش ئەو توێژینەوەیە بوو کە سەبارەت بە کەسێتی هەژموون خواز و دەستبەسەرداگردا ئەنجام درا)، بەڵام

توێژینەوەكانی دواتر ئەوەیان روونكردەوە كە هەڵاواردن پەیوەندیی بە پەیوەستبوونی كۆمەڵایەتی و حەزی تاكەكانی كۆمەڵەكان هەیە بۆ وەدەستهێنانی ناسنامەی كۆمەڵایەتی.

لە رووی لایەنەكانی پاڵنەری رەفتاری كۆمەڵایەتیشەوە، ئەو لێكۆڵینەوانەی كە كارلێكی رۆژانەی كۆمەڵایەتیان شیكردووەتەوە، ئەوەیان دەرخستووە كە دوو رەهەندی سەرەكی بوونیان هەیە، ئەوانیش رەهەندی رەفتاری هەژموون و دەستبەسەرداگرتن لە بەرانبەر ملكەچی و رەفتاری ئەرێیانەی كۆمەڵایەتی (بەكێشكرانی پەیوەستەیی یارمەتیدان) لەبەرانبەر رەفتاری نەرێیی وەك (دوژمنكار)ین. دوژمنكاریش لەو بوارانەی لێكۆڵینەوەیە كە دەروونناسیی كۆمەڵایەتی بەرێژەیەكی زۆر بەشداریی تیادا كردووە. چوونكە دوای ئاراستە بایۆلۆژییەكان كە فرۆید و لۆرەنس پیادەیان كرد و جەختیان لەسەر سروشتی كەلەبەریی (تنفسيی) دوژمنایەتی دەكردەوە، ئەو بیردۆزانە سەریان هەڵدا كە لەسەر بنەمای فێربوونی كۆمەڵایەتی و بیرۆكەی بێهیوایی– دوژمنكارانە بونیاد نرابوون. بەڵام تێڕوانینی هەنووكەیی بۆ دوژمنایەتی بە شێوەیەك لە شێوەكانی رەفتاری كۆمەڵایەتی دادەندرێت كە هۆكارەكانی راهاتن و پاڵنەرایەتی دیارییان دەكەن.

## شەشەم: سایکۆلۆژیای گەلان و مۆرکی نەتەوەیی

ئەم بیردۆزە وەك شێوەیەك لە شێوەکانی بیردۆزی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی یەکەم جار لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەیەم لە ئەڵمانیادا سەریهەڵدا، سەرگەی خۆیشی لە یەکەمایەتی (اولویە) کۆمەڵگە گرتبوو، گوتبووی " گیان لەسەرووی تاکەکانەوەیە و تەنها بەهۆی بوونی گەل و نەتەوە کامڵ دەبێت. ئەم بیرۆکەیە بەتایبەت لە ئەڵمانیادا زۆر زەق بوویەوە، چوونکە ئەوساکە ئەڵمانیا لەچەند هەرێم و میرنشینی جیاجیای دوور لەیەکتری پێکهاتبوو، چەندان بزووتنەوە تیایدا سەریانهەڵدا کە داوای یەکخستنیان دەکرد. لازارسی فەیلەسوف و شینتال ی زانای زمانناسیی دامەزرێنەری بیردۆزی سایکۆلۆژیای گەلان بوون و هەردووکیان لەساڵی ١٨٥٩ دا وتارێکیان بەناونیشانی " رامانی رێخۆشکەر بۆ مەسەلەی سایکۆلۆژیای گەلان" لە گۆڤاری " سایکۆلۆژیای گەلان و زانستی زماندا" نووسی کە لەهەمان ساڵدا دامەزرێنرا. لەم وتارەدا ئەو بیرۆکەیان داڕشت کە هێزە سەرەکییەکانی مێژوو گەل یان (گیانی هەمەکییە) کە لە هونەر و زمان و ئەفسانەکان و دابونەریتەکاندا بەدیاردەکەوێت، بەڵام هۆشیاری تاکەکەسی تەنها دەرەنجامی گیانی گەل و ئەو یاسایانەیە کە بەپێی ئەوەوە پێکدێن.

ئەم بیرۆکەیە دواتر لەسەر دەستی فۆنت Wundt ١٨٣٢–١٩٢٠ پێشکەوت کە بەوە دەناسرێت یەکەم دامەزرێنەری تاقیگەی دەروونناسییە. فۆنت یەکەم جار لەساڵی ١٨٦٣دا وانەیەکی خۆیدا بەناوی (چەند وانەیەك سەبارەت بە گیانی مرۆڤ و ئاژەڵ) بیرۆکەی خۆی داڕشت، بەڵام لەساڵی ١٩٠٠ دا دەستی بە نووسینی کتێبە قەبەکەی

خۆی کرد کە لە دە بەرگ پێکهاتبوو و ناوی لێنا سایکۆلۆژیای گەلان. لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی لە پۆلینکردنی دەروونناسیی کردووە و گوتوویەتی کە دەبێ لە دووبەش پێکبێت، ئەوانیش دەروونناسی و فیسیۆلۆژیای گەلانە کە دەبێ لە تاقیگەدا بەهۆی دەروونگەراییەوە شرۆڤەی بکرێت، بەڵام تاقیگە بەکەڵکی شرۆڤەکردنی کردە بەرزەکانی دەروونیی وەك بیرکردنەوە و قسەکردن نایەت. لەبەرئەوە دەبێ بە سایکۆلۆژیای گەلانەوە دەستپێبکەین کە هیچ ڕێگە و شێوازێکی کارگەیی تیادا بەکارنایەت، بەڵکو شیکردنەوە بۆ بەرهەمەکانی ڕۆشنبیریی وەك زمان و هونەر و هتد دەکات.

دواتر فۆنت وازی لە چەمکی (گیانی هەمەکی) ناڕوون هێنا، سایکۆلۆژیای گەلانیشی کردە زانستێکی وەسفی و سیفەتی واقیعیی پێبەخشی بەوەی کە وەهای لێکرد شرۆڤەی زمان و خوو و نەریت و ئەفسانەکان بکات. لەگەڵ ئەمەیشدا بیرۆکەی سەرەکی پشت چەمکەکە لەلای لازارۆس و شینتال و فۆنت پێکهاتەی دەروونیی تاکە کە ڕەگوڕیشەکەی دەگەڕێتەوە سەر هۆشیاریی گەل. لەبەرئەوە لەسەر دەروونناسیی پێویستە بۆ شرۆڤەکردنی ئەم مەسەلانە دەروازە و بەشێکی تایبەت لەخۆ بگرێت. لەلای تاکیش لەتەك هۆشیاریی تاکەکەسیدا شتێکی دیکە هەیە کە مۆرك و تایبەتمەندی دەبەخشێتە کۆمەڵە و نەتەوەیەك.

بە باوەڕی ئێمە بیرۆکەی سایکۆلۆژیای گەلان باوکی شەرعیی ئەو بیرۆکە هاوچەرخەیە کە بە مۆرکی نەتەوەیی ناودێرکراوە، ئەم بیرۆکەیەش زۆر بەتوندی لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەمیانی توێژینەوە سەبارەت بە سروشتی دوژمنکارانەی گەلی ئەڵمانی بەدیارکەوت، چوونکە تۆباڵی داگیرساندنی جەنگ خرایە ئەستۆی

خەسڵەتە زاڵەکەی هەندێ گەلەوە کە پاڵی پێوەدەنێت ئەمە بکات، واتا ئەندامان و کەسانی ئەو نەتەوە و گەلانە کەسێتییەکی دوژمنکارانەیان هەیە.

جا بۆ ئەوەی چەمکی مۆرکی نەتەوەیی روونبکەینەوە، دەڵێین: کە دوو واتا لەخۆ دەگرێت، یەکەم: چەمکێکی ئامارییانەیە، واتا پشت بە دابەشکردنی خەسڵەت و چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراوی نەتەوە و گەلێك دەبەستێت، بەم شێوەیە دەتواندرێت بگوترێ کە کەسێکی ئینگلیزی (لە ناوەڕاستدا) لە ئەمریکییەك پارێزگارترە. دووەم: ئاماژە بەوە دەکات کە جۆرەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی بە گەلێکی دیاریکراوەوە وەستاوە، بۆنموونە دەگوترێت چەشنی داپلۆسێنەری دەستبەسەرداگر لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگەیەکدا باوە کە لە کەشێکی لێبوردە یان کەشێکی توندوتیژدا پەروەردە دەبن.

کلاینبێرگ ئەوەی بەدیارخستووە کە ئەم دوو واتایە لەیەکتر دابڕاو نین، چوونکە خەسڵەتەکانی تاکەکانی نەتەوە و گەلێك بەشداری لە پێکهاتنی سیستمە کۆمەڵایەتییەکەی دەکات، هەروەها سیستمیش بەشداری لە داڕشتنی تایبەتمەندییەکانی تاکەکانی دەکات.

رەنگە یەکێك لەو سەرچاوە گەورانەی کە بەشداری لە سەرهەڵدانی بیرۆکەی مۆرکی نەتەوەییدا کردووە ئەو سامان و بەرهەمەی زانیاریی ئەنترۆپۆلۆژی بێت کە توێژەران لەهەمبەر گەلانی سەرەتاییدا کۆیانکردووەتەوە، چوونکە واپێدەچێت ئەم زانیارییانە بیرۆکەی بوونی جیاوازیی روون لەنێوان (سروشت)ی ئەو گەلانە روونبکەنەوە، بەڵام نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە ئەو کۆمەڵگە بەژمارە کەمانە و لەگەڵ یەکتر گونجاوانە جیاوازییەکی گەورەیان لەگەڵ گەلانی جیهانی ئەمڕۆدا هەیە، دروستیش نییە کە چەند گشتاندنێکیان لێ دەربهێنین و بەسەر گەلانی گەورەدا پیادەیان بکەین، چوونکە گەلانی

جیهانی ئەمڕۆکەمان لەنێو کۆی دانیشتواندا جۆراوجۆرە. لەبەرئەوە ئەگەری گەورە ئەوەیە کە جیاوازیی گەورە لەنێوان (سروشت و خووەکان)ی ئەم کۆمەڵانەدا هەبن، نەك هەر ئەمە، بەڵکو رەنگە ئەم جیاوازیانە گەورەترین لەوانەی کە لەنێوان گەلانی جۆراوجۆردا هەیە. لەگەڵ ئەمانەیشدا هەندێ توێژەر هەوڵیانداوە بوونی مۆرکی نەتەوەیی گەلانی ئەڵمانی بسەلمێنن، بۆنموونە (برکنن) دەڵێت: لەلای گەلی ئەڵمانی بەگشتی سیفەتێك هەیە کە بە (بارانۆیای رۆشنبیری) ناوی بردووە. هەروەها جورر دەڵێت: گەلی یابانی (دوژمنکارانەن)، ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ شیاندن و پەروەردەکردنی چەقبەستووانەی منداڵ، بەڵام ئەم توێژینەوانە لە رەخنە دەرباز نەبوون، لەبەرئەوە راوبۆچوونی باوی ئێستە ئەوەیە کە لە مۆرکی نەتەوەییدا بەڕاستی جیاوازیی لەنێوان جۆرەها گەل و تەنانەت لەنێو کۆمەڵە جۆراوجۆرەکانی نێو یەك گەلیشدا هەیە. لەبەرئەوە ئەم توێژینەوانە کەمبوونەوە یانیش هەر نەمان کە بەدوای ئەم چەمکەدا دەگەڕێن.

## حەوتەم: بیردۆزی سایکۆلۆژیای جەماوەر

ئەمەیش یەکێکە لە شێوەکانی ئەو بیردۆزانەی کە باس لە یەکەمایەتی و سەرلیستبوونی تاک دەکات، بەڵام لەژێر سایەی جەماوەردا ئەم تاکیەتییە بزردەبێت. ئەم بیرۆکەیە لەسەر دەستی تاردی زانای کۆمەڵناسی فەرەنسیدا سەریهەڵدا کە گوتبووی رەفتاری تاک لەنێو جەماوەردا بە لەدەستدانی ئەقڵانیەت و پشتبەستان بە لاساییکردنەوە دەناسرێتەوە. دوای ناوبراویش سۆسیۆلۆژیستی فەرەنسی گۆستاڤ لۆبۆن ١٨٤١-١٩٣١ لەسەر ئەم رێبازە بەردەوام بوو و سەرنجی خەڵکانی بۆ سەر دژیوونی نێوان کۆی جەماوەر و دەستەبژێر راکێشا.

لۆبۆن پێیوایە خەسلەتە سەرەکییەکانی جەماوەر بریتین لە:

نائامادەیی تاکیەتی (ئەمەیش دەبێتە هۆی پێشەوایی کردن لەلایەن کاردانەوە و رەمەکەکانی سەرەتایی).

زاڵبوونی هەڵچوونەکان - (ئەمەیش دەبێتە هۆی سەرکێشیکردن).

نەمانی لۆژیك (واتا نەمانی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتیی کەسی). ئەم سیفەتانەیش وا دەکەن کۆبوونەوەی جەماوەری ببێتە قەوارەیەکی پڕ لە هەراوزەنا و ناڕێك و بێ سیستم، بەمەیش پێویستی بەو سەرکردایەتییە دەبێت کە خۆی لەنێو دەستەبژێردا دەبینێتەوە. بەڵام بۆچوونی لۆبۆن لەکاتی تێبینیکردنی رەفتاری حەشامەتێکی جەماوەریدا سەریهەڵداوە کە لەدۆخی تۆقیندابووە، دواتر بەسەر شێوەکانی دیکەی جەماوەریشدا گشتێندراوە، لەبەرئەوە بۆچوونەکانی زۆر زاڵمانە و بوونە و نەیتوانیوە لێکدانەوەیەك لەهەمبەر راستینی پەیوەندیی نێوان تاك و کۆمەڵە ببەخشێت.

## هەشتەم : بیردۆزی ڕەمەکەکان لەلای ماکدۆگل

ئەو بیردۆزەیە کە ولیام ماکدۆگلی زانای دەروونناسی بریتانی دایناوە. ناوبراو بیرۆکەکەی خۆی لە کتێبێکدا بەناوی (پێشەکییەك بۆ دەروونناسیی کۆمەڵایەتی) باسکردووە، ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٠٨ دا دەرچووە، ساڵی ١٩٠٨ لە مێژووی دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا بە ساڵێکی زۆر تایبەت دادەندرێت کە تیایدا پایەکانی ئەم زانستە بەتەواوی بەرپاکران و راگەیەندرا کە زانستێکی سەربەخۆیە.

بیرۆکەی سەرەکیی لەلای ماکدۆگل ئەوەیە کە ڕەمەکە زگماکییەکان هۆی ڕەفتاری کۆمەڵایەتین. ڕەمەکەکان بەڕای ناوبراو چەند ڕەوتێکن و لەلایەن بۆماوەوە دیاریکراون بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەو وزە دەمارییانەی کە ڕەمەك و هەڵچوون بەیەکەوە دەبەستنەوە، هەر ڕەمەکێکی سەرەکیش هەڵچوونێکی تایبەت بەخۆی هەیە و وروژاندنەکەیشی لە ئەرکی ڕەمەکدا دەبێتە بەشێکی سەرەکیی.

ڕەمەکەکانیش خزمەتی ئامانجێکی گەورەتر دەکەن، ئەویش پاڵنەرە بۆ ئەنجامدانی ڕەفتار و چالاکییەك. لەلای ماکدۆگل مرۆڤ بوونەوەرێکی ئامانجدارە و هەر ڕەفتارێکی مرۆڤیش مەبەستێکی لەدواوەیە، لەبەرئەوە ئەو سایکۆلۆژییەی کە دایهێناوە بە سایکۆلۆژیای ئامانجدارو سایکۆلۆژیای مەبەست (هۆرمی) ناودێرکردووە، (وشەی Horme) وشەیەکی یۆنانیەو واتای (بەرتەمابوون، حەز، ئارەزوو) دەگەیەنێ. گشت ڕەفتارێك مەبەست و ڕەمەکێك لەپشتیەوەیە کە هەڵچوونەکان دەوروژێنێ بەشێوەیەك بەهۆی چالاکی و جوولەی مرۆڤەوە ئەو مەبەستانە دێنەدی. ناوبراو ڕەمەك و هەڵچوونە بەدواداهاتووەکەی بەیەکەوە گرێداوە، حەوت جووتی بەیەکەوە گرێدراو هەن، وەك: ڕەمەکی جەنگکردن کە هەڵچوونی تووڕەیی و ترسی بەدوا دادێت، ڕەمەکی تاکایەتی

کـە هەڵـچوونەکەشی پاراسـتنی خـودە، رەمـەکی بونیادنـان کـە هەڵـچوونەکەی تۆژەنکردنەوەیـە، رەمـەکی مێگـەل کـە هەڵـچوونەکەی پەیوەسـتبوونە. لـەکۆی ئـەو رەمـەکو مەبەسـتانەی کـە وەك ئامـانج هـەوڵیان بـۆ دەدات گـشت دەسـتگە کۆمەڵایەتییـەکانی وەك خانـەوادە و جۆرەهـا کـردەی کۆمەڵایـەتی وەك ئـاڵوێر و هتـد پەیدا دەبن.

بیرۆکەی لێکدانەوەی رەفتاری کۆمەڵایەتی لەسەر بنـەمای رەمەکـەکان کەوتووەتـە بەر رەخنـەی زۆرەوە کە گرنگترینیـان ئەوەیـە کـە ئێمـە نـاتوانین جۆرەکـانی رەفتـار لەسەر بنەمای ماکدۆگل لێکبدەینەوە تەنها ئەو رەمەکانە نەبن کە رەمەکە هۆکارەکەی پشتی دەبینینەوە و ناودێری دەکەین. ئەوە روونە کە ناونان لە رەمەکێك لێکدانەوە بۆ رەفتارێـك ناکـات و پێشبینیـشی ناکـات، مەسـەلەکە گەیـشتووەتە ئاسـتێك کـە هـەر رەفتارێك رەمەکێکی تایبەت بەخۆی هەبێت.

هەروەها توێژینەوەکانی ئەنترۆپۆلۆژی ئەوەیان سـەلماندووە کـە هەنـدێ هـۆز هـەن بەهیچ جۆرێك دوژمنایەتیان تیادا بەدیارناکەوێت، جا لەو کاتەی گشت کەسانی خـاوەن بیردۆزی رەمەکەکان کۆکن لەسـەر ئەوەی کە دوژمنایەتی رەمـەکێکی سـەرەکیی گـشت کەسێکە، ئەوا نەبوونی لەلای هەندێ کەسدا دەبێتـە بەرەنگاربوونەوەیـەکی سـەرەکیی بیردۆزەکە. پرسەکەیش لە دۆخـی هەنـدێ هـۆزدا بەدیاردەکـەوێت کـە خولیـا و حـەزی بەمولّککردنیان نییە و دەمانگەیەنێتە سەر ئەو راستییەی کە لێکدانەوەی کەسانی ئـەم بوارە واتا کەسانی سەر بە بیردۆزی رەمەك، لەرەفتاری مرۆییـدا تـەنها وەسـفێکی ئـەو رەفتار و چالاکییانەیان کردووە کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات و لێکدانەوەیـەکی راسـتینی نییە، چوونکە رەمەکەکان وەسفی رەفتار دەکەن و لێکی نادەنەوە.

هەروەها ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە مرۆڤ لەبەر بوونی ڕەمەکی دوژمنکاری شەڕدەکات، سەبارەت بەم ڕەفتارە زانیاریی ئێمە کەم و زیاد ناکات. هەرچۆنێك بێت کەسانی پسپۆڕی ئەم بوارە لەنێوان خۆیاندا لەسەر ژمارەی ڕەمەکەکان ڕێکنەکەوتوون، چوونکە هەندێکیان گریمانەی ئەوەیانکردووە کە دوو ڕەمەك هەیە، هەندێکی دیکەشیان شیمانەی هەژدە ڕەمەکیان کردووە، هەندێکی دیکەشیان هەوڵیان داوە بۆ هەر ڕەفتارێکی دیاریکراوی مرۆڤ ڕەمەکێك دابنێن.

بەڵام ئەوەی ئێستە باوە ئەوەیە کە چەمکی ڕەمەك پتر بۆ ئاژەڵ و گیاندارانی دیکە دەگونجێت نەك بۆ مرۆڤ. هەروەها پێناسەکەیش وردتر بووەتەوە و ڕەمەك بە ڕەفتارێکی تایبەت ناودەبرێت کە تایبەتە بە جۆرە نەژادێك، واتا شێوازێکی ڕەفتارییە کە بەشێوەیەکی ڕێژەیی هەموار ناکرێتەوە. هەرچەندە جۆرەها ڕەفتاری مرۆیی نین کە بەومانایە بتوانین بە ڕەمەك ناوی ببەین ، بەڵام ئەگەرێك هەیە کە بەچەند ئامادەییەکی ڕەمەکی دێینە سەر دونیاوە کە بەهۆی شارەزایی و ئەزموونەوە دەستکاریان دەکرێت و هەمواردەکرێنەوە.

دەبێ ئەوە بزانین کە ڕۆشنبیری و ئەزموون و شارەزایی و پێشکەوتن، بەدرێژایی هەزاران ساڵ ڕەفتاری مرۆڤیان هەموار کردووەتەوە و دەستکارییان کردووە، بوونی ڕەمەکەکانی مرۆییش لەڕووی لێکدانەوەی پاڵنەرەکانی ئەنجامدانی ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا بووەتە مەسەلەیەکی بێبایەخ.

## نۆیەم: بیردۆزی کرچفیلد

کرچفیلد پێیوایە کە پاڵنەرایەتی داینەمۆ و هۆیە دینامیکییەکەی رەفتارە. ناوبراو لە بیردۆزەکەی خۆیدا کە لە بواری دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا بە باشترین بیردۆزی مەعریفی دادەندرێت، ئاماژەی بە چەند سەلمێندراو و راستییەکی نێو بیردۆزەکەی خۆی کردووە، ئەوانیش:

١- یەکەی گونجاو بۆ شیکردنەوەی پاڵنەری یەکەی بەشەکین کە مامەڵە لەگەڵ پێویستی و ئامانجەکان دەکەن.

٢- دینامیکییەکانی رەفتاری بەشەکی لە بواری راستەوخۆی دەروونیدا سەرهەڵدەدات و لایەنە مێژووییەکانیش گرنگ نین، کاتی دەسەڵاتداریش کاتی هاوچەرخە، ئەو شتەی لەمێژووشدا گرنگە دەبێ ئامادەیی هەبێت بۆئەوەی کارا بێت.

٣- تێکچوونی سەقامگیریی لە بواری دەروونیدا دەبێتە هۆی چەند گرژییەك کە کاریگەریی بەسەر زانیاری و درککاری و کرداردا دەبێت، ئاراستەکانی ئەم کاریگەریانەیش بە ئاراستەی دروستکردنی بونیاد و قەوارەیەکی دەروونی سەقامگیرتر ئاراستە دەگرێت. هاوسەنگیی دەروونیش لەو کاتەدا تێکدەچێت کە پێداویستی و حەزەکان تێرنەکرێن، ئەم تێکچوونەیش کاریگەریی بەسەر درککردن و مەعریفە و کرداری تاکەوە دەبێت و دواتریش مرۆڤ بەدوای پێداویستییەکەدا دەگەرێت تا پێداویستییەکە کاڵ دەبێتەوە و پاڵنەرایەتیەکەش بەرەو چارەسەرکردنی ئەو پێداویستییە ئاراستە دەگرێت.

٤- بێهیوابوون لە گەیشتن بە ئامانج یان شکستهێنان لە دابەزاندنی گرژیدا دەبێتە هۆی چەندەها جۆرە رەفتاری جیاجیای گونجێنەر و نەگونجێنەر.

٥- هەندێ رێگە و شێواز هەن کە لەهەمبەر تاکدا تایبەتمەندییان دیاریکراوە و وابەستەی وەدیهێنانی ئامانجەکان و دابەزاندنی گرژییەکانە، دەشکرێ تاك فێری ئەم رێگە و شێوازانەیش بکرێت و لەلای جێگیر بکرێت کە رەنگە فێڵبازانە و پێداگرانە و قرچۆکانە بن.

٦- کاتێك تاك درك بەوە دەکات کە ئەندامێکی کۆمەڵەیە، گشت تایبەتمەندییەکانی ئەو تاکە کە رووبەرووی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵە دەکرێتەوە بەهۆی ئەندامبوونەکەی لەکۆمەڵەکەوە کاریگەر دەبێت و کاریگەرییەکە بەشێوەیەك بەرەو ناساندن و نواندن و بەراوردکاری ئاراستە دەگرێ، وەك: کۆمەڵ (حزب) کە تایبەتمەندیی دیاریکراوی هەیە. کاتێکیش رووبەرووی تاکێك دەبینەوە و بە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵەکە بەراوردی دەکەین، بۆنموونە کاتێ دەڵێین: ئەندامی حزبێك بیروبۆچوونی وەها و وەهای هەیە و بەوەو بەمە دەناسرێتەوە.. باوکیش بە ژمارەی ئەو تایبەتمەندییانە بەراورد دەکەین کە کۆمەڵەکە پێی دەناسرێتەوە، جا وەها درك بە تاکەکە دەکرێت یان سیفەتەکەی هاوشێوەی سیفەتی کۆمەڵەکەیە، یانیش جیاوازە.

## سەرلەنوێ رێکخستنەوەی مەعریفیانە:

١- کاتێ بێهیوابوون لە گەیشتن بە ئامانجەکان دێتەکایەوە، رێکخستنێکی مەعریفیانە سەرهەڵدەدات، سەرلەنوێ رێکخستنەوەکەیش بەرەو دابەزاندنی ئاستی ئەو گرژیانە دەچێت کە هەڵوێستەکەی بێهیوابوون پێکیدەهێنێ، چوونکە کاتێ مرۆڤ شتێکی دەوێت و لە وەدەستهێنانی شتەکەدا بێهیوا دەبێت، هەڵوێستەکە دووبارە دەکاتەوە. کاتێکیش هەڵوێستەکە دووبارە دەبێتەوە، ئەوا زیادەکارییەکی مەعریفی

نوێ لەهەمبەر هەڵوێستە نوێیەکە کاریگەریی شارەزایی و ئەزموونەکانیشی دەخاتە سەر.

٢- کردەی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی مەعریفی لە زنجیرەیەك ڕێکخستنی بەیەکتر وابەستە پێکدێت کە بەشێوەیەکی قووچەکی پێکهاتووە.

٣- بونیادە مەعریفییەکان بەپێی بنەماکانی ڕێکخستنەکە، لەمیانی کاتەوە بەچەند گۆڕانکارییەکی پلەپلە تێدەپەڕێت .

٤- ئاسانی و خێرایی ڕوودانی کردەی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی مەعریفی بە ئاماژەی ئاستی تایبەتمەندبوون و جیابوونەوەی یەکەم بونیادی مەعریفی دیاریی دەکرێت.

## دەیەم: بیردۆزەکانی دانە پاڵ:

شرۆڤەکردنی چەمکی دانەپاڵ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری گۆڕانکارییەکان وەك ئامراز و چارەسەی گرفت و درککردن و نیگەرانی و لەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتی و ڕێزگرتن لەخود و فشارەکانی دەروونی و یادگە و توندوتیژیی بەکۆمەڵ و چەندان گۆڕانکاریی دیکەی دەروونی و کۆمەڵایەتی شرۆڤەکراون، چەمکی دانەپاڵ لە زۆربەی بوارەکانی دەروونناسیدا و بەتایبەتیش دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا شرۆڤەکراوە.

بیردۆزەکانی دانەپاڵ ئاماژە بە چۆنیەتیی لێکدانەوەی تاکەکان دەکات لەهەمبەر ئەو ڕووداوانەی کە لە ژینگە و دەوروبەریاندا ڕوودەدات. دانەپاڵ مانا بە ڕووداوەکانی جیهانی دەرەکی و ناوەکی دەبەخشێت، واتاکەی ئەوەیە کە چۆن خەڵك لێکدانەوە بۆ هۆی ڕووداوەکان و هۆیەکانی ڕەفتارەکانی کەسانی دیکە دەکەن لەهەمبەر ورووژێنەر و ئەو بابەتانەی کە مامەڵەی لەتەکدا دەکەن، بەو مانایەی چۆن خەڵك وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەنەوە کە بە بۆچی دەستپێدەکەن؟ واتا ماهیەتی درککردنی کۆمەڵایەتی بۆ ڕەفتارەکە.

بیردۆزی دانەپاڵ لە دوو ئاراستەدا خۆی دەنوێنێ، یەکەم: شیمانەی ئەوە دەکات کە هۆیەکی (السببیە) پشت بە کۆمەڵێك شێوەی مەنهەجی و کرۆکیی ڕووداوەکان دەبەستێ کە ڕەنگە جارێکی دیکەش لە هەڵوێستەکاندا ڕووبدەنەوە، بەواتایەکی دیکە لە هەوڵدانی خۆی بۆ لێکدانەوەی ڕووداوەکان پشت بە پەیوەندیی نێوان زانیارییەکانی بەردەست و بەڵگە و ئاماژەکان دەبەستێت.

ئاراستەی دووەمیش پشت بەو شیمانەیە دەبەستێت کە پێیوایە مرۆڤەکان ئەو چەمکە پێشوەختانەیان لەبارەی هۆیەکیدا هەیە و پێشبینیی دەکەن، ئەم زانیارییەش ڕێگە بە تاکەکان دەدات شێوەیەکی مەنهەجی ڕەفتار بە ڕێگەیەکی کورت جێبەجێ بکەن.

### ١- بیردۆزی دانەپاڵی رۆتەر

هەوڵێکە لەنێوان دوو ئاراستە لە دەروونناسیدا، ئەوانیش ئاراستەی رەفتاری و ئاراستەی مەعریفیانەی لێکدانەوەی ئەو شتانەیە کە لە هەڵوێستەکاندا رووبەڕووی تاکەکان دەبنەوە و درککردنە بەهۆیەکانی روودانیان.

رۆتەر گەشەی بە چەمکی چەقی کۆنترۆڵی داوە کە بە چەمکە هاوچەرخەکانی دەروونناسی دادەندرێت، چوونکە بە گرنگیدانی چەندان زانا کاریگەر بووە و بە سەرچاوەیەکی سەرەکیی تاك دادەندرێت کە لەمیانیەوە لێکدانەوە بۆ ئەو شتانە دەکات کە لەهەڵوێستەکاندا رووبەڕووی تاکەکان دەبێتەوە و درك بە هۆی روودانیان دەکرێت، چوونکە تاك یان ئەمە بۆ ئەو هۆکارانە دەگەڕێنێتەوە کە پەیوەندییان بە کەسێتییەکەیەوە هەیە وەك (هۆکارەکانی ناوەکی وەك کارامەیی و هەوڵ)، واتا بەرپرسی ئەو شتانەن کە بەسەری دێن)، یانیش دەیانداتە پاڵ چەند هۆکارێکی رێکەوتی و قەدەر و بەخت و هێزی خەڵکانی دیکە، واتا کەوتووەتە ژێر کۆنترۆڵی هێزی دەرەکی کە هیچ توانایەکی نییە بۆ ئەوەی کاریگەریی لەسەر بەجێبهێڵێ. هەروەها رۆتەر ئاماژەی بەو وەسفانە کردووە کە وەسفی ئەو کەسانەی پێدەکرێت کە چەقی کۆنترۆڵی ناوەکییان هەیە، گرنگترین سیفەتەکانیش بریتین لە:

١- ئەوان ئاگایی و زیتەڵەییەکی زۆرتریان لەهەمبەر ئەو گۆڕانکارییە جۆربەجۆرانەی ژینگە هەیە کە لەهەمبەر رەفتاری ئایندەییاندا زانیاریی بەسوودیان پێدەبەخشێت.

٢- بۆ چاکترکردنی ژینگەی دەوروبەریان هەنگاوی کارا و شرۆڤەکراو دەگرنە بەر.

٣- بەرپەرچی ئەو شتانە دەدەنەوە کە رەنگە بیانوروژێنێت و لەخشتەیان بەرێت.

بەڵام ئەو کەسانەی کە چەقی کۆنترۆڵیان دەرەکییە، گرنگترین سیفەتیان ئەمانەن:

١- نەرێیبوونێکی گشتی و لاوازیی بەرهەمیان هەیە.

٢- لەهەمبەر بەرگەگرتنی دەرەنجامی ئەو کار و رەفتارانەی ئەنجامی دەدەن، زۆر بەکەمی هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکەن.

رۆتەر پێیوایە چەندان جۆر مەڵبەندی کۆنترۆڵی دەرەکی هەن:

١- دەتواندرێت بە بەخت و رێکەوت Luckr- chance ناوببرێت، ئەمەیش باوەڕی تاکەکان دروستدەکات بەوەی کە جیهان پێشبینی ناکرێت (نەزانراو و ونە).

٢- قەدەر ئەوە لەلای تاکەکان دروستدەکات کە ناتوانن رەوتی رووداوەکان بگۆڕن، چوونکە ئەو رووداوانە پێشتر بڕیاریان لەسەر دراوە.

٣- مێزی خەڵکانی دیکەیە، واتا خەڵکانی دیکە هەن کە توانا و کاریگەرییان لە خودی کەسەکە زۆرترە.

٤- رەنگە پەیوەندیی بە بەخت و رێکەوت و قەدەرەوە هەبێت، جیهان بەشێوەیەك ئاڵۆزە کە ناتواندرێ خۆی و رووداوەکانی پێشبینی بکرێ. ئەمەیش لەبەرئەوەیە چوونکە خودی تاك مەسەلەکانی لێ تێکەڵ دەبێت و تێیان ناگات و ناتوانێ پێشبینییان بکات و بەرزەفتیان بکات.

رۆتەر و قوتابیانی ئەوەیان روونکردووەتەوە کە واپێدەچێت ئەم جۆرە مەڵبەندانەی کۆنترۆڵی دەرەکی جیاوازبن، بەڵام پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە. لەمیانی هەڵوێستیشەوە روو دەکرێتە مەڵبەندی کۆنترۆڵەکەوە، یانیش لەمیانی دۆخێکی دەروونییەوە کە تایبەتمەندییەکانی تاکەکە لەگەڵ رووداوەکە کار لێك دەکەن و تاکەکان بەپێی ئەو پلە و ئاستەی هەیانە ئەو بەرپرسیاریەتە دەگرنە ئەستۆ کە لە هەڵوێستێك سەرچاوە دەگرێت.

لەسەر ئەم بنەمایەوە باوەڕبوون بە مەڵبەندی کۆنترۆڵکار بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە ئاستی درککردنی تاك دەبەستێت لەهەمبەر پەیوەندیی نێوان رەفتارەکان و کاردانەوەکانی ژینگەیی و ئاستی هەستکردنی بە بەرپرسیاریەتی لەئاست رووداوەکاندا، چوونکە کرۆکی مەڵبەندی کۆنترۆڵ باوەڕبوونە بە بوونی پەیوەندیی لەنێوان کار و ئەنجام، تاکیش بەپێی ئەو ئاستەی لەم مەسەلەیدا هەیەتی، لەهەمبەر ئەو شتانەی بەسەری دێت، بەرگەی بەرپرسیاریەتیی کەسی دەگرێت.

کاتێ تاك باوەڕ بەوە دەهێنێت کە دەرەنجامی ئەرێیی و نەرێیی، زادەی لۆژیکیانەی کردار و رەفتاری تایبەت بەخۆیەتی، ئەو تاکە وەها وەسف دەکرێت لەو کەسانەیە کە مەڵبەندی کۆنترۆڵەکەی ناوەکییە، بەڵام کاتێ تاکێکی دیکە باوەڕی وەهایە کە دەرەنجامی ئەرێیی و نەرێیی رەفتار و کردار دەگەڕێتەوە بۆ رووداوەکان و پەیوەندییان بەکردارە تایبەتەکەیەوە نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هێزەکانی دەرەوەی خودی خۆی، ئەوا ئەو تاکە وەها وەسف دەکرێت کە مەڵبەندی کۆنترۆڵەکەی دەرەکییە.

لەهەمان کاتدا رۆتەر ئاماژەی بەوەشکردووە کە ئەو تاکانەی مەڵبەندێکی کۆنترۆڵی بەرزی ناوەکییان هەیە، رەنگە لە بواری سیاسەت و هزر و هونەردا داهێنەر و نوێگەربن.

لەکاتی قسەکردن لەسەر کۆنترۆڵدا هەردەبێ ئاماژە بە چەمکە سەرەکییەکانی بیردۆزی رۆتەر بکەین کە خۆیان لەم خاڵانەدا دەبیننەوە:

١- ئیمکانیەتی رەفتار: ئەمەیش مانای ئەوەیە ئەگەری روودانی هەر رەفتارێك لە هەڵوێستێك یان هەڵوێستەکاندا، پەیوەندیی بە هەر پاڵپشتکار و پتەوکارێك یان چەند پاڵپشتێکەوە هەیە، واتا ئەو شیمانەیەی کە رەفتارێکی دیاریکراو وەك ئاماژەی پێشبینییەکانی تاك روودەدات، بەهای پاڵپشتی رەفتارێك لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا بەدیار دەخات.

٢- پێشبینیکردن: ئەو ئەگەرەیە کە تاك لەهەمبەر ئەو پرسەدا دەیگرێتەبەر کە پاڵپشتێکی دیاریکراو وەك ئاماژەیەکی رەفتارێکی دیاریکراو روودەدات کە لە هەڵوێستێك یان هەڵوێستەکانی دیاریکراودا ئەنجامی دەدات.

چوونکە هەر رەفتارێك بە پاڵپشتیکردنێك بەسترایەوە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پێشبینیکردن، لەبەرئەوە هەر پێشبینیەکیش لەسەر بنەمای تاقیکردنەوە و ئەزموونەکانی رابردوو بونیاد دەندرێت.

٣- بەهای پاڵپشتیکردن: واتا پلەی بژارکردن و بەباشترزانینی پاڵپشتێك لەنێو کۆمەڵێك پاڵپشتدا، بەمەرجێك ئەگەرەکانی ئەم پاڵپشتیکردنانە هەر هەموویان یەکسان بن.

٤- هەڵوێستی دەروونی: بۆ پێشبینیکردنی رەفتارێك سوود لەم چەمکە وەردەگیرێت، چوونکە هەڵوێستی دەروونی ئەو شتەیە کە تاك لە روانگەی تایبەتی خۆیەوە دەستنیشانی دەکات.

## ٢- بیردۆزی هایدر:

هایدر شیمانەی ئەوەی کردووە کە بیردۆزی دانەپاڵ لەچواردەوری هۆیەکیی رووداني ئەو شت و رووداوەکان دەخولێنەوە، چوونکە هەر تاکێك ملکەچی هێزی ژینگەییە وەك ئەو فشارەی خەڵکانی دیکە دەیخەنەسەر، گشت تاکێکیش ئامادەیی جیاجیای هەیە، وەك ئاراستە و حەز و مەیل و توانا و خەسلەتەکانی کەسی، ئەم ئامادەییانەش رێگە بەو هێزانە دەدەن لەمیانی تێکەڵە و ئاوێتەی جۆراوجۆر بەرێگەی جیاجیا کاربکەن.

هەروەها ئاماژە بەوەش دەکات کاتێ هێزەکانی ژینگەیی کاریگەرییان بەسەر رووداوەکان زۆر بەهێز دەبێت، ئێمە تێبینیی دوو جۆرە کەس دەکەین کە لە کاردانەوەکانی خۆیاندا جیاوازیان لەنێواندا هەیە، هەندێکیان کەللەڕەقن و بڕیار و دەرەنجامەکانی رووداوەکە رەتدەکەنەوە و زۆر بەسووربوون و کەللەڕەقییەوە بەرپەرچی هەوڵەکانی وروژاندن و لەخشتە بردنەکان دەدەنەوە و نایەڵن هیچ شتێك کاریان لێبکات، هەندێکی دیکەش چۆك دادەدەن و زۆر بەئاسانی قبوڵی دەکەن. تاکیش لە ژینگەدا باوەڕی بە بوونی پەیوەندیی نێوان هۆ و دەرەنجام هەیە و لەهەمبەر ئەو شتانەی روودەدەن هەست بە بەرپرسیاریەتیی کەسی دەکات، ئەمەیش بە دانەپاڵی هۆیەکیی کەسی ناودەبرێت.

بەڵام هۆیەکیی ناکەسێتی، ئاماژە بەو هەڵوێستانە دەکات کە تاك لەپشتیانەوە مەبەستی نییە رەفتارێکی دیاریکراوی لێ بەرهەم بێت، یانیش رەفتارەکە ئەنجام دەدات و لە دەرەوەی ویستی خۆیدا روودەدات، بەو مانایەی کە هەندێ هێزی دەرەکی لە ژینگەدا هەن و دەبنە هۆی روودانی ئەو رەفتارە. هەروەها لێرەدا تاك باوەڕی وەها دەبێت کە لەژینگەدا پەیوەندیی لەنێوان رەفتار و کاردانەوەدا بوونی نییە.

رۆتەر لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: هەردەبێ هەندێ کارلێك بەشێوەیەکی مەبەستدار لەنێوان هۆیەکانی کەسی و پاڵنەریەتیدا هەبێت، هەر ئەمەیشە دەبێتە پاڵنەری رەفتار. بیردۆزەکە جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە رەفتار بەوە دانانرێ بەهێزێکی دەرەکی یان ناوەکی پاڵی پێوەنرابێ ئەگەر تاکەکە مەبەستی نەبووبێت بە ئامانجێکی دیاریکراو بگات، بەم شێوەیە مەبەست و پێشبینیکردن و بەها لە ئاراستەی مەعریفیانەی لێکدانەوەی رەفتاردا دەبنە چەمکی سەرەکی.

دانەپاڵی هۆیەکیی کەسی وێنەی بەرزەفتێکی ناوەکی دەبێت لەبەرانبەر دانەپاڵی هۆیەکی نا کەسێتیدا کە نوێنەرایەتی وێنەی بەرزەفتی دەرەکی دەکات، واتا رەفتار یان لەناوەوەی تاکەکە لێکدەدرێتەوە و بیرۆکەیەکمان لەبارەی توانا و ئامادەییەکانی تاك پێدەبەخشێت، یانیش لەدەرەوەیە و لەژینگەی دەوروبەری تاکەکەیە.

هەروەها هایدر ئەوەیشی خستووەتەسەر کە کردارەکانمان بەهۆی درککردنمان لەهەمبەر رووداوەکانەوە کۆنترۆڵ دەکرێت نەك لەمیانی ئەو شتەی کەبەشێوەیەکی راستەقینە روودەدات، چوونکە ئەگەر درك بە رووداو نەکەین هیچ کاریگەرییەکی بەسەر رەفتارمانەوە نابێت.

پێناسەکەی.

ئامانجەکانی.

شێوەکانی.

رۆڵـی شـیاندن و پـەروەردەی کۆمەڵایـەتی لـە پێکهاتـەی بونیـادی دەروونیدا.

دەستگەکانی.

# شیاندن و پەروەردەی کۆمەڵایەتی

ئامانجی کردەی فێربوون ئامادەکردنی کۆرپە و دواتر منداڵ و کەسی پێگەیشتووە بۆئەوەی بچێتە ریزی کۆمەڵگە و خۆی لەگەڵ پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و بەهایە باوەکان و ئەو کۆمەڵانە بگونجێنێت کە دەبێتە ئەندامیان و لەوە دەگات کە ئەرك و مافەکانی چین. هەروەها ئەو رۆڵە گونجاوەی پۆست و پێگەکەی خۆی فێردەبێت و دەزانێت خەڵکیش ئەرك و ماف و رۆڵیان چییە.

## پێناسەی شیاندنی کۆمەڵایەتی:

کردەی فێربوون و فێرکردن و پەروەردەیە و لەسەر بنەمای کارلێکی کۆمەڵایەتیدا بونیاد دەنرێت و ئامانجیشی ئەوەیە تاك رەفتار و پێوەر و خولیا و ئاراستەی گونجاوی هەمبەر ئەو رۆڵە دیاریکراوە کۆمەڵایەتیانە فێربێت کە توانای ئەوەی پێدەبەخشێت لەگەڵ کۆمەڵە بگونجێت و هەماهەنگی و گونجانی کۆمەڵایەتی لەگەڵدا بەرقەراربکات و تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونی بە ژیانی کۆمەڵایەتی فەراهەم بکات.

* کردەی گۆڕین و وەرچەرخاندنی بوونەوەری زیندووە بۆ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی.

* کردەی پێکهێنان و دروستکردنی رەفتاری کۆمەڵایەتیانەی تاکەکەسە.

* کردەی فێربوونی کۆمەڵایەتی تاکە کە تیایدا رێگەی کارلێکی کۆمەڵایەتی و رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان فێردەبێت و دەینوێنێت و ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتییانە وەدەستدەهێنێ کە دیاریکەری ئەم رۆڵانەن.

* کردەی گەشەکردنە کە تاك تیایدا لە منداڵێکی بێدەسەڵات و پشتبەستوو بە خەڵکانی دیکە، کە تەنها ئامانجی تێرکردنی پێداویستییە فیسیۆلۆژییەکانە دەگۆڕێت و دەبێتە تاکێکی پێگەیشتوو کە درك بە مانای بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵایەتی دەکات و دەشزانێ چۆن وەئەستۆی بگرێت و هەڵچوونەکانی بەرزەفت بکات و لە تێرکردنی پێداویستییەکانیشیدا رەچاوی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی دەکات و درك بە بەهایەکانی کۆمەڵگە دەکات و دەتوانێت پەیوەندیی ساغ و دروست لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دروست بکات.

چیلەر وەها پێناسەی شیاندنی کۆمەلایەتی دەکات بەوەی کە کردەیەکی هەمەکییە و تاك بەهۆیەوە ئاراستە دەکرێت تاکو رەفتارە راستەقینەکانی خۆی لە بوارێکی دیاریکراوتردا گەشە پێبدات، ئەویش بوار و ماوە باو و پەسندکراوەکانە بەپێی ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتیانەی کە لەسەری پەروەردەبووە.

هەروەها بارسۆنزیش وەها پێناسەی شیاندنی کۆمەڵایەتی دەکات بەوەی کە بریتییە لە کردەی فێرکردنێك کە پشت بە سرووش (تلقین) و لاساییکردنەوە و یەکبوون دەبەستێت لەگەڵ چەشنە ئەقڵی و سۆزی و ئاکارییەکانی منداڵ و کەسی پێگەیشتوو، کردەیەکە و ئامانجی ئاوێتەکردنی رەگەزەکانی رۆشنبیریییە بە رەوتەکانی کەسێتی و کردەیەکی بەردەوامی بێکۆتاییە.

**شیاندنی کۆمەڵایەتیش** کردەی فێربوونی کۆمەڵایەتییە کە تاك بەهۆی کارلێکی کۆمەڵایەتی و رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان فێری دەبێت، هەروەها ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتیانەش وەردەگرێت کە ئەم رۆڵانە دیاریی دەکەن.

**شیاندنی کۆمەڵایەتی** کردەیەکە کارلێك و گۆڕان لەخۆیدەگرێت، تاك لە کارلێکی خۆی لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵەکەیدا دانوستان لەبارەی پێوەرەکان و ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی و ئەو ئاراستە دەروونی و کەسیانە دەکات کە دەرەنجامی ئەم کارلێکەن.

شیاندنی کۆمەڵایەتی کردەیەکی بەردەوامە و تەنها تایبەت نییە بە قۆناغی منداڵییەوە، بەڵکو تا تەمەنی پیری بەردەوام دەبێت.

## ئامانجەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی

بەرجەستەترین ئامانجەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی ئەمانەن:

١- وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتیانەی کە رەفتار بەرزەفت دەکەن و ئاراستەی دەکەن.

٢- فێربوونی رۆڵەکانی کۆمەڵایەتی.

٣- وەدەستهێنان و وەرگرتنی زانیاری و بەها و ئاراستە و خولیا و گشت چەشنەکانی رەفتار.

٤- وەدەستهێنان و وەرگرتنی رەگەزە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵ بەشێوەیەك ببێتە بەشێك لە پێکهاتەی کەسێتییەکەی.

٥- گۆڕینی منداڵ لە بوونەوەرێکی بایۆلۆژییەوە بەرەو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی.

٦- فێربوون و ئاشنابوون بە دابونەریتە باوەکانی کۆمەڵگە و راهێنان لەسەر شێوازەکانی وەدیهێنانی پێداویستییەکان.

٧- وەدەستهێنانی توانای پێشبینیکردنی کاردانەوەکانی کەسانی دیکە بەرەو رەفتار و ئاراستەکانی.

# شێوە و جۆرەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی

شیاندنی کۆمەڵایەتی دوو شێوەی سەرەکیی هەیە:

١- شیاندنی مەبەستداری کۆمەڵایەتی: ئەم شێوازە لەرێگەی خانەوادە و فێرگەوە دێتەدی، چوونکە لەوێدا منداڵ لەرێگەی خانەوادەوە زمان و نەریتەکانی قسەکردن و رەفتار و پێوەر و ئاراستەکان فێردەبێت، هەروەها فێربوونی قوتابخانەییش فێربوونێکی مەبەستدار و راستەوخۆیە و کار بۆ پەروەردەکردن و شیاندنی منداڵان دەکات.

٢- شیاندنی بێمەبەستی کۆمەڵایەتی: ئەم شێوازە لە رێگەی مزگەوت و ئامرازەکانی راگەیاندن و سینەما و شانۆو هتد دێتەدی و تاك بەهۆیانەوە کارامەیی و هزر و پێوەری کۆمەڵایەتی و ئاراستە و ئەو خوو نەریتانە فێردەبێت کە پەیوەندییان بە خۆشەویستی و رق و سەرکەوتن و شکست و هاوکاری و لەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتەوە هەیە.

# رۆڵی شیاندنی کۆمەڵایەتی لە پێکهێنانی بونیادی دەروونیدا

زانایانی کۆمەڵناس وەها دەنوارنە مرۆڤی کۆمەڵایەتی کە بوونەوەرێکە و ملکەچی کردەی ئەو شیاندنە کۆمەڵایەتییە دەبێت کە بەپێی ویست و داواکارییەکانیەوە رەمەکە ئاژەڵیەکانی دەگۆڕێن بۆ ئەوەی لەگەڵ سروشتی ژیانی نێو کۆمەڵگەی مرۆییدا بگونجێن. روونە کە ئەم بۆچوونە لەگەڵ ئەوەی دیکە دژە کە جەخت لەسەر لایەنی رەمەکی نائەقڵیانەی مرۆڤ دەکاتەوە. زۆربەی زانایانی کۆمەڵناس پێیانوایە کە مرۆڤ لە گشت شوێنێکدا سروشتێکی رەمەکی سەرەتایی ئاژەڵیی هەیە، دوای ئەمە ئەم سروشتەیش بەهۆی کردەیەی فێربوونی کۆمەڵایەتییەوە دەگۆڕێت کە بۆماوەیەکی زۆر ملکەچی دەبێت. ئەوکردەی فێرکردنەیش دەتوانێت پاڵنەرە بایۆلۆژییەکانی ئاراستە بکات بۆ ئەوەی چەند رەوتێکی پەسندکراوی کۆمەڵایەتی بگرنەبەر، دواتریش وزە رەمەکییەکانی دەگۆڕێن و دەبنە پاڵنەری کۆمەڵایەتی.

بەڵام زانایانی دەروونناس نکۆڵی لەو رەگەزە نا ئەقڵییە ناوەکییانەی نێو بونیادی مرۆڤ ناکەن، بۆنموونە: باریتۆ جەخت لەسەر رۆڵی لایەنە نا ئەقڵییەکانی رەفتاری مرۆڤ دەکاتەوە. بەهەرحاڵ زانایانی کۆمەڵناس هەست بەوە ناکەن کە لایەنی نائەقڵیی مرۆڤ تەگەرە لەبەردەم گۆڕانی مرۆڤ دروست بکات تا بتوانێت ژیانی کۆمەڵگە پەسندبکات. هەروەها جەخت لەسەر هێزی کۆمەڵگەش دەکەنەوە بۆ رێگەگرتن لە بەدیارکەوتنی ئەو شوێنەوارە نەرێیانەی کە لایەنە نا ئەقڵییەکانی مرۆڤ بەرپای دەکەن، ئەمەیش لەمیانی بەرزەفتی کۆمەڵایەتی و پاداشت و سزاکانەوە. جگە لەمانەیش جەخت لەسەر هەوڵی بەردەوامی مرۆڤ دەکەنەوە بۆ وەدیهێنانی ئامانجە کۆمەڵایەتی و کەسییەکانی، مەبەست ئەو ئامانجانانەن کە لەمیانی رۆشنبیری وکەلتووردا مۆرکێکی رەوا

وەردەگرن. بەپێی ئەم واتایە دەتوانین بڵێین کە زۆربەی کردارەکانی مرۆڤ بە بەجێییو پێگەیشتن دەناسرێتەوە، ئەمەیش ئەو بنەمایەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتی دەکاتە شتێکی قورس. بەبێ متمانەی دوولایەنەی نێوان خەڵکیش پێگەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی پتەو نابێت.

کەواتە زانایانی کۆمەڵناس لەژێر تیشکی پاڵنەرەکانی کۆمەڵایەتییەوە لە مرۆڤ دەنواڕن، ئەوان جەخت لەسەر حەزی بەهێزی مرۆڤ دەکەنەوە بۆ وابەستەبوون و پەیوەندی دروستکردن لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا، هەروەها حەزیش بەوە دەکات کە متمانەیان پێبکات و ئامادەیی ئەوەشی هەیە کە لەمیانی کاری بەکۆمەڵەوە چوارچێوەی هێزی خۆی فراوانتر بکات. وێناندنی سۆسیۆلۆژی لەهەمبەر مرۆڤدا پتر بەرەو پشتڕاستکردنەوەی ئەو راستییە دەچێت کە (مرۆڤ) حەزدەکات خۆی بەخەڵکانی دیکە گرێبدات و هەڵیانبسەنگێنێ. لێرەدا وەها دێتە بەرچاو وەك ئەوەی مرۆڤ پابەندی گونجانی دوولایەنەی ئاڵوێرکراو بێت کە بەهۆیەوە ئامانجە تایبەتی و گشتییەکانی دێنێتەدی.

زاراوەی شیاندنی کۆمەڵایەتی یان ئاساییکردنەوەی کۆمەڵایەتی Socialization لە بەشی کۆتایی سییەکانی ئەم سەدەیەدا هاتووەتە نێو ئەنترۆپۆلۆژیا و دەروونناسیو کۆمەڵناسیەوە بۆئەوەی وەسفی ئەو کردانە بکات کە تاك بەهۆیەوە دەبێتە ئەندامێکی کارای کۆمەڵگەکەی. خاڵی جەختکردنەوە لەنێوان ئەم زانستانەدا جیاوازە، چوونکە کەسانی بواری ئەنترۆپۆلۆژیا جەخت لەسەر گواستنەوەی رۆشنبیرییەکان دەکەن و کەسانی خاوەن بیرتۆزەکانی کەسیش جەخت لەسەر بەرزەفتی مرۆڤ دەکەنەوە، بەڵام کەسانی بواری کۆمەڵناسی جەخت لەسەر فێربوونی

ڕۆڵەكان (الادوار) دەكەنەوە. لەكۆی ئەم بوارانەشدا زاراوەكە مانا و مێژووی تایبەتی خۆی دەبێت.

قوتابخانەی ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریكی بەوە جیادەكرێتەوە كە بیرۆكەی پەیوەندی لەنێوان كەسێتی و ڕۆشنبیری كردووەتەوە و پشتی بە بیردۆزی شیكردنەوەی دەروونی بەستووە و دەستەواژەی بونیادی سەرەكی كەسێتی Basic Personality Structure داناوە، ئەم دەستەواژەیەش گرنگیدانی كەسانی بواری سایكۆلۆژیای قووڵایی لەهەمبەر ئەو شتانەدا پیشان دەدات كە بەردەوام و پایەدار و سەنتەرین لە كەسێتیدا، لەلایەكی دیكەشەوە گرنگیدانی كەسانی بواری ئەنترۆپۆلۆژیا لەهەمبەر شتە باو و هاوبەشەكانی نێوان تاكەكانی كۆمەڵگەیەكی دیاریكراو ڕووندەكاتەوە، بەمەیش وەها شیمانە دەكرێت كە بونیادی سەرەكیی كەسێتی بە جیاوازیی ئەزموونەكانی شیاندنی كۆمەلآیەتی دەگۆڕێت.

بیردۆزی فێربوونی كۆمەلآیەتی یان فێربوون بەهۆی تێبینیكردن و لاساییكردنەوە بۆ لێكدانەوەی ئەزموونی دایباب و كەسانی نزیك و هتد لەسەر ڕەفتاری منداڵ بەدیاركەوتووە، هەروەها ڕەخنەی لە بیرۆكەی نەرێبوون و وەرگریی (تلقی) منداڵ گرتووە، لەجیاتیان ئەو بیرۆكەیەی زەقكردووەتەوە كە پێیوایە منداڵ لەكردەی ئاساییكردنەوەی كۆمەلآیەتیدا بەشداریكارێكی ئەرێییە.

سەبارەت بە زانستی كۆمەڵناسیش شرۆڤەكردنی ئاساییكردنەوەی كۆمەلآیەتی بەچەند گۆڕانكارییەكدا تێپەڕیوە كە بارسۆنزی ڕێبەری گشت كۆمەڵناسانی ئەمریكی بەو كردە دەروونیەی داناوە و لەمیانیدا خانەوادەی ناوەكیی ئەوتۆ دەستەبەر دەكات كە ڕۆڵی تایبەتمەندی هەیە لەوەی كە منداڵانی بەشێوەیەك گەشەبكەن كەوا

کەسێتییەکی مرۆییانەیان هەبێت و لەسەر سیستەمە باوەکان بڕۆن وەك پێڕەوکردنی ڕەفتاری گونجاوی کۆمەڵایەتی.

بەبۆچوونی دەروونناسیی گەشەکردنیش، زاراوەی شیاندن بۆ وەسفکردنی سەرجەم کردەکانی گەشەکردن بەکاردەهێندرێت و بەشێوەیەکی گشتیش ئاماژە بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی دەکات. شرۆڤەکانی سەرەتا بە بۆچوونی شیکردنەوەی دەروونی کاریگەر بوون بەتایبەت لەو شتانەی کە پەیوەندییان بە جیاوازییەکانی نێوان هەردوو ڕەگەز و ریزبەندیی منداڵ لەخانەوادە و پێگەیشتن و قۆناغە رووگیرەکان و کاریگەریی بێبەشبوون و سرووتەکانی پەروەردەییەوە هەیە. دواتر گرنگیدانەکە بەهۆی کاریگەریی بیاجی و کۆلبرگەوە دەچێتە سەر قۆناغەکانی گەشەکردنی ئاکاری و مەعریفی.

زانایانی بواری دەروونناسیی کۆمەڵایەتی گرنگیی بە رۆڵی شیاندن دەدەن لەرووی فێربوونی پێوەر و بەها و ئاراستەکان و ڕەفتاری گونجاو بۆ سەرکەوتن لە ژیانی کرداریدا، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیی بە گونجانی پیشەییەوە هەیە.

جگە لە زاراوەی شیاندنی کۆمەڵایەتی، زاراوەیەکی هاوشێوەی دیکە هەیە ئەویش شیاندنی کەلتووری و رۆشنبیرییە Enculturation، مەبەستمان لە پێکهێنانی مرۆڤە لەرێگەی فێرکردن و راهێنانەوە تاکو دەبێتە کەسێك کە توانای ئەوەی هەبێت لەژیانی رۆشنبیریانەی کۆمەڵگەکەیدا بەشداربێت، ئەم کردەیەش هەندێ جار بەشێوەیەکی هەستی و هەندێ جاری دیکەش بەشێوەیەکی نەستی دێتەدی. قۆناغە جۆربەجۆرەکانی فێربوونیش هۆکاری شیاندنی کەلتووری و رۆشنبیرین. جیاوازیش لەنێوان شیاندنی کۆمەڵایەتی و شیاندنی رۆشنبیری لەوەدایە کە ئەوەی دوایی واتای رەهەندە جۆراوجۆرەکانی ئەزموونی فێرکاری دەگەیەنێ کە مرۆڤ لە گیاندارانی دیکە جیا دەکاتەوە و وەها لە تاك دەکات لەرێگەی فێربوون و راهێنانەوە ئەو رۆشنبیرییە هەڵبگرێت کە تیایدا دەژیەت و تیایدا پسپۆڕە. بەڵام شیاندنی کۆمەڵایەتی ئاماژە بەو

کـردە دەروونـی و کۆمەڵایەتیانـە دەکـات کـە مـرۆڤ لەسـەر رەفتـاری کۆمەڵایـەتی رادەهێنێت و پتریش تایبەتـە بـە منـداڵان، لەکاتێکدا شیاندنی رۆشنبیریانە گـەورە و بچووك دەگرێتەوە. جۆرە گوزارشتێکی دیکـەیش هەیـە ئـەویش گونجـانی کـەلتووری و رۆشـنبیرییە "Acculturation" واتـا ئـەو کـردەی گونجانەیـە کـە تـاك لـەنێوان دوو کەلتوور و رۆشنبیریدا ئەنجامی دەدات، بـەڵام ئەگـەر لەکۆمەڵگەیەکدا ژیا کـە پـتر لـە رۆشنبیرییەکی هەبوو یان لەنێو دوو کۆمەڵگەدا لـە هاتووچـوودا بـوو کـە هەریـەکێکیان رۆشنبیرییەکی جیاوازی هەبوو، ئەوا هەوڵی گونجانی هەردوو کەلتوور دەدات.

## دام و دەستگەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی

دەستگەی کۆمەڵایەتی بریتییە لە کۆی ئەو رێکخستنە کۆمەڵایەتیانەی کە کۆمەڵگـە دایاندەمەزرێنێ بۆ رێکخستنی پەیوەندیی نێوان تاکـەکان تـاکو ژیـانێکی باشـتریان بـۆ فەراهەم بکات.

شـێوە و جۆرەکـانی دەسـتگەکانی کۆمەڵایـەتی بـەپێی جیـاوازیی ئـەو ئەرکانـە دەگۆڕێن کە دەستگەکە ئەنجامیان دەدات و لەنێو خۆیاندا دەچرژێنە نێو یەکتریەوە.

دەستگەکانی شـیاندنی کۆمەڵایـەتیش رۆڵێکـی تـەواوکاریان لـە بونیـادی کەسـێتیی تاکدا هەیە، بەرجەستەترینی ئەم دەستگەیانەش ئەمانەن:

### خانەوادە:

خانەوادە بە گرنگترین هۆکاری شیاندنی کۆمەڵایـەتی منـداڵ دادەنـدرێت و نوێنـەری یەکەمی کەلتوور و رۆشنبیرییە، خانەوادە فێرگەی یەکەمی منداڵە و هۆکـاری یەکـەمی رەنگکردنی رەفتاری منداڵە بە مۆرکی کۆمەڵایەتی. خانەوادەکان لە رووی شێوازەکانی رەفتـاری بـاو و پەسـندەوە لـەژێر تیـشکی پێـوەرە کۆمەڵایەتییـەکان و بـەپێی چینـە کۆمەڵایەتییەکەیان و ژینگە جوگرافی و رۆشنبیریەکەیانەوە وێکدەچن و وێکیش ناچن.

خانـەوادە بەچـەند تایبەتمەندییـەك دەناسـرێتەوە کـە گرنگییەکـەی لـە کـردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا هەوێندەبێت، تایبەتمەندیەکانیش ئەمانەن:

* خانەوادە ئەو یەکە کۆمەڵایەتییە کە منداڵ تیایدا گەشەدەکات و بەرپرسی یەکەمی شیاندنی کۆمەڵایەتیانەی منداڵە.

* خانەوادە بە باشترین نموونە و سەرمەشقی ئەو کۆمەڵە سەرەتاییە دادەنرێت کە منداڵ تیایدا گەشە دەکات و لەگەڵ ئەندامانی بەشێوەیەکی رووبەڕوو کارلێك دەکات و رەفتاریان بە نموونە و سەرمەشق دەزانێت.

- ئەو هۆکارانەی لەخانەوادەدا کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتی فەراهەم دەکەن، ئەمانەن:

☐ پشتبەستنی منداڵ بە کەسانی گەورە بۆ ماوەیەکی زۆر دووردرێژ.

☐ پێویستیی منداڵ بۆ رەزامەندیی گەوران و پەسندکردن و داننانیان بە رازیبوونیان لە منداڵەکە.

**ئەرکی سیستمی خانەوادەیی:**

☐ زۆربوون و وەچەخستنەوە یەکەم ئەرکە کە خانەوادە بۆ بەردەوامیبەخشین بە پتربوونی ئەندامانی خانەوادە ئەنجامی دەدات.

☐ تێرکردنی پاڵنەری سێکسیی بەشێوەیەکی رەوا.

☐ چاودێریکردن و سەرپەرشتیکردنی منداڵان و شیاندنی کۆمەڵایەتیانەیان و فێرکردنی بەها و دابونەریتەکانی کۆمەڵگە.

☐ بەرزەفتکردنی رەفتاری تاکەکان.

☐ تێرکردنی پێداویستییە دەروونییەکانی تاك و بەشداریکردن لە پێکهێنانی کەسێتیی ئاسایی و دروست و فەراهەمکردنی هەستی ئاسایش و دڵارامی و دڵنیایی.

سیستمەکانی خانەوادەییش بەچەند هۆکارێکی مێژوویی و شارستانی و دەروونی کاریگەر دەبن، ئەو چەشنە شیاندنە خانەوادەییانەی منداڵ رووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەمانەی خوارەوەن:

□ شــێوازی توندوتیــژی و داپلۆســین و دەستبەســەرداگرتن: رەتکردنــەوەی حەزەکانی منداڵ و توندوتیژی لە مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵدا.

□ شێوازی پشتگوێخستن: گرنگینەدان بە منداڵ و وەدینەهێنانی پێداویستییە سەرەتاییەکانی و پاڵپشتینەکردن و دەستخۆشی لێنەکردنی لەکاتی سەرکەوتنیدا.

□ شێوازی پاراستنی زیاد لە ئەندازە و دەستوەردانی دایباب لە کاروباری منداڵ و ئەنجامدانی ئەرکەکان لەجیات منداڵ و نەڕەخساندنی دەرفەت بۆ منداڵ بۆ هەڵبژاردنی چالاکییەکانی خۆی.

□ شێوازی راڕاییکردن: واتا گۆڕانی شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ لەنەرمییەوە بۆ توندوتیژی و لە توندوتیژییەوە بۆ نەرمی نواندن و پاڵپشتیکردن و پشتکردن لە منداڵ(سزا و پاداشت)، ئەمەیش وەها لە منداڵ دەکات بکەوێتە سەرلێشێوان و نیگەرانیی بەردەوامەوە.

□ شێوازی هەڵاواردن و جیاوازیکردن: واتا جیاوازیکردن لە مامەڵەکردن لەنێوان منداڵان و نایەکسانی، ئەمەیش دەبێتە هۆی دروستکردنی ئیرەیی لەنێوانیاندا.

□ شێوازی یەکسان: دوور کەوتنەوە لە شێوازەکانی ناپەروەردەیی و پیادەکردنی بنەمایەکانی دەروونڕوستی، ئەمەیش دەبێتە هۆی گونجان و هەماهەنگی.

– بەڵام ئەو شێوازە دەروونی کۆمەڵایەتیانەی کە خانەوادە لە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا دەیانگرێتەبەر ئەمانەی خوارەوەن:

□ کاردانەوە لەهەمبەر رەفتاری منداڵدا، ئەمەیش دەبێتە هۆی گۆڕانکاریکردن لەم رەفتارەدا.

□ پاداشتی (مادی و مەعنەوی) چوونکە خانەوادە هانی منداڵ دەدات رەفتاری ئاسایی بکات ، بەمەیش خانەوادە رەفتارەکە پتەو دەکات.

□ بەشداریکردن لە هەڵوێست و ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی بەمەبەستی ئەوەی منداڵ فێری رەفتاری کۆمەڵایەتی ببێت.

□ ئاراستەکردنی راستەوخۆی رەفتاری منداڵ و ئاشناکردنی بە پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی تایبەت بە رەفتار و رۆڵ و بەها و ئاراستەکان و هتد.

**- بەڵام پەیوەندیی خانەوادەیی و کاریگەرییەکەی بەسەر کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتی، لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا پوخت دەکەینەوە:**

**یەکەم: پەیوەندیی نێوان دایباب:**

□ بەختیاری لە ژیانی هاوسەریدا دەبێتە هۆی پتەوتربوونی خانەوادە، ئەمەیش بە رۆڵی خۆی دەبێتە هۆی گەشەکردنی منداڵ و گەشەکردنێکی دروستی دەروونی.

□ ناکۆکییەکانی نێوان دایباب دەبێتەهۆی دروستکردنی گرژی و ئەم گرژییەش باڵ بەسەر کەشی خانەوادەدا دەکێشێت و دەبێتە هۆی دروستبوونی چەندان شێوازی رەفتاری شڵەژاوانەی منداڵ، وەك: ئیرەیی و خۆپەرستی و ترس و دەمەقاڵێ و نەبوونی هاوسەنگیی هەڵچوونی.

**دووەم: پەیوەندیی نێوان دایبابان و منداڵ: (ئاراستەکانی دایبابی بەرەو منداڵ)**

□ ئەو پەیوەندی و ئاراستانەی لێوانلێون لە خۆشەویستی و پەسندکردن و متمانە، یارمەتیی منداڵ دەدەن بۆئەوەی وەك کەسێك گەشە بکات کە خەڵکانی دیکەی خۆشبوێت و خەڵکانی دیکە پەسندبکات و متمانەیان پێبکات.

□ پەیوەندی و ئاراستە خراپەکان و هەلومەرجە نەگونجاوەکانی وەك پاراستن و بەنازکردنی زیاد لەئەندازە، هەروەها پشتگوێخستن و باشتردانانی کوڕان لەکچان یان

بەپێچەوانەوە یان منداڵی بچووك یان گەورە وهتد کاریگەرییەکی خراپ لەسەر گەشەکردن و دەروونیدروستیی منداڵ دەکات.

### سێیەم: پەیوەندی نێوان خوشکان و برایان

□ پەیوەندیی گونجاو و هەماهەنگی نێوان خوشکان و برایان کە هیچ جۆرە هەڵاواردنێکی تیادا نەبێت و منداڵێك لە یەکێکی دیکە بەباشتر دانەنرێت و پەیوەندییەکە دووربێت لە کێبڕکێ، دەبێتە هۆی گەشەکردنی ساغ و دروستی دەروونی منداڵ.

بەم شێوەیە دەبینین کە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی گەشەکردنی ئاسایی و دروستیی دەروونی و دەروونیدروستی. دەبێ کەشی خانەوادەیی بەم شتانە بناسرێتەوە:

□ تێرکردنی حەزەکانی منداڵ و وەدیهێنانی پێداویستییەکان، بەتایبەت پێداویستیی هەستکردن بە ئاسایش و سەقامگیری و دڵارامی.

□ گەشەپێدانی تواناکان بەهۆی گەمە و ئەزموونی بونیادنەرانەوە.

□ کار بۆ ئەوە بکرێت کە منداڵ بتوانێ کارلێکی کۆمەڵایەتی بکات و رێز لە مافی خەڵکانی دیکە بگرێت و هاوکارییان بکات و بەخشندە بێت.

□ منداڵ فێری هەماهەنگی و گونجانی کەسی و کۆمەڵایەتی بکرێت.

□ پێکهێنانی خولیا و ئاراستەی دروست بە خۆراك و قسەکردن و خەوتن و هتد.

□ پێکهێنانی هزری دروست.

لێرەوە دەبینین کە کاریگەریی خانەوادە بەسەر منداڵەوە لەم لایەنانەی کەسێتیدا بەدیاردەکەون کە لەخوارەوەدا هاتوون:

- ☐ گەشەکردنی جەستەیی منداڵ.
- ☐ ئاسایشی دەروونیی منداڵ.
- ☐ هاوسەنگیی هەڵچوونیی منداڵ.
- ☐ پێگەیشتنی کۆمەڵایەتیانەی منداڵ.

چەندان توێژینەوە سەبارەت بە رۆڵی خانەوادە لە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیو کاریگەرییەکەی لەسەر هەندێ دیاردەی رەفتاریی منداڵدا ئەنجام دراون، ئەمانەی خوارەوەیش سەرجەمی دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکانن:

☐ جیاوازیی چینەکانی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی جیاوازیی شیاندنی کۆمەڵایەتی، یەك کۆمەڵگەی دیاریکراویش چەندان جیاوازیی لە شیاندنی کۆمەڵایەتیانەی نێوان چینەکان و خانەوادە و خانەوادەیەکی دیکەی تیادا هەیە.

☐ ئەو سیستمە خۆراکییەی کە دایك لەهەمبەر منداڵەکەدا لەقۆناغی شیرەخۆریدا پێڕەوی دەکات، کاریگەریی لە جووڵە و بزاڤی منداڵ دەکات، نەڕەخساندنی دەرفەتی پێویستیش بۆ مژین دەبێتە هۆی مژینی پەنجەکان و لەشیرکردنەوەی کتوپڕیش شڵەژانیکی گەورەتر لە لەشیرکردنەوەی پلەپلە دروست دەکات، هەروەها لەشیرکردنەوەی درەنگیش زیان بە کەسێتیی منداڵ دەگەیەنێ، پێڕەوکردنی بەرنامەیەکی وشکی وادەکانی شیرپێدان و توندتیژی لە کردەی لەمەمکردنەوە دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ زۆر پشت بە خەڵکانی دیکە ببەستێت جا لەفێرگە بێت یانیش لە دایەنگە.

☐ شێوازی کۆنترۆڵکردنی کردەی پیساییکردن لە منداڵیدا پەیوەندییەکی پتەوی بە قرچۆکی و پیسکەیی و ڕێککاری و ڕێکوپێکیی کاتی گەورەییدا هەیە.

☐ هەرچەندە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتی پتر بێهیواکار بێت دایباب پتر منداڵ دەبێزێنن، بەمەیش لە دەروونی منداڵدا هەستی دوژمنکاری پتەوتر دەبێت.

## فێرگە

فێرگە دەستگەیەکە کە هەموو لایەك لەسەر دامەزراندنی ڕێککەوتوون بەمەبەستی پاراستن و گواستنەوەی ئەو رۆشنبیرییە لە نەوەیەك بۆ نەوەیەکی دیکە و فەراهەمکردنی دەرفەتی گونجاو بۆئەوەی بەشێوەیەکی جەستەیی و ئەقلانی و هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی گونجاوی ئەوتۆ گەشەبکات کە لەگەڵ چاوەڕوانی و هیواکانی کۆمەڵگە بگونجێت لەهەمبەر ئاستەکان و رادەی توانای تاك بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی.

## بەرپرسیاریەتەکانی قوتابخانەش لە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا ئەمانەی خوارەوەن:

☐ پێشکەشکردنی چاودێریی دەروونی بۆ منداڵ و چارەسەرکردنی گرفتەکانی و گۆڕینی لە منداڵێکی پشتبەستە بەخەڵکانی دیکە بۆ پێگەیشتوویەکی سەربەخۆی پشتبەستوو بەخۆی و گونجاو لەڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە.

☐ فێرکردنی منداڵ بۆ چۆنیەتی وەدیهێنانی ئامانجەکانی بەرێگەیەکی گونجاوی ئەوتۆ کە لەگەڵ پێوەرەکانی کۆمەڵایەتیدا بگونجێت.

☐ رەچاوکردنی تواناکانی لەهەمبەر گشت ئەو شتانەی کە پەیوەندیی بە کردەی پەروەردەیی و فێربوونەوە هەیە.

☐ گرنگیدان بە ئاراستەکردن و رێنمایی دەروونی و پەروەردەیی و پیشەیی.

☐ گرنگیدانی تایبەت بە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتی لە هاوکاریکردنی دەستگە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە بەتایبەت خانەوادە.

☐ رەچاوکردنی گشت ئەو شتانەی دەبنە هۆی دەستبەرکردنی گەشەکردنی دەروونی و کۆمەڵایەتیی دروست.

**- پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێو فێرگە و کاریگەری بەسەر کردەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی، لەم خاڵانەی خوارەوەدا چڕیان دەکەینەوە.**

☐ دەبێ پەیوەندییەکانی نێوان مامۆستا و فێرخواز لەسەر بنەمای دیموکراسی و ئاراستەکردن و رێنماییکردنی دروستەوە بێت، ئەمەیش دەبێتە هۆی پتەویی کۆمەڵە و پەیوەندیی باشی نێوان تاکەکان، واتا گەشەکردنی دروستی پەروەردەیی و دەروونی.

☐ دەبێ پەیوەندیی نێوان فێرخوازان لەسەر بنەمای هاوکاری و تێگەیشتنی دوولایەنە بێت.

☐ دەبێ پەیوەندیی نێوان فێرگە و خانەوادە لەسەر بنەمای پەیوەندیی بەردەوام بێت، ئەنجوومەنەکانی دایبابان و مامۆستایان لە کردەی تەواوکردنی نێوان فێرگە و خانەوادە لە شیاندنی کۆمەڵایەتیدا رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت.

**ئەو شێوازە دەروونی و کۆمەڵایەتیانەی کە فێرگە لە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا دەیگێڕێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا چڕ دەبێتەوە:**

☐ پاڵپشتیکردنی بەها باوەکانی کۆمەڵگە بە رێگەی راستەوخۆ و راشکاوانە لە بەرنامەکانی خوێندندا .

□ ئاراستەکردنی چالاکیی فێرگەیی، بەشێوەیەك ببێتە هۆی فێربوونی شێوازە پەسندەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی.

□ پاداشت و سزا و پیادەکردنی دەسەڵاتی فێرگەیی لە فێرکردنی بەها و ئاراستە و پێوەر و رۆڵەکانی کۆمەڵایەتیدا.

□ کارکردن بۆ دابڕینی وردە وردەی منداڵ لەخانەوادە.

□ پێشکەشکردنی نموونەکانی رەفتاری ئاسایی و باوی کۆمەڵایەتی، ئەو نموونانەش یان وەك وانە پێیاندەگوترێت، یانیش چەند نموونەیەکی کردارین کە مامۆستایان لەرەفتاری رۆژانەیاندا پێشانی منداڵانی دەدەن.

**_ رۆڵی مامۆستا بە تایبەت لەکردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا لەم خاڵانەی خوارەوەدا چڕ دەبێتەوە:**

□ مامۆستا وەك رۆڵێکی کۆمەڵایەتیی، بەردەوام کاریگەریی بەسەر فێرخوازدا هەیە هەروەها وەك کەسێکی نوێکەرەوە و گۆڕاو هەر لەیەکەم رۆژی هاتنی فێرخواز بۆ فێرگە تا رۆژی دەرچوونی لە خوێندنەکانی باڵادا کاریگەریی بێچەندوچۆنی هەیە.

□ مامۆستا وەك نوێنەری دەسەڵات بەهای گشتی پێشکەش دەکات جا ئەگەر لەڕووی رەگەز و فەلسەفە و تەمەنیشەوە لە مامۆستاکانی دیکە جیاواز بێت.

□ مامۆستا وەك جێبەجێکاری سیاسەتی پەروەردەییە لە کۆمەڵگەدا ئەوەی کۆمەڵگە دیاریی دەکات بە دەستپاکی و راستگۆیانە پێشکەشی کۆمەڵگەی دەکات.

□ مامۆستا وەك نموونە و سەرمەشقی رەفتاری زیندووە کە فێرخوازان لاسایی دەکەنەوە و دەچنە نێو کەسێتییەکەیەوە.

□ مامۆستا وەك نوێنەری سیستم و بەهاكانی مەعریفە و خوێندن، لە گشت هەڵوێستەكانی پەروەردەییدا كاریگەری لەسەر فێرخوازدا بەجێدەهێڵێ.

□ مامۆستا وەك سرووشبەخشی رەفتار، رەفتارەكانی فێرخواز چاك دەكاتەوە و زانیاری و درككارییەكانی فێرخواز گەشەپێدەدات.

□ مامۆستا وەك ئاراستەكاری رەفتار، رەفتاری فێرخواز راست دەكاتەوە و بەهۆی دانانی لە ئەزموونەكانی رەفتاریی دروستەوە.

## کۆمەڵەی هاوڕێیان

هاوڕێیەتی لە گەشەكردنی دەروونی و كۆمەلأیەتییانەی منداڵ هۆكارێكی گرنگە، چوونكە كاریگەریی لە بەها و خوونەریت و ئاراستەكان و شێوازی مامەڵەكردن دەكات. منداڵ لەگەڵ كۆمەڵەی هاوڕێیاندا پەیوەندیی لەگەڵ ئەو كەسانەدا بەرقەرار دەكات كە لە رووی تەمەن و حەز و مەیلەكانەوە لێی نزیكن.

### هاوڕێیەتیش چەند ئەركێكی دیاریكراوی هەیە، وەك:

□ منداڵ ئەو كەسانە دەبینێتەوە كە هاوتەمەنی خۆیەتی.

□ پێكهێنانی ئاراستە و خولیا و رۆڵە كۆمەلأیەتییەكان.

□ دەكاتە ئاستێكی گونجاوی باوەڕ بەخۆكردن.

### - شێوە و جۆرە بەكۆمەڵەكانی هاوڕێیەتیش ئەمانەی خوارەوەن:

□ كۆمەڵەی هاوگەمەكان: هەر لەخۆوە بە ئامانجی گەمەكردن و سەرگەرمیی بێكۆتوبەندەوە پێكدێت.

□ کۆمەڵەی گەمە: کۆمەڵەیەك بەشداریی تیادا دەکەن و بنەما و ڕێوڕەسمەکانی گەمەکە دەپارێزن.

□ کۆمەڵەی یەکگرتوو: کۆمەڵەیەکی زۆر پتەو و یەکگرتوون و تاکی وەها کۆدەکاتەوە کە لەرووی پێگە و چینی کۆمەڵایەتییەوە جیاجیان.

□ کۆمەڵەی یانە: لە نێوەندێکی فەرمیدا سەرهەڵدەدات کە کەسانی پێگەیشتوو سەرپەرشتی دەکەن و دەرفەتی چالاکیی جەستەیی و گەشەکردنی ئەقڵی و بەتاڵکردنەوەی هەڵچوونی و فێربوونی کۆمەڵایەتی دەڕەخسێنێ.

□ دەستەو تاقم: (العصبە) کۆمەڵەیەکە و لەبەرانبەر کۆمەڵەکانی دیکەدا بەتایبەتمەندیی کێشمەکێش دەناسرێتەوە و هێما و سیمبوڵی تایبەت بەخۆی هەیە.

**کاریگەریی کۆمەڵە لە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا لەم خالآنەی خوارەوەدا چڕ دەبێتەوە:**

□ یارمەتیدان بۆ گەشەکردنی جەستەیی بەهۆی ڕەخساندنی دەرفەتی ئەنجامدانی چالاکیی وەرزشی و گەشەکردنی ئەقڵی بەهۆی پیادەکردنی ئارزوومەندییەکانەوە و گەشەکردنی کۆمەڵایەتیش بەهۆی دروستکردنی هاوڕێیەتییەکان و گەشەکردنی هەڵچوونی بەهۆی گەشەکردنی پەیوەندییەکانی سۆزی لە هەڵوێستەکاندا کە لەهیچ جۆرە کۆمەڵەیەکی دیکەدا ئەوەی بۆ ناڕەخسێ.

□ پێکهێنان و هەوێنبوونی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی لەهەمبەر هەندێ پێوەری کۆمەڵایەتیی تایبەت بە ڕەفتار.

□ ئەنجامدانی چەند رۆڵێکی کۆمەڵایەتی وەك سەرکردایەتیکردن.

□ یارمەتیدان بۆ وەدیهێنانی گرنگترین داواکارییەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی کە ئەویش سەربەخۆیی و پشتبەخۆبەستنە.

□ رەخساندنی دەرفەت بۆ سوودگەیاندن بە گەورەکان لە کەشێکی لێبوردەدا.

□ رەخساندنی دەرفەتەکانی رەفتار دوور لە سانسۆری کەسانی گەورە.

□ رەخساندنی دەرفەتی لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵایەتی.

□ راستکردنەوەی توندڕۆیی و لادانی رەفتاریی نێوان ئەندامەکانی.

□ تێرکردنی گرنگترین حەزی تاك لەهەمبەر پێگە و پەیوەستبوون (الانتماء).

**– گرنگترین تێبینییەکانی تایبەت بە کۆمەڵەی هاوڕێیان ئەمانەن:**

١- جۆری کۆمەڵەی هاوڕێیان بەندە بە جۆری ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی کە تاك پێوە پەیوەستە.

٢– هاوڕێی خراپ کاریگەری خراپ لە منداڵ و نەوجەواندا دەکات، چوونکە بەهۆیەوە رێژەی تاوان و کەتنی نەوجەوانان لەهەندێ کۆمەڵگەدا دەبینین.

- بەڵام سەبارەت بەو شێواز و رێگە دەروونی کۆمەڵایەتییەی کە کۆمەڵەی هاوڕێیان لە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا دەیگرنەبەر ئەمانەن:

□ پاداشتی کۆمەڵایەتی و قبوڵکردن، کاتێ ئەندامێك لەگەڵ پێوەر و بەهاکانی کۆمەڵە دەگونجێت، ئەمەیش ئەم رەفتارە پتەوتردەکات.

□ سزادانی کۆمەڵایەتی و رەتکردنەوە لە دۆخەکانی سەرپێچیکردنی ئەندام لەهەمبەر بەهاکانی کۆمەڵەکەی، ئەمەیش دەبێتە هۆی وەستاندن و خامۆشکردنی رەفتاری سەرپێچیکارانە.

□ بەشداریکردن لە چالاکیی کۆمەڵایەتی بەتایبەتیش گەمەکردن، ئەمەیش دەرفەتی فێربوونی کۆمەڵایەتی دەڕەخسێنێ(هاوکاری و کێبڕکێ و بنەما و ئەرك و ماف).

□ پێشکەشکردنی چەند نموونەیەکی رەفتاری کە هەندێ ئەندام لەگەڵیدا دەبنە یەك و یەکدەگرن (چالاکییە سەرگەرمکارەکان، شایی، نواندنی شانۆیی و هتد).

## ئامرازەکانی ڕاگەیاندن:

ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بۆ شێواز و جۆرە دیاریکراوەکانی ڕەفتار ڕۆڵێکی گەلێ مەزن لە پێکهێنان و دروستکردنی کەسێتی و گونجانە کۆمەڵایەتییەکەیدا دەگێڕن.

ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لەم لایەنانەی خوارەوەدا دەتوانن کاریگەرییان بەسەر کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا هەبێت:

١– بڵاوکردنەوەی زانیاریی جۆراوجۆری تایبەت بە گشت بوارەکان کە لەگەڵ تەمەنی کەسەکاندا بگونجێت.

٢– ڕەخساندنی کاریگەربوون بە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیی کەلتوورەکانی دیکە بەهۆی ئەو فیلم و هەواڵانەی پێشکەشیان دەکات.

٣– وەدیهێنانی پێداویستیی زانینی زانیاری و هەواڵ.

٤– سەرگەرمکردن رابواردنی کاتێکی زۆر.

- ئەو شێوازانەی کە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە شیاندنی کۆمەڵایەتیدا بەکاریاندەهێنێ، ئەمانەن:

١- دووبارەکردنەوە: بەهۆی دووبارەکردنەوەی چەند پەیوەندی و کەسێتی و هزر و وێنەیەکی دیاریکراوەوە دەبێت وەك چۆن لە چیرۆك و کتێبی وێنەدار و تەلەفزیۆندا دەبینرێت.

٢- سەرنجڕاکێشان: ئەمەیش بە هەمەڕەنگکردنی ئەو شێوازانە دەبێت کە منداڵ بەرەو ئامرازەکانی ڕاگەیاندن رادەکێشێت.

٣- بانگهێشتکردن بۆ بەشداری: ئەمەیش بە بانگهێشتکردنی منداڵان دەبێت بۆ بەشداریکردنی کرداری یان بەشداریکردن بەهۆی نووسین و وێنەکێشان بۆ رادەربڕین و نووسین لەبارەی بابەتێکی دیاریکراو.

٤- نمایشکردنی نموونەکان: رەنگە شتێکی کەسی بێت کە رەفتارێکی دیاریکراوی هەیە، بۆ نموونە: ئەوکەسانەی کە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراویان هەیە.

# دەستگەکانی ئاینی

دەستگەکانی ئاینی ڕۆڵێکی گرنگیان لە شیاندنی کۆمەڵایەتی تاکدا هەیە، لەڕووی:

١- فێرکردنی ئەو ڕێورەسمە ئاینیانەی کە حوکم بەسەر ڕەفتاردا دەکەن و دەبنە هۆی بەختیاریی تاکەکانی کۆمەڵگە.

٢- بەخشینی چوارچێوەیەکی ڕەفتاری بەتاك کە سەرچاوەی لە ڕێوڕەسمەکانی ئاینەکەیەوە گرتووە.

٣- بانگهێشتکردنی خەڵك بۆ پیادەکردنی ڕێوڕەسمەکانی ئاینی و بەکرداریکردنیان.

٤- یەکخستنی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و نزیککردنەوەی لەنێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتی.

٥- چاندنی بەهاکانی ئاینی لەمیانی شوێنەکانی پەرستشدا.

بەڵام ئەو هۆکار و شێوازانەی دەستگەکانی ئاینی بۆ کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتی بەکاریدەهێنن ئەمانەن:

- ترساندن و هاندان ئەمەیش بە داواکاری بۆ ئەنجامدانی ڕەفتاری باو و ئاسایی و دوورکەوتنەوە لە ڕەفتاری لادەرانە دەبێت.
- دووبارەکردنەوە و باوەڕپێهێنان لەهەمبەر بەشداریکردنی بەکۆمەڵ.
- ڕێنماییکردنی کرداری و پیشاندانی نموونە میسالییەکانی ڕەفتاری.

- ★ چەمکەکەی
- ★ ڕێز و بەهای خود
- ★ ئەو بیردۆزانەی باسیان لە خود کردووە
- ★ شێوەکانی چەمکی خود
- ★ تایبەتمەندییەکانی چەمکی خود
- ★ سروشتی کۆمەڵایەتیانەی خود
- ★ کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان لە چەمکی خود

## خود:

خود هەستکردن و هۆشیارییە لەهەمبەر بوون و قەوارەی تاك و بەهۆی كارلێككردن لەگەڵ ژینگەدا شكلگیر دەبێت و هەوڵی گونجان و هەماهەنگی و پایەداری دەدات و بەهۆی پێگەیشتن و فێربوونەوە گەشەدەكات.

## چەمكی خود:

دەتوانین وەها پێناسەی چەمكی خود بكەین بەوەی كە پێكهاتەیەكی زانیاریی رێكوپێك و یەكگرتوو و فێركراوی دركپێكراوەكانی هەستی و وێناندن و گشتاندنە تایبەتەكانی خودە كە تاك پێكیدەهێنێت و بە پێناسەیەكی دەروونیی خودی خۆی دادەنێت.

چەمكی خود بەهۆی هزرە خودییە رێكخراو و رەهەند دیاریكراوەكانی رەگەزە جۆراوجۆرەكانی بوون و قەوارە ناوەكی و دەرەكییەكانی پێكدێت و ئەم رەگەزانە دەگرێتەوە:

☐ ئەو دركپێكراو و وێناندانەی كە دیاریكەری تایبەتمەندییەكانی خودە هەروەها بەشێوەیەكی كرداریش لە وەسفكردنی وەسفی تاك بۆ خود وچۆنیەتی وێناندنی تاك بۆ خودی خۆی رەنگ دەداتەوە(خودی دركپێكار).

☐ ئەو دركپێكراو و وێناندنانەی كە ئەو وێنەیە دیاریی دەكات كە تاك پێیوایە خەڵكانی دیكە خەیاڵی بۆ دەكەن و تاك لەمیانی كارلێكی كۆمەڵایەتی لەگەڵ خەڵكانی دیكەدا نمایشی دەكات (خودی كۆمەڵایەتی).

☐ ئەو درکپێکراو و وێناندنانەی وێنەی میسالیی ئەو کەسە دیاریی دەکات کە دەیەوێ ببێتە " خودێکی میسالی"

ئەرکی چەمکی خود ئەرکێکی پاڵنەری و کامڵبوون و هەوێنبوونی جیهانی ئەزموون و شارەزایی گۆڕاوە کە تاك لەنێویدا بوونی هەیە" رەفتار رێکدەخات و دیاریی دەکات".

کارۆل رۆجەرزی خاوەن بیردۆزی خود پێیوایە کە دەکرێ چەمکی خود لەژێر هەلومەرجەکانی چارەسەری چڕی دەروونیی کەسەکانەوە هەموار بکرێتەوە هەرچەندە چەمکی خود تا ئاستێکی بەرز نەگۆڕ و پایەدارە.

هەروەها پێیوایە کە چەمکی خود کۆی ئەو تایبەتمەندیانەیە کە دەیانخاتە پاڵ خۆی، هەروەها ئەو بەها کۆمەڵایەتییە ئەرێیی و نەرێییانەن کە پەیوەندییان بەو تایبەتمەندیانەوە هەیە.

هەروەها ئەتۆتەر Atwater وەها پێناسەی خود دەکات بەوەی کە وێنەیەکی هەمەکی و ئەو هۆشیاریەیە کە لەبارەی خۆمانەوە هەمانە لەخۆگری بیروباوەڕ و بۆچوونی خۆمان و هەستوسۆزمانە لەهەمبەر خۆمان و ئەو بەهایانەی پەیوەندییان پێیوە هەیە.

بەلآم هماچك Hamachek وەها پێناسەی چەمکی خود دەکات بەوەی کە کۆمەڵێك بیروباوەڕ و بۆچوونی تاکە لەهەمبەر خۆمان و تایبەتمەندییە بێهاوتا و ئەو رەفتارانەمان کە پەیوەندییان بە لایەنە خودییە جەستەیی و کۆمەڵایەتی و هەڵچوونی و ئەقڵییەکانەوە هەیە.

لابین و گرین (Labane & Green) وەها پێناسەی چەمکی خود دەکەن بەوەی کە هەڵسەنگاندنی تاکە وەك هەمەکییەك لەڕووی قیافە و پاشخان و رەچەڵەك و ئامرازو

ئاراستە و خولیا و هەڵچوونەکانیەوە کە ڕۆڵێکی سەرەکیی لە ئاراستەکردنی ڕەفتارەکانی تاکدا دەگێڕن.

هیدنرك وەها پێناسەی خود دەکات کە وێنە و وێناندنی تایبەت بەخودە و ئەوەیە کە چۆن مرۆڤ خۆی دەبینێ و بۆچوونی لەهەمبەر خۆیدا چۆنە و ئەو خودە میسالییەیە کە دەیەوێ پێیبگات.

هەروەها بێرنس پێیوایە کە چەمکی خود درککردنی تاکە بەخۆی، بەتایبەتیش بریتییە لەو ئاراستە و هەستوسۆز و زانیاریانەی هەمبەر توانا و کارامەییەکان و روخسار و قیافە و قبوڵکردنی کۆمەڵایەتییەوە.

# ڕێزو بەهای خود Self -esteem

ڕێزگـرتن و بـەهادانان بـۆ خـود هەڵـسەنگاندنی گـشتیی تاکـە بـۆ خـودی خـۆی لەسـەرتاپای خـۆی و تایبەتمەندییـە ئـەقڵی و کۆمەڵایـەتی و هەڵـچوونی و ئاکـاری و جەسـتەییەکانی، ئـەم هەڵـسەنگاندنەش بەسـەر متمانەبـەخۆبوون و هەسـت و سـۆزی لەهەمبەر خودی خـۆی و هـزری لەهەمبـەر ئاسـتی گرنگییەکـەی و پێشبینییەکانی لـە خودی خـۆی ڕەنگدەداتـەوە، هـەروەها ئـەم مەسـەلەیە ڕەنگدانـەوەی بەسـەر تـەواوی هەڵوێستەکانی ژیانیشیدا دەبێت.

هامشك پێیوایە ڕێزگرتن و بەهادانان بۆ خـود داوەریکردنـی تاکـە لـەبارەی گرنگیـی کەسێتییەکەی خۆی، هەروەها تـاك چـەند ئاراسـتە و خولیایـەك لەهەمبـەر گشت ئـەو بابەتانـە پێکـدەهێنێ کـە مامەڵـەیان لەگەڵـدا دەکـات، خـودیش یەکێکـە لـەو پـرس و بابەتانە.

کۆپـەر سمیـسیش پێیوایـە کـە ڕێزگـرتن و بـەهادانان بـۆ خـود لـەخۆگری ئاراسـتە هەڵـسەنگاندنیەکانی ئـەو خودەیـە کـە بـە سـۆز دەناسـرێتەوە، هـەروەها کاردانـەوە بەرگریکارەکانیش دەگرێتەوە. وەها پێناسەی هەڵسەنگاندنی خودیش دەکـات بـەوەی کە ئەو شـتەیە تـاك لـە هەڵـسەنگاندنی خـۆی لـەڕووی توانـا و گرنگبوونـەوە ئـەنجامی دەدات.

بەڵام دیمۆ پێیوایە کە ڕێزگرتن و بەهادانان بۆ خود ئاماژە بـە بـوونی هەستوسـۆزی ئـەرێیی تـاك و هەسـتکردن بـە سـەرکەوتن و توانـا و قبـوڵکردنی خـود و ئـەو هەسـتە دەکات کە تاك پێیوایە لەلایەن خەڵکەوە پەسند کراوە.

هەروەها گارارد پێیوایە کە رێزگرتن و بەهادانان بۆ خود، ئاماژە بە بۆچوونی تاك دەکات لەهەمبەر خودی خۆیدا، بەو مانایەی کە تاك بۆچوونی لەهەمبەر خۆیدا بۆچوونێکی پڕ لە متمانە بەخۆکردن بێت، هەروەها بریتیە لە هەستکردنی تاك بە کارامەیی و لێهاتوویی و ئامادەیی بۆ وەرگرتن و پێشوازیکردن لە ئەزموون و شارەزایی نوێ.

هەروەها (Chinn) پێیوایە کۆمەڵێك هۆکاری کاریگەر لە پێشخستنی رێز لەخۆگرتن و بەهادانان بۆ خود هەن کە بریتین لە:

- □ وێنەی هزری و ئەندێشەیی تاك لەهەمبەر پێکهاتە جەستەییەکەی.
- □ وێنەی هزری و ئەندێشەیی تاك لەهەمبەر رەگەز (نێر و مێ) و نەژاد و دەرامەتی.
- □ ئەو وێنە میسالییەی کە دەبێ تاك لە رووی دەروونی و جەستەییەوە هەیبێت.

# ئەو بیردۆزانەی باسیان لە مەسەلەی ڕێز و بەهای خود کردووە

چەندان بیردۆز هەوڵیانداوە لێکدانەوە بۆ ڕێز و بەهای خود بکەن، گرنگترینیان:

١ – بیردۆزی رۆزنبێرگ:

رۆزنبێرگ هەوڵیداوە شرۆڤەی گەشەکردن و بالاًنوماکردنی رەفتاری هەڵسەنگاندنی تاك بۆ خود و رەفتاری بکات لەمیانی پێوەرە باوەکانی نێوەندی کۆمەڵایەتیی چواردەوری مرۆڤ (گەشەکردنی رەفتاری هەڵسەنگاندنی تاك بۆ خودی خۆی لەمیانی ئەو نێوەندە کۆمەڵایەتییەی تیایدا دەژیەت). رۆزنبێرگ بەشێوەیەکی تایبەت گرنگیی بە هەڵسەنگاندنی نەوجەوانان داوە بۆ خودی خۆیان، هەروەها گرنگیی بەو رۆڵە داوە کە خانەوادە لە هەڵسەنگاندنی تاك بۆ خودی خۆی دەیگێڕێت، کاریشی بۆ ئەوە کردووە پەیوەندیی نێوان ئەو ڕێزگرتنەی خود بکات کە لە خانەوادەدا پێکدێت، هەروەها کاری بۆ روونکردنەوەی پەیوەندیی نێوان ئەو ڕێز لەخۆگرتنە کردووە کە لەچوارچێوەی خانەوادە و نێوان شێوازەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی دواتری تاکدا روودەدات، رۆزنبێرگ وەهای داناوە کە ڕێزگرتن لە خود رەنگدانەوەی ئاراستەی تاکە لەهەمبەر خودی خۆیدا.

ب- بیردۆزی کۆپەر سمیس:

بەلاًم کارەکانی کۆپەر سمیس خۆیان لە ڕێزگرتنی خودیی ئەو منداڵانەدا بینیوەتەوە کە هێشتا نەچوونەتە قۆناغی فێرگەی ناوەندی. ناوبراو دوو جۆرە ڕێزلەخۆگرتنی لەیەکتری جیا کردووەتەوە، ئەوانیش ڕێزگرتنی راستەقینەی خودە و لەلای ئەو کەسانەدا دەبینرێ کە بەڕاستی هەستدەکەن بەهادارن، هەروەها جۆرە ڕێز

لەخۆگرتنەکەی دیکە بریتییە لە ڕێز لەخۆگرتنی بەرگریکارانە و لەلای ئەو کەسانەدا هەیە کە هەستدەکەن بەهایان نییە، بەڵام ناتوانن دانی پێدا بنێن و لەسەر ئەم بنەمایەوە لەگەڵ خۆیان و خەڵکانی دیکەش ڕەفتار بکەن. سمیس جەختی لەسەر ئەو تایبەتمەندییە زانستیانە کردووەتەوە کە لەمیانیەوە لایەنە جۆراوجۆرەکانی دیاردەی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکی پتەویان بەکردەی ڕێزلەخۆگرتنەوە هەیە. ناوبراو شیمانەی چوار کۆمەڵە گۆڕاوی کردووە کە وەك دیاریکەری ڕێز لەخۆگرتن کار دەکەن، ئەوانیش: سەرکەوتنەکان، بەهاکان، بەرتەمایی و بەرگرییەکانن. سمیش پێیوایە کە هەرچەندە توانای دیاریکردنی جۆرە جیاوازەکانی خانەوادییمان نییە کە خاوەنانی ئەم جۆرە نمرە باڵایە و نمرە نزمەکانی ڕێز لەخۆگرتنی منداڵان لەیەکتری جیادەکەنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێ دۆخی گرنگیدان و سەرپەرشتیکردنی دایبابیی هەن کە پەیوەندییان بە گەشەکردنی ئاستە بەرزەکانی ڕێز لەخۆگرتنەوە هەیە، ئەوانیش:

١- پەسندبوونی منداڵان لەلایەن دایبابانەوە.

٢- پاڵپشتیکردنی ڕەفتاری ئەرێیانەی منداڵ.

٣- ڕێزگرتن لە دەستپێشخەرییەکانی منداڵ و سەربەستیان لە دەربڕینی هزر و بیروبۆچوونەکانیان، لەلایەن دایبابانەوە.

### ج- بیردۆزی زیلەر:

زیلەر لە کۆشەنیگای بیردۆزی بوار لە کەسێتیدا دەنواڕێتە ڕێز لەخۆگرتن و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕێز لەخۆگرتن و هەڵسەنگاندنی خود لە زۆربەی جارەکاندا ڕوونادات تەنها لە چوارچێوەی مەرجعی کۆمەڵایەتیدا نەبێت، ناوبراو وەها پۆلینی ڕێز لەخۆگرتن دەکات بەوەی کە ڕێزگرتنێکە و تاك لەهەمبەر خۆیدا دەینوێنێ و ڕۆڵی

گۆڕانکەری نێوەند (الوسیط) دەبینێ، یانیش ناوچەی نێوەڕاستی نێوان خود و جیهانی واقیعی داگیر دەکات، لەبەرئەوە کاتێ گۆڕانکاری لە ژینگەی کۆمەڵایەتیی تاکدا ڕوودەدات، ئەوا ڕێز لەخۆگرتن ئەو هۆکارەیە جۆری ئەو گۆڕانکارییانە دەستنیشانی دەکەن کە لە هەڵسەنگاندنی تاك بۆ خودی خۆی دێنەکایەوە، لەو باسەی پێشوودا ئەو دەرەنجامە وەدەستدەهێنین کە ئەو بیردۆزانەی باسیان لە چەمکی ڕێز لەخۆگرتن کردووە جەخت لەسەر گرنگیی ڕۆڵی خانەوادە و جۆری گرنگیپێدانی دایباب دەکەنەوە لە گەشەکردن و پێشکەوتنی ئەم چەمکە لەلای تاکەکاندا وەك چەمکێکی گونجێنەر کە تا ئاستێکی زۆر بە ورووژێنەرە ژینگەییەکان و ڕێگەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی کاریگەر دەبێت، لەبەرئەوە زانایانی دەروونناس گرنگییان بە ئەزموون و ڕووداوە زووەکانی سەردەمی منداڵیی زوو داوە (بەتایبەت پێنج ساڵی یەکەم)، چوونکە ڕۆڵێکی گرنگیان لە پێکهێنان و بونیادنانی کەسێتیێ و پێکهێنانی ئەو ڕەفتارەدا هەیە کە بەرەو سەربەخۆیی و متمانە بەخۆکردنی دەبات، بەپێچەوانەشەوە هەستی پشتبەستان بە خەڵکانی دیکە و دەسەتەپاچەیی بۆ کاروباری تایبەتی خۆیان دێتەکایەوە. هەروەها حەزی گۆشەنشینی و پاشەکشەکردن و دوور کەوتنەوە لە کارلێکی کۆمەڵایەتی لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا هەستکردن بە کەموکورتی و بێتوانایی بۆ بڕیاردان لەهەمبەر شتە تایبەتەکانی خۆیان دێتەکایەوە کە لەمەدا پشت بەخەڵکانی دیکە دەبەستن بەتایبەت لە بڕیارە کۆمەڵایەتییەکانیاندا. بە واتایەکی دیکە، ڕێزلەخۆگرتن پاڵنەری تاك بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە پتر دەکات کە پێویستیان بە کارلێکی کۆمەڵایەتیانە هەیە، هەروەها دەتوانێت لە کارلێکی کۆمەڵایەتیدا بە کارامەییەکی بێوێنە بەشداری بکات، دەشتوانێ گفتوگۆ بەرگری لە بیروبۆچوونەکان و ئەو بڕیارانەدا بکات کەوا ئەنجامیان دەدات.

# شێوە و جۆرەکانی چەمکی خود




شـێوەکانی چـەمکی خـود پەیوەندییـەکی بـەهێزیان لـەنێوان یەکتریـدا هەیـە و کاریگەری لەیەکتری دەکەن و بەیەکتری کاریگەر دەبن. دەتـوانین شـێوە و جۆرەکـانی چەمکی خود بەم شێوەیە دەستنیشان بکەین:

١- چەمکی خودی کۆمەڵایەتی: وێنانـدنی تـاک بـۆ هەڵسەنگاندنی خـەڵکانی دیکـە، لەمەیشدا پـشت بـە رەفتـار و قسەکانیان دەبەسـتێت و لـەو درکپێکـراو و وێناندنانـە پێکدێت کە ئەو وێنەیە دیاریی دەکات کە پێیوایە خەڵك وێنا و خەیاڵی بۆ دەکەن.

٢- چـەمکی خـودی ئـەکادیمی: ئاراسـتەگری و هەستوسـۆزەکانی تاکـە بـەرەو شارەزایی پەیداکردن لە چەند بابەتێکی دیاریکراو کە تاکەکە فێری دەبێت.

٣- چـەمکی خـودی درککـار: لـەو درکپێکـراو و وێناندنانـە پێکـدێت کـە تایبەتمەندییـەکانی تـاك پێکـدێنێت، بەشـێوەیەکی کـرداری و پیادەکـاری بەسـەر وەسـفکردنی تـاك بـۆ خـودی خـۆی رەنگدەداتـەوە، بریتیـشە لـە درککردنـی تـاك بـۆ دەروونی خۆی لەسەر شێوە راستەقینەکەی و واقیعیەکەی، نەك ئەو خودەی کە خۆی دەیەوێت.

٤- چەمکی خودی میسالی: بـە خـودی بەرتـەما (طموح) ناودەبرێـت و بریتییـە لـە دۆخێك کەوا تاك حەز دەکات پێیبگات.

٥- چەمکی خودی کاتیی: چەمکێکی ناجێگیر و ناپایەدارە و تاك بۆ ماوەیەکی کـەم دەبێتە خاوەنی، دواتریش نامێنێـت و بـەپێی ئـەو هەڵوێستەی کـەوا تـاك خـۆی تیـادا دەبینێتەوە پەسند دەکرێت.

هەندێکی دیکە پێیانوایە کە خود چوار شێوەی هەیە:

١- خود یان منی کارا: گوزارشت لە واژەی (من) دەکات، من پێموایە، من دەمەوێ.

٢- خـود یـان منـی پێکـراو (منفعلە) بـەکارهێنانی واژەی مـن لـە دۆخـی روودانـی کارێك" پێیانگوتم، هەواڵیان پێدام.

٣- خـودی میـسالی: خـودێکی بـەرزترە لـە واقیـع و بـەها و ویـژدان و پێوەرەکـانی تیادایە.

٤- خـودی هەڵوێـستی: مـن لـە هەڵوێـستی دیـاریکراو بـە رەگـەزەکانی مـادی و کۆمەڵایەتی.

جۆرج مید خودی دابەشکردووەتە سەر ئەو خودە کۆمەڵایەتییەی کە تاك بەهۆی پەیوەندیکردنی بە خەڵکانی دیکە و کۆمەڵگەوە وەدەستیدەهێنێت، داهێنانەکەشی ناوەڕۆکی تاکانەی خود دەگرێتەوە.

بەڵام لاند هۆڵم خودی خودبیوونی جیاکردووەتە و بەڕای ئەو لەگەڵ خودی بابەتی بەپێی چەندان هۆکاری جۆراوجۆرەوە پێکدێت کە لەچەند هێمایەك پێکدێت وخەڵکان لە میانیەوە وەسفی کەسەکە دەکەن.

١- خودی جەستەیی: جەستە و چالاکییەکانی بایۆلۆژیی جەستە دەگرێتەوە.

٢- خود وەك کردە: هزر و هەستوسۆز و رەفتارەکانی دەگرێتەوە.

٣-خودی کۆمەڵایەتی: لە هزر و ئەو شتە رەفتاریانە پێکدێت کە تاك وەك کاردانەوە و وەڵامدانەوە لە هەمبەر خەڵکانی دیکەی نێو کۆمەڵگەدا پیشانیان دەدات.

٤- چەمکی خود: ئەو وێنەیەیە کە تاك لەهەمبەر خودی خۆیدا هەیەتی.

٥- خودی میسالی: ئەو خودەیە کە تاك حەزدەکات پێی بگات.

# تایبەتمەندییەکانی چەمکی خود




★ چەمکی خودی رێکخەر Organized: ئەزموون و شارەزاییە جۆراوجۆرەکانی تاك ئەو زانیارییانە وەردەگرێت کە درککردنی خودی خۆی لەسەری وەستاوە، بۆیە سەرلەنوێ دایدەرێژێتەوە و بەشێوەیەکی دیکە عەنباری دەکاتەوە و پێیدەگوترێت پۆلینکارییەکان، ئەمەیش بریتییە لە شێوازی رێکخستنی شارەزایی و ئەزموونەکان و مانا پێبەخشینی.

★ چەمکی خودی فرە لایەن: Multifaceteard بەو مانایەیە کە چەند لایەنێکی تایبەتی هەمەجۆری هەیە و ئەو سیستمە پۆلینکردنە دەنوێنێ کە تاك دەیگرێتەبەر.

★ چەمکی خودی قووچەکی: Hieracnical ؛ دەکرێ چەمکی خود لەشێوەی قووچەکێك بکێشرێت کە بنکەکەی شارەزایی و تاقیکردنەوەکانی تاکە و ترۆپکەکەیشی چەمکی خودی گشتی بێت، ترۆپکی قووچەکەیش دابەش دەبێتە سەر دوو پێکهاتە،

ئەوانیش: چەمکی خودی ئەکادیمی و چەمکی خودی نا ئەکادیمیە، ئەکادیمیەکەش بەپێی مادە فێرکارییە جۆراوجۆرەکان دابەش دەبێتە سەر چەند بوارێك، نا ئەکادیمیەکەیش دابەش دەبێتە سەر چەند چەمکێکی کۆمەڵایەتی و جەستەییانەی خود.

* چەمکی خودی پایەدار و جێگیر: Stable ؛ چەمکی خود بە پایەدارییەکی رێژەیی وەسفدەکرێت، جا هەرچەندە بەرەو بنکەکە چوو پایەدارییەکەی پتر دەبێت.

* چەمکی خودی گەشەیی: Developmental: هەرچەندە منداڵ پتر گەشەبکات تاقیکردنەوە و ئەزموون و شارەزاییەکانی پتردەبن و دەتوانێ کاملبوونی نێوان بەشە لقییەکانی ئەو شارەزاییانە بدۆزێتەوە کە پێیاندا گوزەردەکات بۆئەوەی یەك چوارچێوەی چەمکیانە پێکبهێنێت.

* چەمکی خودی هەڵسەنگاندنی Evaluative: تاك لە هەڵوێستەکانی جۆراوجۆردا چەند هەڵسەنگاندنێك بۆ خودی خۆی ئەنجام دەدات.

* چەمکی خودی جیاوازیکار: Differntial: چەمکی خود بەوە لە چەمکەکانی دیکە جیادەکرێتەوە کە پەیوەندییەکی تێوریانەی پێیەوە هەیە، بۆنموونە: چەمکی خود بۆ توانای ئەقڵی پتر پەیوەندیی بە خوێندنی ئەکادیمیەوە هەیە لەوەی پەیوەندیی بە هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتی و مادییەوە هەبێت.

# سروشتی کۆمەڵایەتیانەی خود

ڕەهەندەکانی خود دەرەنجامی کارلێکەکانی کۆمەڵایەتییە، چوونکە:

* بیردۆزەکانی گەشەکردنی خود جەخت لەسەر درککردنی تاك دەکاتەوە بۆ چۆنیەتیی گۆشەنیگای تاکەکانی دیکە لەهەمبەر خۆیدا (خودی پێچەوانەکەرەوە).

* جەختکردنەوەی گرنگیدانەکە بەو کردە و شێوازەی کە بەراوردی بیروبۆچوونی خۆی لەهەمبەر خۆی دەکات بەو شێواز و چەشنە کۆمەڵایەتییەی کە هەیە لەگەڵ ئەو پێشبینییەی کە پێیوایە لەلای خەڵکانی دیکەوە پێکهاتووە.

بەپێی راوبۆچوونی کولی، درکمان بە چۆنیەتیی روانین و بیروبۆچوونی خەڵککرد لەهەمبەر ئێمەدا کە پێیدەگوترێت خودی پێچەوانەکەرەوە، هەروەها بەکارهێنانی زاراوەی (شوناسی گشتیی خودی) لەلایەن میلەرەوە بۆ گوزارشتکردنە لە درککردنی تاك بۆ دیمەنەکەی خۆی لەهەمبەر کۆمەڵەیەکی تایبەت، میلەر دەڵێت: تاك ئەم خودە و ئەو خودەی دەبێت بەپێی ئەو رێژە و ئاستەی کە بوونی کۆمەڵەکانی پێوە بەندە و پێیوایە کە خۆی بەو وێنە تایبەتمەندە دەبینێ لە بۆچوونی ئەودا، بۆیە تاك (خودێکی ناوەکی) پێکدەهێنێت کە وەك ناوکێکە و قووڵتر و بەهێزترین خودە، ئەم ناوك و تۆیەش لە دەرەوەی چوارچێوەی کردە فێرکارییەکانی کۆمەڵایەتیدا گەشە دەکات بەتایبەتیش فێربوونی رۆڵ و یەکبوون و چوونە نێو دەور.

کردەی چوونە نێو دەور لە تێگەیشتنی گەشەکردنی خود و لەکاتی شیکردنەوەشدا گرنگییەکی زۆری هەیە و ئەو هۆیانە روونەکاتەوە کە بۆچی کەسێکی دیکە وەك سەرمەشق و نموونەیەکی باڵا هەڵدەبژێردرێت و لەگەڵ هەڵبژاردنەکەیشیدا تاك رەفتاری کەسەکە فێردەبێت و لاسایی گشت شتێکی دەکاتەوە.

# کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان لە چەمکی خود:

**وێنەی جەستە:** وێنەی جەستە کاریگەریی لە چەمکی خودی منداڵ دەکات چوونکە بە تایبەتمەندییە بابەتییەکانی وەك قەبارە و خێرایی جوولە و هەماهەنگیی ماسوولکەیی کاریگەر دەبێت، جا ئەگەر ئەم تایبەتمەندییانە پشت بەچەند پێوەرێکی کۆمەڵایەتیی وەك بۆچوونی خەڵك لەهەمبەر کەسەکە و هەڵسەنگاندنی بەردەوامی نێوان باش و خراپ ببەستێ، ئەوا دەبێتە چەند تایبەتمەندییەکی کۆمەڵایەتی.

**پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی:** توێژینەوەکان گرنگیی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتیان لەهەمبەر چەمکی خود روونکردووەتەوە، ئەوەش روونبووەتەوە کە لەلای پیاوان جەستە و قەبارەی گەورە دەبێتە هۆی رازیبوون لەخود، لەلای ئافرەتانیش بەپێچەوانەیە، رەزامەندیی تاکیش لەهەمبەر خودی خۆیدا پشت بە چۆنیەتیی ئەو پێوانکارییانە دەبەستێت کە لەهەمبەر دیاردە دۆزراوەکاندا ئەنجامی دەدات.

**رۆڵی کۆمەڵایەتی:** رۆڵی کۆمەڵایەتی کاریگەرییەکی زۆر لە چەمکی خود دەکات، چوونکە وێنەی خود بەهۆی کارلێکەکانی کۆمەڵایەتییەوە گەشە دەکات، ئەمەیش لەو کاتەدا دەبێت کە تاك دەخرێتە نێو کۆمەڵێك رۆڵی کۆمەڵایەتییەوە، لێرەوە فێردەبێت کە چۆن هاورێیەکانی لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکاندا دەیبینن، ئەویش وەها خۆی ببینێت و فێری پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و ئەو پێشبینییە رەفتاریانە دەبێت کە خەڵکانی دیکە بە رۆڵەکەی دەبەستنەوە.

**کارلێکی کۆمەڵایەتی:** توێژینەوەکان ئاماژەیان بەوە داوە کە کارلێکی ساغ و دروست و پەیوەندیی سەرکەوتووانەی کۆمەڵایەتی، بیرۆکەی ساغ و دروست و ئەرێیی و

باش لەهەمبەر خود پێکدەهێنێت، چەمکی ئەرێیانەی خودیش سەرکەوتنی کارلێکی کۆمەڵایەتی پتەو دەکات و سەرکەوتنی پتر بە پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی دەبەخشێت، ئەم سەرکەوتنەش دەبێتە هۆی پتر بوونی ئەگەری سەرکەوتنی کارلێکی کۆمەڵایەتی.

**تایبەتمەندی و خەسلەتەکانی خانەوادەیی:** ئەو منداڵەی لە خانەوادەیەکدا بژیەت کە گرنگیی پێبدرێت و رەچاوبکرێت، توانا و گرنگیدان و کارامەییەکانی لەو منداڵانە پتر دەبێت، کە لە خانەوادەکانیاندا شێوازە هەڵەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتیان لێ دەگیرێتە بەر، رەنگە ئەو خانەوادانەی شێوازی هەڵەی شیاندن دەگرنە بەر وەها لە منداڵ بکەن درك بەوە بکات کەسێکی دەبەنگ و شەرفرۆش و جێی متمانە نییە.

**بەراوردکاری:** بەراوردکاری رۆڵێکی وەهای هەیە کەوا کاریگەریی لەسەر چەمکی خودی تاك دەکات ئەگەر هاتوو خۆی بە کۆمەڵێك کەس بەراورد کرد کە لەو کەمتواناتر بوون ئەوا بەهاکەی پتر دەبێت، ئەگەر خۆیشی بە کەسانێك لەخۆی بەرزتر بەراوردکرد ئەوا بەهاکەی دادەبەزێت و لەوانەیە تاکەکە بەشێوەیەکی ناراستەقینە هەست بە کەمتوانایی و هەژاری بکات ئەگەر پەیوەندیی لەگەڵ کۆمەڵێك کەس بەرقەرارکرد کە ئاستە ئابوورییەکەیان لە ئاستی خانەوادەکەی بەرزتر بوو.

**دەتوانین هەندێ پیادەکاری پەروەردەیی لەو توێژنەوانە دەربهێنین کە پەیوەندییان بە چەمکی خودەوە هەیە:**

- لەسەر مامۆستا و بەخێوکار و دایباب و کەسانی بواری راگەیاندن پێویستە رۆڵی خۆیان لە گەشەکردنی چەمکی خودی منداڵ و نەوجەوانان هەڵسەنگێنن، یانیش هەوڵی ئەوە بدەن کە تاك فێری ئەوە بکەن رێز لەخۆی بگرێت و خۆی بە کەسێکی پەسند

بزانێت و متمانەی بەخۆی هەبێت و چەمکی خودی ئەرێیی لەلای منداڵ گەشەپێبدەن، ئەمەیش بەوە دەکرێت کە شارەزایی و زانیاریی گونجاویان پێببەخشن و کەشێکی لەباری دەروونیان بۆ فەراهەم بکەن.

- دەرەنجامەکان ئاماژە بە گرنگیی خود و گرنگیی رێنماییکردن و ئاراستەکردن و چارەسەری دەروونی دەکەن، ئەمەیش دەبێ سەرەتا لەخانەوادەکان و دواتریش لە ژینگەیەکی فراوانتری کۆمەڵگەدا دەستی پێبکرێت.

- دەرەنجامی توێژینەوەکان پاڵپشتی ئەو بیرۆکەیە دەکەن کە پێیوایە پەسندکردن و تێگەیشتنی خود بە رەهەندێکی سەرەکیی گونجان و هەماهەنگیی کۆمەڵایەتی دادەندرێت.

- دەرەنجامەکان ئەوەیان روونکردووتەوە کە پەسندکردنی خود پەیوەندییەکی ئەرێیانەی بە پەسندکردنی خەڵکانی دیکەوە هەیە.

- توێژینەوەکان لەمیانی دەرەنجامەکانەوە جەخت لەسەر ئەو باوەڕە باوە دەکەنەوە کە پێکهاتن و شکڵگیربوونی چەمکی خود بەئاستێکی زۆر بە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی وەك ئاراستەکانی تاك لەهەمبەر خەڵکانی دیکە و ئاراستەکانی خەڵکانی دیکە لەهەمبەر تاك کاریگەر دەبێت.

★ چەمکەکەی

★ تایبەتمەندییەکانی

★ جۆرەکانی

★ دینامیکییەکانی کۆمەڵە

★ پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی

★ پتەوی و توندوتۆڵی و یەکگرتوویی کۆمەڵە

★ کارلێکی کۆمەڵایەتی

★ کردەی بەکێشبوون لەنێوان کەسەکاندا

★ گونجان و وێکچوون

# چەمکی کۆمەڵە

کۆمەڵە یەکەیەکی کۆمەڵایەتییە و لە ژمارەیەك کەس پێکدێت کە هەر یەکێکیان ڕۆڵێکی لەسەر شانە و ئەنجامی دەدات و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا ڕێکدەخات، هەرهەموو ئەندامانیش لە ڕێکخستنێکی دیاریکراوی پێوەرێکدا بەشدارن کە ڕەفتاری هەر هەموویان ڕێکدەخات.

کۆمەڵە ژمارەیەك کەسن کەوا کارلێك لەگەڵ یەکتری دەکەن، درککردنی تاکەکانیش دیاریی دەکات بۆ سروشتی ئەو ڕۆڵانەی ئەنجامی دەدەن و ئەو کارلێکەی لەنێوانیاندا دێتەدی .

# تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵە

کۆمەڵە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە، لەوانە:

□ بوونی حەز و بەها و پاڵنەری هاوبەش و پەسندکراو دەبێتە هۆی کارلێکی نێوان تاکەکان.

□ بوونی شێوازی کارلێکی پایەدار و سیستماتیك لەهەمبەر ئەندامانی کۆمەڵەدا دەرەنجامی خۆی دەبێت.

□ بونیادنانی بونیادی کۆمەڵە کە پایەکانی ڕۆڵەکان و بەرزبوونەوەی پێگەکانە.

□ ڕێکخستنی پێوەر یان ئەو بەهایانەی کە پەیوەندی و کارلێکەکان ڕێکدەخات.

□ بوونی ئامانجێك یان چەندان ئامانجی هاوبەش کە هەندێ پێداویستیی ئەندامانی کۆمەڵەکە دەهێنێتەدی.

□ بوونی ڕێگە و هۆکاری پەیوەندیی بەتایبەتیش زمانی قسەکردن و نووسراو.

# هەندێ تایبەتمەندیی کۆمەڵە

چەندان کۆمەڵە هەن کە تاک پەیوەستیان دەبێت، وەك خانەوادە و کار و یانە و هاوڕێیان و کەسانی نزیك، ئەم کۆمەڵانە لەهەندێك تایبەتمەندییدا هاوبەشن، وەك:

١- مێژووی هاوبەش

ڕەنگە کۆمەڵە مێژوویەکی هاوبەشی هەبێت ڕەنگە نەشیبێت، ئەمەیش کاریگەریی بەسەر ڕەفتارەکەیدا دەبێت، بۆنموونە لە دۆخی کۆمەڵە نوێیەکاندا دەبینین کە ئەندامانی هەوڵێکی زۆر لەپێناو ناسین و بەیەکتری ئاشنابوون و درککردن بەو ئامانجەی کۆمەڵە دەدەن و ئەو ئامرازانە دەخەنە بەردەست کە وایان لێدەکات زۆر بە کارامەییەوە لەگەڵ یەکتریدا کار بکەن. بەڵام سەبارەت بەو کۆمەڵەیەی کە ماوەیەك بەسەر دروستبوون و پێکهاتنیدا دروستبووە، پێویستی بەوە نییە کە ئەوە روونبکاتەوە چی لە ئەندامەکانی دەوێت و ئەو پێداویستییە بێچەندو چوونانە چین کە دەبێ دەستبەر بکرێن و چۆنیەتی ئەمەیش ناخرێتە بەرباس، بەڵام ڕەنگە لەو جۆرە کۆمەڵەیەدا هەندێ خووخدە سەرهەڵبدات کە دەبێتە تەگەرە لەبەردەم کارامەییەکەی، وەك بێزبازیی زیاد لەئەندازە و نەرێیبوون و کات بەفیڕۆدان. زۆربەی جار ئەندامانی کۆمەڵەکە لەو بەیەکگەیشتنانە ئامادە دەبن و هەندێ پێشبینیشیان هەیە، ڕەنگە ئاگاداری و شارەزایی تەواویان لەهەمبەر ڕووداوەکاندا هەبێت، یانیش ڕەنگە چەند بیرۆکەیەکی ناتەواو و پەرێشانیان لەبارەوە هەبێت و حەزیان بۆ کۆبوونەوە زۆر زۆر بێت و ڕەنگە وەهایش نەبێت، ئەم پرسیارانەی خوارەوە یارمەتیدەری تێگەیشتنی پاشخانی مێژوویی کۆمەڵە دەبێت:

١. تا چ ئاستێك ئەندامان بۆ چوونە نێو کۆمەڵەکە ئامادە کراون؟

٢. پێشبینی و چاوەڕوانی و ڕۆڵی ئەندامان لە کۆمەڵەکەدا چییە؟

٣. پێکهاتەی کۆمەڵەکە چییە- جۆری ئەندامانی- شارەزایی و ئەزموونەکانی رابردوویان- شێواز و مۆرکی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هاوڕێیانیان.- چۆن هەڵبژێردراون؟

٤. رێکارەکانی ئامادەکردنی کۆبوونەوە و بەیەکگەیشتنەکانی وەك شوێنەکانی دانیشتن و ئامرازەکان و هتد چین؟.

٢. شێوازی بەشداریکردن

لە گشت ساتێکی دیاریکراودا هەر کۆمەڵەیەك شێوازێکی تایبەتی بەشداریکردنی هەیە، بۆنموونە: رەنگە بەشداریکردن بەیەك ئاراستە بێت کاتێ سەرکردە قسە بۆ ئەندامان دەکات، هەروەك لە وانەکاندا دەبیندرێت، هەروەها هەندێ جار بەشداریکردنەکە دوو ئاراستەییە و سەرکردە قسە بۆ ئەندامان دەکات و ئەوانیش وەڵامی دەدەنەوە و بەشداری دەکەن، یانیش بەشداریکردنەکە فرە رەهەندی دەبێت.

زۆرێك لە توێژینەوەکان ئەوەیان روونکردووەتەوە کە هەرچەندە بەشداریی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەکە پتربێت، ئەوا گرنگیدان بە کۆمەڵە و تێکەڵ بوون و توانەوە لەنێویدا پتر دەبێت.

٣. پێوەرەکان

گشت کۆمەڵەیەك لەهەمبەر ئەو بابەتانەی کە دەکرێ گفتوگۆیان لەسەر بکرێت هەروەها ئەوانەیش کە قەدەغەکراوەکان، بەرەو پێکهێنان و دروستکردنی کۆمەڵێك رێکاری ئاکاری و پێوەری گونجاوی رەفتاری پەسەند دەچێت، هەروەها کۆمەڵەکان حەز بەوەدەکەن لەڕووی جارەکان و کاتەوە بەشێوەیەکی راشکاوانە پێوەرێك بۆ گوزارشتەکان و ئاستی گونجاوی بەشدارییە خۆبەخشییەکان و ئاستی رێگە پێدراوی

قسەکان هەبن. هەروەها پێوەر بۆ ئەوەیش دادەنێن کە ئاخۆ قسەبڕینەکان ڕێگەیان پێدراوە یان نا، ئەمانە و چەندان بنەما و پێوەری دیکە سەبارەت بە ڕێگەپێدراو و قەدەغەکراوەکان دەچنە نێو ناخی کۆمەڵە. ڕەنگە ئەندامی نوێ بەزەحمەت بتوانێ درکیان پێبکات و لەگەڵیاندا بگونجێت بەتایبەت ئەگەر ئەو پێوەرانە لەگەڵ ئەو پێوەرو بنەمایانە نەگونجێن کە لە کۆمەڵەی دیکە لەسەری ڕاهاتووە یانیش شتێکی نادیار و نەزانراو بووە بەرلەوەی بێتە نێو کۆمەڵەکەوە، هەندێ کات ئەم پێوەرانە بۆ ئەندامانی کۆمەڵەکە ڕوون نین و ڕەنگە دژ بەیەکیش بن، ئەمەیش دەبێتە هۆی دروستکردنی ئیفلیجی و گرژی و چەقبەستنێکی گەورە.

**پرسیاریش لەبارەی پێوەرەکانەوە ئەمانە دەگرێتەوە:**

١- ئەو بەڵگانە چین کە ئەوە ڕووندەکەنەوە کە کۆمەڵە دەستووری تایبەت بە بەهای وەك ڕێککاریی و بەرزەفتی خودی و هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی و قبوڵکردنی ڕای جیاواز و سەربەستیی ڕادەربڕین و هتد هەیە؟

٢- ئایا لادانی کەسێك یان پتر لە ئەندامێك هەیە لەو پێوەرانە.

٣- ئایا ئەندامان لەم پێوەرانە تێدەگەن، یان هەندێ ناڕوونی هەیە، ئەگەر هەیە کاریگەرییەکەی چییە؟.

٤- کام لەم پێوەرانە یارمەتیدەری سەرکەوتنی کۆمەڵەکەن و کامیشیان سەرکەوتنەکە پەکدەخەن.

### ٤- شێوازی سۆسیۆمەتری

لەگشت کۆمەڵەکاندا ئەندامان حەز دەکەن ئەو کەسانە دیاریی بکەن کە لەخەڵکانی دیکە پتریان خۆشدەوێن و ئەوانەش بەهەمان شێوە دیاریی بکەن کەوا خۆشیان ناوێن.

ئەم پەیوەندییە وردەی خۆشویستن و خۆشنەویستن کاریگەرییەکی گشتییان لەسەر بزاڤەکانی کۆمەڵەدا هەیە. هەندێ لێکۆڵینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە خەڵك حەز دەکەن لەگەڵ ئەو کەسانە رێکبکەون کە خۆشیاندەوێن و دژی ئەو کەسانەش بن کە رقیان لێیان دەبێتەوە، جا ئەگەر گوزارشتیان لەهەمان رێککەوتنکرد لەگەڵ ئەو کەسانەی خۆشیان دەوێن و گوزارشتیش لەو دژاریەتییە بکەن لە هەمبەر ئەو کەسانەی رقیان لێیان دەبێتەوە.

ئەم پرسیارانەی خوارەوە یارمەتیدەری تێگەیشتن و دۆزینەوەی شێوازی سۆسیۆمەترین:

١- ئەو ئەندامانە کێن کە حەز بە تێکەڵبوون پاڵپشتیکردنی یەکتری دەکەن.

٢- ئەو کەسانە کێن کە بەردەوام لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا لە کێشمەکێشدان؟

٣- ئایا هەندێ ئەندام وەك نوێنەری کاردانەوەی یەکسەریی کار دەکەن لەهەمبەر خەڵکانی دیکەدا جا ئەگەر لایەنگریان بن یان دژیشیان بن؟

## ٥- بونیاد و رێکخستن

کۆمەڵەکان پێکهاتەیەکی سیستماتیك و بینراو و نەبینراویان هەیە، پێکهاتەی بینراو پتر فەرمیانەیە وەك دیاریکردنی ئەندامانی لیژنەکان و پۆستەکان و دۆخی ئامادەبووان، یانیش نا فەرمەییە. بەڵام پێکهاتە نەبینراوەکە لەپشت پەردەکانەوەیە و ئەندامەکان بەپێی پێگە و کاریگەری و هێز و دێرینی و چەند توانایەکی هاوشێوە رێکدەخات.

**پرسیارەکانی تایبەت بە بونیاد بریتین لە:**

١- ئەو ڕێکخستنە چییە کە کۆمەڵە بەشێوەیەکی هۆشیارانە دیاریییان دەکات، وەك: پۆستەکانی سەرکردایەتی و گروپەکانی کار و لیژنەکان؟

٢- ئەو ڕێکخستنە نەبینراوە چییە کە حوکم لەسەر وەدیهێنانی نۆخەکە دەکات و کار لە وەدەستهاتووەکان (انجاز) ی کۆمەڵەکە دەکات، کێ ملکەچی کێ دەبێت؟

**٦- ڕێکارەکان**

گشت کۆمەڵەیەك پێویستی بەوە هەیە چەند ڕێکارێك بۆ جێبەجێکردن و وەدیهێنانی ئامانجەکان بگرێتە بەر، ڕەنگە ڕێکار و ڕێوشوێنە دیاریکراو و توندوتیژەکان بەکاربهێنێت هەروەك لە چاوپێکەوتنە فەرمییەکاندا دەبیندرێ، یانیش ڕەنگە کەمتر توندوتیژ بێت هەروەك لە کۆمەڵە نافەرمییەکاندا دەبیندرێت. جۆری ڕێکارەکانیش ڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر گشت لایەنەکانی دینامیکیەتی کۆمەڵەدا دەبێت، وەك وابەستەیی و کەش و بەشداریکردن و هتد. دەبێ کەمە نەرمی و دامێنانێك هەبێت بۆئەوەی زەمینە بۆ کۆمەڵە خۆشبکات و ئەو ڕێکارانە هەڵبژێرێت کە لەگەڵ پێداویستییەکانی هەڵوێستە جۆراوجۆرەکان بگونجێت.

**ئەو پرسیارانەی خوارەوە بۆ پشکنین و هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی ڕێکارەکان یارمەتیدەرن:**

١- کۆمەڵە چۆن ئامانج و خشتە و نەخشەی کارەکانی دیاریی دەکات؟.

٢- کۆمەڵە چۆن دەگاتە بڕیاری دروست؟ بەکۆدەنگییە یان بەهەڵبژاردن یانیش بە ڕەزامەندیی بێدەنگ؟.

٣- کۆمەڵە چۆن توانای ئەندامەکانی دەدۆزێتەوە و سوودیان لێوەردەگرێت؟.

٤- کۆمەڵە چۆن کار بۆ گونجانی ئەندامەکانی و کۆمەڵە ژێرەوییەکان و بزاڤەکانی دەکات؟.

## ٧- ئامانجەکان

گشت کۆمەڵەیەك ئامانجی هەیە جا ئەگەر ئامانجی درێژخایەن بن وەك گەشەپێدانی ژینگە، یانیش کورتمەودا بن وەك کارکردن بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی مەیدانیی تایبەت بە گرفتێکی دیاریکراوی کاتیی ژینگەیی وەك دیاریکردنی قسەکەری دانیشتن و کۆبوونەوەیەك، لەهەندێ دۆخیشدا ئامانجەکان روون و دیاریکراو و راگەیەندراو دەبن، بەڵام لە هەندێ دۆخی دیکەدا شێواو و ناڕوون و گشتین.

# گرنگیی کۆمەڵە

**یەکەم: سەبارەت بە تاك:**

* هاورێیەتی جۆراوجۆری نوێ لەمیانی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا دروستدەبێت.

* تاك پێوەری کۆمەڵایەتیانەی رەفتار وەردەگرێت و راوبۆچوونە کەسییەکانی پێکدێن.

* تاك لەرێگەی کۆمەڵەوە رەفتاری گونجاو کۆمەڵایەتیانە فێردەبێت.

* تاك خۆشی و رەزامەندی خۆی لە کارکردن لەگەڵ کۆمەڵەدا وەردەگرێت.

* تاك شتێکی زۆر سەبارەت بە خۆی و هاوکارانی فێردەبێت.

* کارامەییەکان لە نۆژەنکردنەوەی کۆمەڵە و لەمیانی پەیوەندیی مرۆییەوە بەپلەیەکی بەرزتر گەشەدەکەن.

* بیرکردنەوە و گوزارشتکردن لەخود و توانای چارەسەرکردنی گرفتەکان گەشە دەکات.

* تاك بەهۆی بەشداریکردن لە کۆمەڵەوە هەست بە وەدیهێنانی پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆی دەکات.

**دووەم: سەبارەت بە کۆمەڵگە**

* بەشداریکردن لە گەشەپێدان و پێشخستن و چاکترکردنی کۆمەڵگە.

* وەدیهێنانی شادومانی مرۆڤ بەهۆی کارلێکی کۆمەڵایەتییەوە.

* ئەنجامدانی گشت رەهەندەکانی چالاکیی ئابووری.

* دامەزراندنی دەستگەکانی کۆمەڵایەتی لەئەنجامی هەوڵوکۆششی کۆمەڵەکانەوە.

# جۆرەکانی کۆمەڵەکان

## کۆمەڵەکان چەندان پۆلینیان هەیە، گرنگترینیان*

| بنەمای پۆلینکردن | جۆرەکانی کۆمەڵە | نموونە |
|---|---|---|
| کارلێککردن(بوون ونەبوونی کارلێکی رووبەڕوو پەیوەندییە راستەوخۆیەکانی کەسی). | * سەرەتایی<br>* ناوەندی | خانەوادەکان،هاوڕێیانی گوند، هاوسێیەتی، تیم.<br>کاری چڕ، پارێزگە، گەل، پارتی سیاسی. |
| سیستم(بوون و نەبوونی سەرۆکایەتی و دەستوور و یاساکان. | * فەرمی<br>* نافەرمی<br>*مامناوەندی | ئەنجوومەنی زانکۆ<br>هاوڕێیان<br>خانەوادە |
| تاقیکردنەوە | *ناچاری(جبری)<br>*ئارەزوومەندانە.<br>*سەپێندراو | رەگەزی مرۆیی، نەژاد، خانەوادە، ئاین.<br>چالاکیی لە کۆلێژەکان.<br>بەهەڵبژاردنی(ئەنجوومەن) دەستە. |
| گونجان و وێکچوون | * گونجان و وێکچوون<br>* نەگونجاو و جیاواز | کۆمەڵەی فێرخوازان مادەیەکی تایبەتمەند دەخوێنن.<br>فێرخوازانی نوێ پێش دابەشکردنیان. |
| ئەگەری چوونە نێو | * داخراو<br>* دیاریکراو<br>* کراوە | خانەوادە<br>سەندیکا.<br>یانە و ئارەزوومەندەکان. |
| بەردەوامی | * کتوپڕ<br>* کاتی<br>*ماوەیەکی دیاریکراو بەردەوام دەبێت.<br>*بەردەوامیی رێژەیی | لەدەوری رووداوەکە کۆدەبێتەوە.<br>گەشتکەرانی نێو ئۆتومبێل و شەمەندەفەر.<br>سەربازی،لیژنە.<br>گەل. |
| سروشت | * سروشت<br>* دروستکراو | خانەوادە، گوند.<br>سەربازگە. |

| | | |
|---|---|---|
| شوێن | * هاوسێیەتی<br>* کۆمەڵەی ناوخۆیی<br>* گەل | گەڕەکێکی دیاریکراو.<br>گوندێکی دیاریکراو.<br>گەلی کورد |
| قەبارە | * بچووک<br>* مامناوەندی<br>* گەورە<br>* زۆر گەورە | ٣ کەس.<br>فێرخوازانی نێو وانە.<br>فێرخوازان لە کۆلێژدا.<br>رەگەزی مرۆیی. |
| رەگەز | * نێر<br>* مێ | |
| تەمەن | * منداڵان<br>* نەوجەوانان.<br>* کەسانی گەورە.<br>* پیرەکان | |
| رێکخـــراوی کۆمەڵایـــەتی " پەیوەنـــدیی کۆمەڵـــە بـــە کۆمەڵەکانی دیکەوە. | * کۆمەڵایەتی<br>*نیمچەکۆمەڵایەتی<br><br>* دژە کۆمەڵگە.<br>* نا کۆمەڵایەتی. | خانەوادەی فێرگە، کۆمەڵەی مانگی سوور.<br>ئەو کۆمەڵانەی ناویان لەخۆ ناوە نیشتمانی.<br>دەستە و تاقم (عصابە)، یانەی رووتەکان.<br>دانیشتوانی ناوچەیەکی دابڕاو. |

# دینامیکییەکانی کۆمەڵە Group Dynamics

کۆمەڵە بەوە دەناسرێتەوە کە (هەمەکییەکی دینامیکیە) واتا ئەو کارلێکەی دەبێتە هۆی گۆڕان لە هەربەشێکی کۆمەڵەدا، گۆڕانی بەشەکانی دیکەش دێنێتە کایەوە، بۆنموونە: پەیوەندییەکانی هێز لە خانەوادەدا ئەگەر ئەندامێکی خانەوادەکە بمرێت یان ئەندامێکی نوێ بەهۆی لەدایکبوون و هاوسەرگیرییەوە هاتە نێوەیەوە، دینامیکیەتی کۆمەڵە لە کارلێککردنە و رەگەزێکی گۆڕانکاریی بۆ زیادکراوە، ئەوە روونە تەنانەت دووکەس و دوو کۆمەڵەی کارلێککەریش لەدوای بەرپابوونی کارلێکەکە نابنە یەك شت، بەڵکو بەرەو دۆخێکی دیکە دەگۆڕێن کە پتر یان کەمتر دۆستانە و هەماهەنگ دەبن وەك دەرەنجامی کارلێکەکە، ئەگەر کارلێککردنیش نەبوایە گۆڕانەکە دروست نەدەبوو.

رەهەند و روخسارەکانی دینامیکیەتی کۆمەڵە: بریتییە لە کارلێك و کامڵبوونی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانی مرۆیی و گۆڕانی کۆمەڵایەتی و چەندان روخسار و رەهەندی دیکەی رەفتاری کۆمەڵایەتی.

سێ بەکارهێنانی باوی دینامیکیەکانی کۆمەڵە هەن کە لەنێو خەڵکاندا باون، هەندێکیان دینامیکیەتی کۆمەڵە بۆ ئاماژەکردن بە ئایدۆلۆژیای دیاریکراوی سیاسی بەکاردێنن کە پەیوەندیی بە رێگەکانی رێکخستنی کۆمەڵەکان و بەڕێوەبردنیان هەیە و جەخت لەسەر گرنگیی سەرکردایەتیکردنی دیموکراسیانە و بەشداریکردنی گشت خەڵك دەکات بۆ دروستکردنی بڕیارەکان و ئاستی ئەو سوودەی کە گشت کۆمەڵگە و تاکێك لەئەنجامی بەشداریکردنی گشت خەڵك لە رەهەندەکانی ئەو چالاکییەدا دەیبینن کە کۆمەڵەکان ئەنجامی دەدەن، بەکارهێنانی دووەمیش بریتییە لە کۆمەڵێك لەو شێواز و رێگەیانەی کە لە بەرنامەکانی راهێنان بەمەبەستی چاکترکردنی کارامەیی لە

بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکان و کۆنگرە و پەیوەندییەکانی مرۆیی و گەیشتن بەو یاسایانە دەیگیرێنەبەر کە گەشەکردنی کۆمەڵەکە و پەیوەندیی تاکەکان بە کۆمەڵە و دەستگە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانی دیکەی لەسەر وەستاوە.

دەتوانین بڵێین کە چەمکی دینامیکیەتی کۆمەڵە لقێکی زانستەکانی مرۆییە کەوا گرنگیی بە شرۆڤەکردنی سیستماتیکی کۆمەڵە و پێکهاتن و گەشەکردن و چالاکی و بەرهەم و لایەنەکانی دیکە دەدات لەپێناو گەیشتن بەو یاسا زانستیانەی کە ئەم لایەنانە ڕێکدەخات.

## بنەمایەکانی دینامیکیەتی کۆمەڵە

کۆمەڵەکان پێشتر و ئێستەیش یەکەم جار لە خانەوادە و دواتریش لە تیرە و هۆز و گروپ و کۆمەڵە و دواتریش کۆمەڵگەدا بۆ وەدیهێنانی ئامانجە مرۆییەکان ئامرازێکی زۆر گرنگ بوون ، کۆمەڵەکان لە رابردوو و ئێستەشدا وەك هۆکارێکی حوکم و جەنگ و کار و داهێنان و پەرستش و فێرکردن بەکاردەهێندران، لە زۆر کۆنەوە و بەهۆی هەوڵدان و هەڵەکردنەوە کەسانی دێرین ئەوەیان بۆ روونبوویەوە کە چەند شێوازێکی دیاریکراو بۆ ئەنجامدانی شتەکان لە کۆمەڵەکاندا دەرەنجامی باشتری دەبێت، بەمەیش داناییە میللییەکان و وتە بەنرخەکان لەهەمبەر شێوازەکانی بڕیاردان و دابەشکردنی کار و هەڵبژاردنی سەرۆکەکان کەڵەکەبوون.

لە چاخەکانی کۆندا– لەو کاتەی کە توندیی کێشمەکێشی نێوان مرۆڤ و دوژمنەکانی لە بەرزترین پلەدا بوو– گرنگیدانی هەرە گەورە لەسەر ملکەچیکردن بوو بۆ

سەرکردایەتی نەك بۆ چاکترکردنی توانای ئەندامانی کار بەیەکەوە بەهاوکاری و دڵهێنان.

بەپێچەوانەی کردە سروشتییەکان مرۆڤ توێژینەوەیەکی جیدی بۆ کۆمەڵە بچووکەکانی ژیانی نەکرد تەنها دوای ئەوەی چەندان سەدە بیرکردنەوە لە لایەنە هەرە گەورەکەی سیستمی کۆمەڵایەتی کەڵەکە بوو، لەسەدەی حەڤدەهەمدا چەندان ڕێبازی تایبەت بە " بیرکردنەوەی رامێنەر"ی تایبەت بە سروشتی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ و پەیوەندیی نێوان تاکەکان و گردبوونەوەکان سەریانهەڵدا، ئەمەیش بووە هۆی پێکهێنانی بنەمای ئەقڵانیی ئەو شۆڕشانەی کە لەسەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا تەواوی ئەوروپا و ئەمریکای گرتەوە.

لەسەرەتای سەدەی بیستیشدا هەندێ بیرمەندی وەك کۆلی و مید زمیل باسیان لە رەگەزی " بەرزەفتکردنی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵە بچووکەکان کردووە" لەگەڵ گرنگیدانی تایبەت بەو مەرجە کۆمەڵایەتیانەی کە لەسایەیدا پاڵنەرەکانی تاك بەشێوەیەکی کاریگەر ڕێکدەکەون.

لە سەرەتایەکانی سەدەی بیستیشدا ئیدوارد لیندمان بەرەنگاری ڕێبازی رامێنەر بوویەوە لەهەمبەر گشت ئەو شرۆڤە کۆمەڵایەتیانەی کە تایبەت بوون بە کۆمەڵەکان و پێشنیاری ڕێبازی ئەزموونگەری کرد بۆ شرۆڤەکردنی کۆمەڵە وەزیفییەکان و یەکەم هەوڵیش زۆر بەفراوانی بۆ شرۆڤەکردنی کردەکانی کۆمەڵە ئەنجام درا و ناوی لێنرا لێکۆڵینەوە The inquiry کە لە کتێبێکدا بەناوی (پەروەردەی کۆمەڵایەتی) دا هاتبوو. ڕێبازی لێکۆڵینەوە جەختی لەسەر ئەو کردانە کردەوە کە لە لیژنە و کۆنگرە بچووکەکانی تایبەت بە چارەسەرکردنی گرفتە گەورەکانی کۆمەڵایەتی بەڕێوە دەبرێن.

جا لەژێر کاریگەریی شیکردنەوەکەی (دیوی) لەهەمبەر هزری ئەزموونگەریدا چەند توێژینەوەیەك بەهۆی گفتوگۆ و شێوازی چارەسەرکردنی گرفتەکانەوە سەبارەت بە چۆنیەتی وەدیهێنانی ئامانجەکان لەلایەن کۆمەڵەکانەوە ئەنجام دران.

جگە لە کاریگەرییە دەروونی و لۆژیکییەکان لەسەر شرۆڤەکردنی کۆمەڵەکانەوە، فرۆید لە بیستەکانی سەدەی بیستدا لەژێر کاریگەریی بنەما قووڵ و نەستیەکان و ئەو کردانەی بەرزەفتکردن کە کۆمەڵەکان بەسەر خانەوادەکانی یەکەمدا دەیسەپێنن، توێژینەوەی سەبارەت بە پێکهاتنی کۆمەڵەکانکرد. فرۆید پتر جەختی لەسەر لایەنە هەڵچوونییەکانی سەرکردایەتیکردنی کۆمەڵە و پێکهاتنی کرد لەوەی کە لە کارێکی هۆشیارانەدا جەخت بکاتە سەر رێکخستنی ئەندامان.

لە دوو دەیەی بەدوایەکداهاتووی سییەکان و چلەکاندا، زۆر بەڕوونی چەند ئاراستەیەکی دیاریکراو بۆ شرۆڤەکردنی کۆمەڵەکان بەدیارکەوتن کە ئێمە لەمانەی خوارەوەدا پوختیان دەکەینەوە:

١- ئاراستەی بیردۆزی بوار

کیرت لیڤین "بۆ تێگەیشتن لە رەفتاری کۆمەڵە بیردۆزی بواری دانا". ئەم بیردۆزە بە کاریگەربوون بە بیردۆزی گشتاڵتییەوە شیمانەی ئەوە دەکات کە بوارێکی دەروونی هەیە و وەك بواری کارۆموگناتیسی فیزیا کاردەکات، ئەم بوارەش لە چەندان هێز و گۆڕاو پێکدێت کەوا کاریگەرییان بەسەر رەفتاری کۆمەڵەکانەوە هەیە. هێزی رێژەیی ئەم گۆڕاوانەیش ئاراستە و خێرایی جوولەی کۆمەڵەکان دیاریی دەکات، لەسەر زانایانی کۆمەڵناسیش پێویستە ئەو ئامرازانەی تێبینیکردن و پێوانکاریانە پێشبخەن کە

بەهۆیانەوە دەتوانن ئەو هێزانە شیبکەنەوە و ئەو یاسایانە دیاریی بکەن کە حوکم بەسەر رەفتاری کۆمەڵە دەکات.

لیڤین برپیار لەسەر ئەوە دەدات کە شتی گرنگ لە بیردۆزی بواردا بە مامەڵەکردن لەگەڵ سیفەتەکانی هەڵوێستەکە وەك هەمەکیەك دەستپێدەکات، دوای ئەمەیش رەگەزو لایەن و بەشەکانی ئەم هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە ملکەچی شیکردنەوەی پسپۆڕ دەبێت، لەبەرئەوە هاوکێشە بیرکاری و وێنە ئەندازەییەکانی نێو کتێبەکانی بەهۆی نووسینی پێڕەوکارانییەوە پەرشوبڵاو دەبنەوە. هەرچەندە لیڤین زاراوەی دینامیکیەکانی کۆمەڵەی داناوە بەڵام لەم بوارەدا شرۆڤەی بەر فراوانی ئەنجام نەداوە.

٢- ئاراستەی شیکردنەوەی هۆکاری

ئەم ئاراستەیە لە کارەکانی ریمۆند کاتل و یارمەتیدەرانی زانکۆی ینویدا بەدیاردەکەوێت کە تیایدا رەهەندە سەرەکییەکانی کۆمەڵەکان بەهۆی شیکردنەوەی هۆکارییەوە دیاریی دەکرێت، هەروەك چۆن کاتلیش دەڵێت: ئێمە شرۆڤەی ژمارەیەکی زۆری کۆمەڵەکان دەکەین کە چەند بنەمایەکی گشتیی سەربەخۆی لێدەردەچێت کە بەهۆیانەوە دەتوانین وەسفی کۆمەڵە بکەین و تێی بگەین. کاتل بۆ وەسفکردنی کۆمەڵە چەند زاراوەیەکی داهێناوە، ئەم زاراوانەشی لە زانستی نەحو خواستووە، وەك زاراوەی Synality پێکهاتەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ئاماژە بە کۆی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵە بکات، هەروەك چۆن زاراوەی کەسێتی بۆ وەسفکردنی تاك بەکاردەهێنین. مەبەستیشی لەم زاراوەیە پێکهاتەی کۆمەڵەیە رێك بەپێی شوێنی لە ئیعرابدا، کاتل لە شرۆڤەکردنەکانی خۆی لەهەمبەر کۆمەڵەدا گرنگیی بە هۆکارەکانی وەك وزە و توانا دەدات.

شیکردنەوەی هۆکاری شێواز و ڕێبازێکی ئامارییە ئەو پەیوەندییە وابەستەییانەی نێوان ژمارەیەك گۆڕاو دەپشکنێت و تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی لێ هەڵدەهێنجێ، بەشێوەیەك دەگاتە کەمترین ژمارەی ئەو هۆکارانەی کە وەسفی دیاردەکە دەکەن و گوزارشت لە ڕاستییە سەرەکییەکانی دەکەن، بۆیە مامەڵەکانی پەیوەندیی نێوان ژمارەیەك دیاردەی وەك یەکگرتوویی و پتەوی و دابڕان و پچڕان و هتد دەکات. دواتر لەم پەیوەندییانەوە ئەو هۆکارانە هەڵدەهێنجین کە دەتوانین بەمەزنترین خاڵی هاوبەشی ناوببەین و دواتریش لەو وێنە بیرکارییە ژمارەییانە هەڵدەگەڕێینەوە بۆئەوەی وێنەیەکی واقیعی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵە بکێشین.

### ٣ - ئاراستەی ڕێکخستنی رەسمی

ئەم ئاراستەیە سەبارەت بە ڕێکخستن و تێگەیشتن لە سروشتی سەرکردایەتی لە ڕێکخراوەکانی رەسمیدا لە بنەڕەتەوە گرنگیی بە دانانی هزری لۆژیکی دەدات. ئەم ئاراستەیە لەلایەن س ل شارتل و هاوکارانییەوە لە زانکۆی ویلایەتی ئۆهایۆ ڕێبەرایەتی دەکرا و شێوازەکانی جەخت لەسەر تێبینیکردنی کارلێکی ئەو سیستمانە و وەسفی تێروتەسەلی پێکهاتەکەیان دەکاتەوە.

### ٤- ئاراستەی پێوانی سۆسیۆمەتری

ئەم ئاراستەیە رەهەندی هەڵچوونیی ژیانی کۆمەڵە دەگرێتەوە لە میانی ئەو کارلێکەی کە لەنێوان ئەندامانیدا ڕوودەدەن و ڕێژەی بەکێشکردنی کۆمەڵە و پلەی پتەوی و توندوتۆڵیی نێوان ئەندامانی دیاریی دەکات. بناغەی ئەم ئاراستەیەش ئەو پێوەرەیە کە مرۆینۆ بۆ پێوانی بەکێشکردن و لەیەکتری دوورکەوتنەوە دایناوە و تیایدا

ئەو پرسیارە لەئەندامەکە دەکرێت کە دەتوانێ چی هەڵبژێرێت و چی هەڵنەبژێرێت وەك هاوڕێیەك یان هاوکارێك و ئەنجامدانی گەشتێك یان وەبیرهاتنەوە و هتد... ئەمەیش پێوەری سۆسیۆمەترییە، دواتریش پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامان لە وێنەیەکدا ڕووندەکاتەوە کە پێیدەگوترێت سۆسیۆگرام و پێگەی ئەندامان ڕووندەکاتەوە، بۆنموونە (ئەو ئەستێرانەی کە زۆرترین ئەندام هەڵیاندەبژێرن، هەروەها ئەو هێڵانەیش هەن کە شوێنەکان بەیەکتری دەگەیەنن و ڕێژەی توندوتۆڵی و یەکگرتووییەکە ڕووندەکەنەوە.

### ٥- ئاراستەی شیکردنەوەی کارلێکی:

ئەم ئاراستەیە لەسەر دەستی ڕۆبێرت ف. بیلز و هاوکارانی لە تاقیگەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی هارفارد سەریهەڵدا و جەخت لەسەر ڕەفتاری دەرەکی دەکات لە کارلێکی تاك لەگەڵ خەڵکانی دیکە و کرۆکی شرۆڤەکردنی کردارییانەی پێوانی کارلێکی کۆمەڵە بچووکەکانە، ئەم ئاراستەیە بۆ تێبینیکردنی کۆمەڵەکان بەبێ هیچ هەراسانییەك بەکارهێنانی ئامێری تۆمارکردن و پەنجەرە یەك ڕەهەندییەکانی بەکارهێناوە.

### ٦- ئاراستەی شیکردنەوەی دەروونی

ئەو ئاراستەیەیە کە لە گەشەکردنی دەروونی و ڕۆڵی پەیوەندییە هەڵچوونییەکان لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و برا بە بیردۆزی فرۆیدەوە کاریگەرە. ئەم ئاراستەیە لەبنەڕەتەوە پێداگری لەسەر ڕەگەزە سۆزییە نەستییەکان و کاریگەرییان لەسەر گەشەکردنی کەسێتی دەکات، ڕێگەی لێکۆڵینەوە لەم ئاراستەیەدا لەسەر بنەمای شیکردنەوەی شارەزایی و ئەزموونە تۆمارکراوە وردەکان کار دەکات و بەزۆریش مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵەکانی چارەسەریی دەکات.

### ٧- ئاراستەی کۆمەڵەکانی کاری بەکۆمەڵ

ئاراستەکە بەشێوەیەکی تەقلیدی لە شیکردنەوەی تۆمارکراوە چیرۆکییەکانی کاری کۆمەڵەکان و هەڵێنجانی گشتێنراوەکان لە زنجیرەیەکی مێژووی دۆخەکانی کۆمەڵەکان پێکدێت، ئەم ئاراستەیە لە بنەڕەتەوە گرنگیی بە پێشخستنی کەسێتی داوە لەمیانی شارەزایی و ئەزموونەکانی کۆمەڵەوە هەرچەندە چارەسەرکاریش نییە. رێبەرانی ئەم ئاراستەیە پتر گرنگییان بە ئەزموون داوە نەك بە توێژینەوەکان، هەربۆیە نووسینی تیۆرتەسەلی تیۆرییان نییە، هەروەها ئاراستەیەکی هاوچەرخ لەبارەی ئاراستەکردنی توێژینەوەکانی کاری کۆمەڵەکانەوە هەیە بۆ چاودێریکردنی کاریگەریی هەندێ گۆڕاوی وەك سەرکردایەتی لەسەر کاری کۆمەڵە و گەشەکردنی تاکەکانی، ئەمەیش لەجیات وەسفکردنی تەنها ئەو شتەی کە لە کۆمەڵە روودەدات.

## ڕێگەکانی لێکۆڵینەوە: شێوازەکانی لێکۆڵینەوە لە دینامیکیەتی کۆمەڵەدا

### یەکەم: توێژینەوەی بواری:

ئەم جۆرە توێژینەوانە لەخۆگری هاندانی کۆمەڵەیەکە- بواری لێکۆڵینەوەکە- بۆ توێژینەوەی بەبێ ئەوەی ئەم کاریگەرییە ببێتە هۆی کاریگەری دروستکردن لەسەر ژیانی کۆمەڵە و چالاکییەکانی. توێژەر لەم جۆرە توێژینەوەیەدا گشت ئامادەگییە پێشوەختەکان دەگرێتەبەر بەشێوەیەك نەبێتە هۆی ئەوەی بەهۆی کارەکانیەوە دەستوەردان بکات و کاریگەریی لەسەر ژیانی کۆمەڵە بەجێبهێڵێ.

یەکێك لەم جۆرە توێژینەوانە توێژینەوەکەی نیوکمبە کە لە ماوەی نێوان ١٩٣٥- ١٩٣٩ دا ئەنجامی دا و ئامانجی دۆزینەوە و ئاشکراکردنی کاریگەریی کۆمەڵە بوو لەسەر هەمووارکردنەوە و گۆڕینی پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانی تاك. لەمەیشدا زانکۆی پەنتنگۆنی ئەمریکی هەڵبژێردرا. نیوکمب ئاراستە سیاسییەکانی هەڵبژارد بۆ ئەوەی گوزارشت لە ناوەڕۆکی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی بکات، چوونکە ئەم زانکۆیە لەهەمبەر ئەم ئاراستانەدا لەگشت زانکۆیەکانی دیکەی ئەمریکی ئازادترە. بۆیە ئەو زانیاریانە کۆکرانەوە بەبێ ئەوەی فێرخوازان ئامانجی توێژینەوەکە بزانن کە تەنها کۆکردنەوەی زانیاری بوو. لەو دەرەنجامانەی پێیگەیشت ئەوەبوو کە ئاراستەی هەندێ فێرخوازی پۆلی یەکەم لەوانەی کە لەخانەوادە پارێزکارەکانەوە دێن، بەشێوەیەکی زۆر لەو ئاراستە باوانەی نێو کۆمەڵگە زانکۆییەکە لادەدەن، کۆمەڵگەی زانکۆییش کاریگەریی لە هەموارکردنەوەی ئاراستەی ئەو فێرخوازانەدا هەیە، بەو بەڵگەیەی کە فێرخوازانی پۆلی دووەم لەهی یەکەم پتر ئازادن. نیوکمب گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە زانکۆی

ناوبراو پاداشتی ئەو فێرخوازانە دەکات کە ئاراستەی خۆیان دەگۆڕن بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاراستە باوەکانی زانکۆکە بیگونجێنن و هتد. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم ڕێبازەش ئەوەیە کە لەبواری کۆمەڵە فیعلییەکە چەند زانیارییەکی ورد و واقیعیمان پێدەبەخشێت، بەڵام کەموکورتییەکەیشی لەوەدایە کە ناتواندرێ دەرەنجامەکانی بەسەر کۆمەڵەکانی هاوشێوەدا پیادە بکرێت، هەروەها یەکێك لە مۆرکەکانی ئەم ڕێبازەش قورسیی دیاریکردنی ئاراستەی هۆیەکییە، واتا نازانێ ئەوە دیاریی بکات کە چ هۆکارێك بووەتە هۆی دەرخستنی ئەم دەرەنجامانە.

## دووەم: ئەزموونگەریی سروشتی:

ئەم ڕێباز و ئاراستەیە شرۆڤەکردنی ئەو کاریگەری و شوێنەوارانە دەردەخسێنێ کە لەئەنجامی بەرپاکردنی گۆڕانکاری لە هۆکارەکانی دیاریکەردا دەیخولقێنێ، بەمەیش دەتوانین تاڕادەیەك ئاراستەی هۆیەکی دیاریی بکەین، ئەمەیش ڕێباز و شێوازی پێشوو(بواری) نەیتوانی دیاریی بکات. ئەزموونیش بەپێی ئەم ڕێبازە دروستکراوی لێکۆڵەر نییە بەقەد ئەوەی دروستکراوی ژیانە، چوونکە لێکۆڵەر هیچ هەموارکردنەوەیەك بۆ ژیانی کۆمەڵەکان ناکات تاکو شرۆڤەی کاریگەرییەکانی ئەمە بکات، بەڵکو سوود لەو هەموارکردنانە وەردەگرێت کە لەهەمبەر ژیانی کۆمەڵە ڕوودەدات، بۆ ئەوەی شرۆڤەی شوێنەوارەکانی ئەم هەموارکردنەوەیە بکات، ئەمەیش لەوکاتەیە کە ژیانی کۆمەڵەکان دەکەوێتە بەر ڕووداوێك.

لەو توێژینەوانەش توێژینەوەکەی (لێبرمان)ە کە لەساڵی ١٩٥٦دا لەبارەی شوێنەوارەکانی گۆڕانی دەورەکان لە ئاراستەکانی کەسانی ئەنجامدەردا ئەنجامی دا،

ئەم توێژینەوەیە گوزارشت لە نموونەی ئەزموونگەریی سروشتی دەکات، تیایدا توێژەر لە پێکهاتنی کۆمەڵە کارگەیەکدا سوودی لە رووداو بینیوە، ئەم گۆڕانەیش کردەی بەرزبوونەوەی پلەی هەندێ کرێکارە بۆ ئاستی سەرۆکی کرێکاران. لێکۆڵەر ویستوویەتی شرۆڤەی شوێنەوارەکانی گۆڕانی ئەو دەورانە بکات کە کرێکاران لە ئاراستەی هەمبەر بەڕێوەبەرایەتی و یەکیەتییەکانی کرێکاران ئەنجامی دەدەن. لێکۆڵەر دەرەنجامی لێکۆڵینەوەی پێشووی بواری لەسەر هەمان کرێکاران بەکارهێنا و لەهەمبەر بەڕێوەبەرایەتییەکان و یەکێتییەکانی کرێکاراندا ئاراستەکانیانی شرۆڤەکرد و بەو دەرەنجامانەی بەراورد کرد کە لەکاتی پیادەکردنی هەمان توێژینەوە لەهەمبەر بەرزبوونەوەی پلەی کرێکاران و ئەوانەشدا بەدەستی دەکەوێت کە هێشتا پلەیان بەرز نەبووەتەوە بۆئەوەی شرۆڤەی کاریگەریی بەرزبوونەوەی پلە بکات لەسەر ئاراستەکانیان، لەو دەرەنجامانە پێیگەیشت ئەوەبوو کە ئەو کەسانەی رۆڵ و دەوریان گۆڕاوە، ئاراستەکانیشیان گۆڕاوە، بەڵام ئاراستەی ئەوانی دیکە نەگۆڕاوە، چوونکە ئاراستەی ئەو کەسانەی کە پلەیان بەرزبووەتەوە و بوونەتە سەرۆکی کرێکاران لەهەمبەر بەڕێوەبەرایەتی پتر ئەرێییە، هەروەها ئەو کەسانەی لەلایەن یەکێتییەکانی کرێکارانیشەوە هەڵبژێردراون لەهەمبەر یەکێتیەکە پتر ئەرێیین.

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم رێبازەیش ئەوەیە کە هەموارکردنەوە و گۆڕان دروست ناکرێت، بەڵکو بەخۆی لەمیانی ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵەوە روودەدات. بەڵام ئەم رێبازە کەموکورتییەکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە ماوەیەکی دەوێت چوونکە لەسەر لێکۆڵەر پێویستە چاوەڕوانی گۆڕانکارییەکان بێت بۆ ئەوەی شرۆڤەی کاریگەری و شوێنەوارەکانیان بکات، ئەم رێبازە سوودێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لەپێش کردەی

گۆڕان و دوای کردەکەیش زانیاری گونجاو کۆدەکاتەوە، هەروەها بەشێوەیەکی گونجاو بەراوردکاریی لەنێوان کۆمەڵەکانی ئەزموونی و بەراوردکاری دەکات، ئەمەیش پێویستی بە دانانی پلانی گونجاوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی لەسەر ژیان و چالاکییەکانی کۆمەڵ بەشێوەیەکی ڕێکوپێك.

## سێیەم: ئەزموونگەریی بواری:

توێژەر لەم ڕێبازەدا هەندێ گۆڕانکاری ئەنجام دەدات کە ئامانجی شرۆڤەکردنی شوێنەوارەکانیەتی، گرنگترین پێداویستییەکانی سەرکەوتنی ئەم ڕێبازەیش هاوکاریی نێوان تاکەکانی کۆمەڵەیە کە توێژەر کاری لەگەڵدا دەکات بۆ ئەوەی زانیاریی گونجاوی دەست بکەوێت. یەکێك لە نموونەکانی توێژینەوەی ئەم ڕێبازە شرۆڤەی (کوش و فرنش)ە کە لە ساڵی ١٩٤٨ دا لەیەکێك لە کارگەکانی ڕستن و چنیندا ئەنجام دراوە، ئاراستەکەیش بۆ گۆڕین و دەستکاریکردنی هەندێ ڕێگەی کارکردنی پێڕەوکراو بوو، ئەم هەموارکردنەوەیش ڕەنگە ببێتە هۆی ورووژاندنی نیگەرانیی کرێکاران، ئەمەیش دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی ئاستی بەرهەم، لەبەرئەوە هەردوو توێژەر شرۆڤەیەکی ئەزموونگەرییان دارِشت و چەند کەسێك لە کۆمەڵەکان هەڵبژێردران کە لەڕووی ئاستی بەرهەم یەکسان بوون و کرانە سێ بەش کە هەر بەشێك لەژێر هەلومەرجێکی دیاریکراودا کاریاندەکرد.

☐ هەلومەرجی یەکەم : کۆمەڵەکان لە گفتوگۆکردن سەبارەت بە ڕێگەی نوێی کار بەشدارییان نەکرد.

☐ هەلومەرجی دووەم: کۆمەڵەکان لەهەمبەر شێوازی کار لە ڕێگەی نوێنەرایەتیکردنیەوە بەشدارییان لە گفتوگۆدا کرد.

□ هەلومەرجی سێیەم: گشت تاکەکانی کۆمەڵەکان لە گفتوگۆکردن سەبارەت بە ریگەی نوێی کار گفتوگۆیان کرد.

دەرەنجامەکانیش بەم شێوەیە بوون: لەهەمبەر هەلومەرجی یەکەمدا ئاستی کارکردیان دابەزی دوای ئەوەی گۆڕان روویدا و بۆ ماوەی شەش هەفتە بەردەوام بوو، هەلومەرجی دووەمیش لەسەرەتادا ئاستی ئەدا و کارکردیان دابەزی دواتر لە کۆتایی هەفتەی سێیەم بەرزبوویەوە، هەروەها هەلومەرجی سێیەمیش لە سەرەتای قۆناغەکەدا تێکڕای بەرهەمەکانیان نزمبوونەوەیەکی کەمی بەخۆیەوە بینی دواتریش بەرزبوویەوە.

لە تایبەتمەندییەکانی ئەم رێبازەیش ئەوەیە کە تایبەتمەندییەکانی رێبازی بواری و ئەزموونیی لەخۆیدا کۆدەکاتەوە، کەموکورتیشی هەیە و دووچاری تەنگوچەلەمەیش دەبێتەوە، گرفتەکەیشی لەوەدایە کە ئاسان نییە توێژەر بچێتە لای کۆمەڵەیەکەوە و بە بەڕێوەبەرانی کۆمەڵەکەیش بڵێت نیازی چ گۆڕانکارییەکی هەیە، هەروەها ئاسان نییە هاوکاریی کەسانی نێو کۆمەڵەکە بەدەستبێنێت.

## چوارەم: ئەزموونگەریی کرداری

ئەم رێبازە ئامانجی پترکردنی توانای توێژەرە بۆ بەرزەفتکردن و کۆنترۆڵکردنی ئەو گۆڕانکارییە جۆراوجۆرانەی کە کاریگەریی لە دیاردەی ژێر توێژینەوەکە دەکەن، توێژەر دەتوانێ ئەو شتانە بگۆڕێت و جێگیریان بکات کە حەز بە گۆڕان و جێگیرکردنیان دەکات، لەم رێبازەدا ئەمەی بەپلەیەکی باشتر پێدەکرێت، بەلام لە رێبازەکانی دیکەدا بەم شێوەیە نییە. توێژەریش بەپێی رێبازەکە دوای ئەوەی کۆمەڵە سروشتییەکان بەکاردەهێنێ، دەیانگوازێتەوە تاقیگەکەی خۆی.

یەکێك لە نموونەی شرۆڤەکاریی ئەم ڕێبازەیش شرۆڤەکەی (فرنش و سنیدر) ە کە لەساڵی ١٩٥٩دا لەسەر کۆمەڵەکانی پیاوانی هێزی ئاسمانی ئەمریکیدا ئەنجامیان دا، توێژینەوەکە ئامانجی زانینی ئەو هۆکارانە بوو کەوا دەست لە دیاریکردنی ئاستی کاریگەریی ئەفسەران وەردەدات لە ئاستی کاری سەربازەکانیان لەوکاتەی کارێکی نافەرمی ئەنجام دەدەن، هەروەها لە توێژینەوەکەدا ئاستی خۆشەویستیی سەربازان لەهەمبەر ئەفسەرانیان وەك هۆکارێك لە هۆکارەکان هەڵبژێردرا.

سەربازەکان دابەش کرانە سەر چەند کۆمەڵەیەك، هەر کۆمەڵەیەکیش لە سێ سەرباز و ئەفسەرێك پێکهاتبوو، دوو جۆرە کۆمەڵە هەبوون، جۆرێکیان خۆشەویستیی سەربازان لەهەمبەر ئەفسەرانیان تیایدا بەدی دەکرا، جۆرەکەی دیکەشیان ئەم خۆشەویستیەی تیادا نەبوو. دواتریش کۆمەڵەکان گواسترانەوە کار و هەر کۆمەڵەیەکیش کارێکی پێسپێردرا، بەهۆی تێبینیکردنی ورد و تۆمارکردنی گشت ئەو شتانەی کە لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانیاندا دەیکەن ئاستی ئەو کاریگەرییە بەدیارکەوت کە ئەفسەران دەیانویست لەسەر سەربازەکانیان بەجێی بهێڵن، هەروەها دەرەنجامەکان ئەوەشیان روونکردەوە کە ئەفسەرانی خۆشەویست لە ئەفسەرانی ناخۆشەویست پتر هەوڵیان دەدا کاریگەریی لە ئەفسەرەکانیان بکەن و سەرکەوتنیشیان پتر بوو.

دوای ئەمە ئەفسەران لە سەربازان جیاکرانەوە بەشێوەیەك کە لەژوورێکی دیکەوە هەر ئەفسەرێك پەیوەندیی بە سەربازانی بکاتەوە، هەروەها چەند رێوشوێنێك درایە گشت ئەفسەرەکان کە دواتر دەبوایە وەك فەرمانێك بیاندابوایە سەربازەکانیان، رێوشوێن و فەرمانەکانیش وێکچوو بوون.

لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان روونکردەوە کە ئەفسەرانی خۆشەویست لە کاریگەریی دروستکردن لەسەر سەربازەکانیان لە ئەفسەرانی ناخۆشەویست پتر سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، بەم شێوەیە هەردوو توێژەر توانیان تاقیکردنەوەیەك لە تاقیگەیەکی تایبەت ئەنجام بدەن و کۆنترۆڵی چەند گۆڕاوێك بکەن و توانیشیان ئەو گۆڕاوانە جێگیر بکەن کە بینیبوویان و ئەو شتانەش بگۆڕن کە دەیانویست بیگۆڕن.

یەکێك لە کەموکورتییەکانی ئەم رێبازەیش ئەوەیە کە زۆر بەزەحمەت دەتوانرێ ئەم دەرەنجامانە بەسەر هەڵوێستی ئاساییدا بگشتێنرێن، دەرەنجامەکانیش ناگشتێنرێن تەنها لەوکاتەدا نەبێت کە وێکچوونێکی گونجاو لەنێوان هەلومەرجەکانی کار و هەلومەرجەکانی ئەو هەڵوێستەدا هەبن کە دەرەنجامەکەی تیادا دەگشتێندرێ.

# پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی

**پێناسەکردنی پێوەر:**

* پێوەری کۆمەڵایەتی پێکهاتەیەکی شیمانەکراوە ماناکەی تەرازوو یان پێوەر و بنەما و چوارچێوەری مەرجەعیی ئەزموون و شارەزایی و درککردنی کۆمەڵایەتی و ئاراستە و رەفتارەکانی کۆمەڵایەتییە.

* رەفتارێکی نموونەیی یان میسالیی کۆمەڵایەتییە و بەبێ رەتکردنەوە و ناڕەزایی و رەخنەلێگرتن و بەهۆی پەسندکردنی کۆمەڵایەتییەوە دووبارە دەکرێتەوە.

* گشتاندنێکی پێوەرییە لەهەمبەر جۆرەکانی رەفتاری پێشبینیکراو لەهەر بابەتێك کە پەیوەندیی بە کۆمەڵە و تاکەکانی هەبێت.

* ئەو پێوەرەیە کە ئەندامانی کۆمەڵە لەنێو خۆیاندا دابەشی دەکەن و رەفتاریان دیاریی دەکات و پێشبینیی ئەوە دەکات کە لە هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتیدا پێوەی پابەند بن.

* چوارچێوەیەکی هاوبەشی مەرجەعیە و لە کارلێکی نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا سەرچاوە دەگرێت و بەهۆیەوە لە کۆمەڵەدا حوکم لەسەر رەفتاری کۆمەڵایەتیی دەدات.

## چەند تێبینییەك لەسەر پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی

★ چەند دەرەنجامێکی کارلێکی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە لە رابردوو و ئێستەیدا، بۆنموونە رێوڕەسمە ئاینییەکان و پێوەرەکانی ئاکاری و بەهاکانی کۆمەڵایەتی و بنەما یاساییەکان و دابونەریت وهتد دەگرێتەوە. هەروەها شتە راست و هەڵەکان و رێگە

پێدراو و قەدەغەکراوەکان و پەسند و عەیبەکان دەگرێتەوە، هەروەها ئەو رەفتارانەش دەگرێتەوە کە دەبێ لە کۆمەڵگەدا هەبن و ئەوانەش کە نابێ بوونیان هەبێت.

* لەمیانی کارلێکی کۆمەڵەوە پێکدێت و رۆڵەکانی کۆمەڵایەتیش دیاریی دەکات و لە هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتیدا رەفتاری تاکەکان رێکدەخات .

* ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتیانەن کە تاك لەمیانی کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا وەریاندەگرێت و فێریان دەبێت

* پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی بە جیاوازی رۆشنبیری و کەلتوور و کۆمەڵەکانەوە دەگۆرێن.

## شرۆڤەکردنی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی:

دەتوانین لەمیانی سێ رێگەوە شرۆڤەی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی بکەین:

* چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵە و زانینی هزرە هەستییەکانیان یان ئەو شێوەو قاڵبەی کە دەبێ لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە دیاریکراوەکاندا رەفتاری تاك و کۆمەڵە تیایدا قاڵبرێژ ببێت.

* تێبینیکردنی رەفتاری خودی کۆمەڵە لەکاتی کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتی نێو هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتیدا.

* شرۆڤەکردنی بنەما و سیستم و لیست و یاساکانی نووسراو .

# پێکهاتن و کاریگەریی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی

شرۆڤە و ئەزموونەکان چۆنیەتیی پێکهاتنی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و ئاستی و کاریگەریوونی تاکیان بە پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی روونکردووەتەوە، هەروەها ئەو ئاستەیان روونکردووتەوە کە تاك لە دروستکردنی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتیدا دیارییان دەکات:

* کۆمەڵە بەشێوەیەکی خێراتر لە تاك پێوەری کۆمەڵایەتی پێکدێنێت.

* ئەو کەسانەی بەشێوەی تاکەکەسی دەستیان پێکرد هەریەکە و بۆخۆیان تاك پێوەرێکیان پێکهێنا، کاتێکیش کۆبوونەوە پێوەرە تاکەکەسییەکان وردەوردە لەیەکتری نزیکبوونەوە و پێوەرێکی کۆمەڵایەتیان پێکهێنا.

* ئەو کەسانەی کە لە کۆمەڵەکانەوە دەستیانپێکرد بە پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی کاریگەر بوون و رێژی خۆیان لەهەمبەریدا پاراست.

* تاك پێوەرەکانی کۆمەڵە هەڵدەگرێت و لەخۆی دەگرێت و نوێنەرایەتیی رێگە و پێوەری کۆمەڵە دەکات لە دەرککردنی بابەتەکانی ئەو ژینگەیەی کەوا تیایدا دەژیەت.

* پێوەرەکانی حوکمەکانی تاك بەهۆی گوێبیستبوونی حوکمی خەڵکانی دیکە کاریگەر دەبێت، کاتێکیش لە بەردەم خەڵکانی دیکەدا گوزارشت لە حوکمەکانی دەکات، مانای ئەم شتەی پێشوو ئەوە نییە کە تاك بەردەوام حوکم و خولیا و ئاراستەکانی لە حوکم خولیا و ئاراستەی کۆمەڵە وەردەگرێت و بوێریی ئەوەی نییە دژی بوەستێتەوە و هەندێ تاکیش لە راوبۆچوونی خۆیاندا سەربەخۆن و خۆیان وابەستەی راوبۆچوونی کۆمەڵە ناکەن و لەسەر راوبۆچوونی خۆیان سوورن جا ئەگەر سەرجەم کۆمەڵەکە دژی بوەستنەوە، هەندێ تاك هەن کەوا هەڵەی کۆمەڵە بەرِوونی

دەبینن، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان لەگەڵ ئەوشتانەدا دەگونجێنن کەوا کۆمەڵەکە پەسندی کردووە، هەندێ کەسی دیکەش هەن تەنها بەچاوی کۆمەڵەوە دەنوارنە شتەکان و هەڵوێستەکان و بەڵێ و نەخێری خۆیان نییە.

## لێکدانەوەی پابەندبوون و خۆگونجاندنی تاکەکان لەگەڵ پێوەرەکانی کۆمەڵایەتیدا

کارترایت و زاندر و مالباس هۆیەکانی پابەندبوون و خۆگونجاندنی تاك لەهەمبەر پێوەرەکانی کۆمەڵە لەم خاڵانەی خوارەوەدا چڕ دەکەنەوە:

* ڕەنگە ئەندامیەتیی تاك ڕەفتارێکی هاوشێوەی کۆمەڵەکانی دیکە بگرێتەبەر، چوونکە دەیەوێ دڵنیایی لەوەدا پەیدا بکات کە هەڵوێستەکەی دروستە و تێگەیشتنی لەشتەکان راستە، جا ئەگەر لە دروستیی هەڵوێست و تێگەیشتنەکەی دڵنیا نەبوو، ئەوا راوبۆچوونی ئەو کەسانە پەسند دەکات کە خۆشیدەوێن و متمانەی بە راوبۆچوونەکانیان هەیە.

* فشاری کۆمەڵە لەسەر ئەندامەکانی بەمەبەستی یەکخستنی ڕەفتاریان چەندان تایبەتمەندی و خەسڵەتی بۆ دەستەبەر دەکات.

دوو جۆرە فشار هەن کە یارمەتیدەری پابەندبوون و خۆگونجاندنی تاك دەدەن لەهەمبەر پێوەرەکانی کۆمەڵە، ئەوانیش:

١- فشارەکانی ناوەکی: ئەو فشارانەن کە لە کێشمەکێشی نێو خودی تاکەکەسەکەوە سەرهەڵدەدەن کاتێ تێبینیی ئەوە دەکات کە راوبۆچوون و ڕەفتارەکانی جیاوازن لە راوبۆچوون و ڕەفتاری خەڵکانی دیکە.

٢- فشارەکانی دەرەکی: ئەو فشارانەن کە لەلایەن خەڵکانی دیکەوە ئاراستە دەکرێن بۆ کاریگەری دروستکردن لەسەر راوبۆچوون و رەفتاری تاك (فشاری کۆمەڵە بەسەر تاکەکان) ئەم فشارەش بۆ وەدیهێنانی ئەم ئەرکانەی خوارەوە ئاراستە دەکرێن:

* یارمەتیدانی کۆمەڵە لە جووله و بزاڤی خۆیدا بەرەو ئامانجەکانی.

* نۆژەنکردنەوە و مشتومالکردنەوەی کۆمەڵە و هێشتنەوەی.

* یارمەتیدانی ئەندامان بۆ ئەوەی لە (واقیعی کۆمەڵایەتیدا) پاڵپشتێك بۆ راوبۆچوون و رەفتاریان بدۆزنەوە.

ئەو هۆکارانەی کە هێزی پێوەرەکانی کۆمەڵە و ئاستی پابەندبوونی تاك پێیانەوە و خۆگونجاندنی تاك لەهەمبەریاندا دیاریی دەکات:

* پتەوی و توندوتۆڵی و کۆمەڵە و راکێشانی ئەندامانی: چوونکە هەرچەندە کۆمەڵە پتەوتر و توندوتۆڵتر بێت و پتر ئەندامانی رابکێشێت، ئەوا ئاستی خۆگونجاندنەکە بەرزتر دەبێت. هۆی راکێشرانی ئەندامێك بۆ کۆمەڵەکەی بریتییە لە:

– بەکێشبوونی بەرەو هەندێ تاکی کۆمەڵەکە.

– ئامانجەکانی کۆمەڵەکەی خۆشدەوێت و پەسندی دەکات.

– ئەندامەکانی پێگەیەکی تایبەتیان هەیە.

– خودی تاکەکە پێگە و شوێنێکی تایبەت و پۆستێکی تایبەتی لە کۆمەڵەکەدا هەیە.

* زیادبوونی ژمارەی کەوتنە بەر پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی، چوونکە ناسینەوەکەی ئاسانتر دەبێت و تاکەکان بەئاسانی دەتوانن خۆیانی لەگەڵدا بگونجێنن.

* روونیی پێوەرەکانی کۆمەڵە، رەنگە هۆی روونیی پێوەرەکان بریتی بن لە:

- پتەوی و توندوتۆڵیی کۆمەڵەکە و گونجان و هەماهەنگبوونی ئەندامەکانی.
- زۆریی پەیوەندیی نێوان ئەندامەکانی.

*بـوونی زۆرینــە: هەرچــەندە زۆرینــە لەســەر پێـوەرێکی دیـاریکراو رێکبکــەون و هەرچەندە متمانەی تاك لەهەمبەر راوبۆچوونی زۆرینە پتر بوو، ئەوا حەز بەوە دەکات پشتگیریی لە راوبۆچوونی کۆمەڵ بکات و پێوەرەکەی لەخۆبگرێت و کاری پێبکات.

* فـشاری کۆمەڵــە لەســەر ئــەو کەســانەی دژی پێوەرەکـانی دەوەسـتنەوە وەك نــارەزایی و هەڵنەبــژاردنی کۆمەڵایــەتی لــە هەڵبژاردنەکانــدا و لــە دابەشــکردنی بەرپرسیاریەتییەکان و بایکۆتکردن و رەتکردنەوە.

* گرنگیی ئەو کارەی کەوا کۆمەڵ ئـەنجامی دەدات: هەرچـەندە گرنگیـی کـارکردن پتر ببێت ئەوە بۆ ئەندامەکانی روونتر دەبێتەوە و پتر لەگەڵ پێوەرەکاندا دەگونجێن و لەسەری دەڕۆن.

* هۆکـاری دیکــەی وەك تەمــەن بــچووکیی ئەنــدامی کۆمەڵــە و ســادەیی رادەی فێربوون و بوونی پاداشتی پێشوو لەهەمبەر خۆگونجاندنی لەگەڵ پێوەرەکانی کۆمەڵەو بالا دەستبوونی کەشی داپلۆسێنەر و سەرکوتکردن لە کۆمەڵەدا.

# ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی لادان و دژبوونی تاکەکان لەگەڵ پێوەرەکانی کۆمەڵەدا:

ئەو هۆکارانەی دەبنە لادان و نەڕۆیشتن بە ڕێڕەوی پێوەرەکانی کۆمەڵە لەلایەن تاکەکانەوە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. جیاوازیی لە ڕاکێشانی کۆمەڵە لەهەمبەر تاکە جۆراوجۆرەکانەوە.

٢. لێڵی و ناڕوونیی پێوەرەکانی کۆمەڵە.

٣. سستی و بێهێزیی ئەو فشارەی ئاراستەی تاکەکانی نێو کۆمەڵە دەکرێت.

٤. نەبوونی زۆرینە.

٥. ناڕوونی و لێڵی لە گرنگیی ئەو کارەی کەوا کۆمەڵە ئەنجامی دەدات.

هەروەها چەند تایبەتمەندی و خەسڵەتێکی کەسیش دەچنە پاڵ ئەو هۆکارانەی سەرەوە:

١. متمانەی تاک بەخودی خۆی یان ئەو سەربەخۆییەی لەسەر متمانەی تاک لە درککردن و شارەزاییەکەی بونیاد نراوە.

٢. کۆشەگیریی تاک.

٣. ستەم، واتا ئەو ستەمەی کە تاک لە خۆی و خەڵکانی دیکەی دەکات کاتێ کە بەشێوەیەکی ئەنقەست لە پێوەرەکان لادەدات.

٤. نەزانی، واتا ئەو کاتەی کە تاک بەشێوەیەکی نەزانانە لە پێوەرەکان لادەدات.

٥.بنەمای (دژبە و دەزانیت) یان سەربەخۆیی لەسەر بنەمای هەستکردن بە زەرورەتی ئەنجامدانی کارێك کە بە مۆرکی لێهاتووانە رەنگ کرابێ گەرچی رووبەڕووی گرژی و گومانێکی توندیش دەبێتەوە.

## پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە Group Cohesiveness

### پێناسەی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە:

کۆمەڵەکان لە ئاستی پتەوی و یەکگرتووییاندا جیاوازن، چوونکە هەندێ کۆمەڵە هەن ئەندامەکانی بەرەو پیلی ئەو چالاکییانە دەچن کە ئەنجامی دەدەن و پەیوەندییەکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و دۆستایەتی لەنێوانیاندا هەیە، کۆمەڵەی دیکەش هەن کە دەمەقاڵی و کێشمەکێش و کێبڕکێ تیایاندا زاڵە و پەیوەندییەکانیان هیچ جۆرە خۆشەویستی و دۆستایەتییەکی تیادا نییە. چەمکی پتەوی یەکگرتوویی کۆمەڵە بەچەندان شێوە بەکارهاتووە، کە دەتوانین دابەشی بکەینە سەر دوو جۆر:

جۆری یەکەم: چەمکی پتەوی و یەکگرتوویی بۆ ئاماژەکردن بە لایەنە دیاریکراوەکانی رەفتار و کردەکانی بەکاردەهێنێت، بۆیە پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە لە ژێر تیشکی گیانی مەعنەوی و رووکردنە بزاڤی کۆمەڵە و توانای بەرهەمی کۆمەڵە و چەندان شتی دیکە بەکاردەهێنێت کە پەیوەندیی بە کۆمەڵەوە هەیە.

جۆری دووەم: چەمکی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە بۆ ئاماژەکردن بە هێزی بەکێشکردنی کۆمەڵە لەهەمبەر راکێشانی ئەندامەکانی بەکاردەهێنێت، بۆنموونە: فستنگر و باك وەها پێناسەی دەکەن و پێیانوایە کە (رێژەی مامناوەندیی هێزی بەرهەمهاتوو و کاریگەرە لە ئاراستەکردنی تاکەکانی نێو کۆمەڵە بەرەو کۆمەڵەکانیان).

جیاوازیی نێوان هەردوو جۆریش لەوەدایە کە جۆری یەکەم شیمانەی بوونی پەیوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە و ژمارەی هۆکارەکانی وەك بەرهەمی کۆمەڵە دەکات، ئەمەیش مانای ئەوەیە هەرچەندە پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە پتر ببێت بەرهەمەکەی پتر دەبێت. جۆری دووەمیش شیمانەی ئەوە دەکات کە بە پتەویی و یەکگرتوویی کۆمەڵە هێزی کۆمەڵە بۆ کاریگەری دروستکردن لەسەر تاکەکانی پتر دەبێت، جا ئەگەر هێزی کۆمەڵە بۆ ڕاکێشانی ئەندامەکانی لە هێزی پێویست بۆ دروستکردنی گۆڕان لە ڕەفتاری کۆمەڵە زۆرتر بوو، ئەوا گۆڕان دروست دەبێت، بەڵام ئەگەر هێزی پێویست بۆ دروستکردنی گۆڕان لە هێزی کاریگەر بۆ ئاراستەکردنی تاکەکان زۆرتر بوو، ئەوا گۆڕان دروست نابێت و ڕەنگە خەڵکیش لێی هەڵسنەوە و بێنە دەنگ، وەك بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەم.

## پێوەرەکانی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە:

★ بەکارهێنانەکەی فستنگر و شاختر و باك ١٩٦٠ بۆ ئاماژەکردن بە ئاستی پتەویو یەکگرتوویی کۆمەڵە و هاوڕێیەتیی نێوان تاکەکانی بوو" بۆنموونە: چەند دەرفەتێك دەدرایە ئەندامەکانی کۆمەڵە بۆ ئەوەی هاوڕێیانی خۆیان هەڵبژێرن، دواتر ئامارێك بۆ ڕێژەی سەدیی نێوان ژمارەی هەڵبژاردنەکانی ئەندامەکانی کۆمەڵە و ژمارەی دەرفەتە ڕەخسێندراوەکان دەکرا، بۆنموونە: ئەگەر تاك بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێیەکانی پەنجا دەرفەتی پێدرا و ئەو تاکەش چل کەسی لەنێو کۆمەڵەکە هەڵبژارد و دە کەسیشی لە دەرەوەی کۆمەڵەکە هەڵبژارد، ئەوا ڕێژەی سەدی ٨٠٪ دەبوو، بەم شێوەیە هەرچەندە ڕێژەکە بەرزببوایەوە ئەوا پتر ئاماژەی بە پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵەکە دەکرد، ئەگەر ڕێژەکەیش نزم ببوایەوە ئەوە بەڵگە و ئاماژەیەك بوو بۆئەوەی کە هێزی کۆمەڵەکە بۆ ڕاکێشانی ئەندامەکانی سست و لاوازە.

* دیموك ١٩٣٧ بۆ پێوانی هاوڕێیەتی ڕێنمایەکی دانا بۆ ئەوەی ئاستی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە لەسەر بنەمای حسێبکردنی ڕێژەی سەدی بپێوێ لەنێوان ژمارەی هەڵبژاردنەکان و لەنێوان ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەی کە تاکەکە پەیوەستیەتی و لەنێوان ژمارەی ئەو هەڵبژاردنانەی کە ڕێگەی پێدەدرێت، ئەگەر دە دەرفەتی هەڵبژاردنی پێدرا.

* کۆش شاختر ١٩٥١ پێوەرێکی بۆ هەڵسەنگاندن بەکارهێنا کە لە سێ پرسیار پێکهاتبوو، ئەمەیش بۆ پێوانی ئاستی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە بوو و بریتی بوون لە:

- چەندە ئەو کۆمەڵەیەت خۆشدەوێت کەوا کاری تیادا دەکەیت؟.
- چەندە حەز بە بینینی ئەندامانی کۆمەڵەکەت دەکەیت؟.

* هەروەها یەکێك لە پێوەرەکان بۆ ئاشنابوون بوو بە ئاستی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە و تێکڕای نائامادەیی و ڕێکوپێکی لە ئامادەبوون لە دانیشتن و کۆبوونەوەکانو ڕێکوپێکیی لە بەخشینی پیتاك و ئابوونەکان و هتد.

## ئەو هۆکارانەی کار لە پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە دەکەن:

پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە چەمکێکە و بۆ گوزارشتکردن لە دیاردەیەکی دیاریکراو بەکاردێت و تەنها بەبوونی کۆمەڵەکانیشەوە بوونی خۆی دەسەلمێنێ، چوونکە کاتێ کۆمەڵە ئەندامەکانی خۆی ڕادەکێشێت ئەم ڕاکێشانە لەسەر دوو هۆکار بەندە کە وابەستەی کۆمەڵەکەیە بەتایبەت کاتێ کۆمەڵە دەبێتە جێگەی تێرکردنی لایەنەکانی تاك و وەدیهێنانی پێداویستییەکانی، ئەو هۆکارانەش پەیوەندیی بە کۆمەڵەوە هەیە کاتێ کۆمەڵە دەبێتە ئامرازێکی وەدیهێنانی پێداویستییەکانی تاك، بەو مانایەی بۆ گەیشتن بە ئامانج لە دەرەوەی هەمان کۆمەڵەدا یارمەتیی دەدات.

ڕەنگە تاکیش پەیوەستی کۆمەڵەیەك ببێت و کۆمەڵە پتر بەرەو خۆی بەکێشی بکات، چوونکە:

- چەند کەسێکی تیادا دەبینێتەوە کە حەز دەکات مامەڵەیان لەگەڵدا بکات و هاوڕێیەتییان لەگەڵدا دروستبکات.

- کۆمەڵە چەندان چالاکی و بزاڤێك دەکات کە تاکەکە حەزی پێدەکات و حەز دەکات ئەنجامی بدات.

- کۆمەڵە هەوڵی وەدیهێنانی ئەو ئامانجانە دەدات کە ڕێزیان لێدەگرێت و باوەڕی بە زەروورەتی وەدیهێنانیان هەیە.

* هەروەها رەنگە تاکێك پەیوەستی کۆمەڵەیەك ببێت و کۆمەڵەکە بەشێوەیەکی بەتین بەرەو لای خۆی بەکێشی بکات چوونکە چەند دەرفەتێکی بۆ رەخساندووە بۆ ئەوەی لە دەرەوەی کۆمەڵەکەدا پێداویستییەکانی بهێنێتەدی، وەك:

- بەهۆی پەیوەستبوونی بەو کۆمەڵەیەوە رێز و حورمەتی خەڵکانی دیکە بەدەستبهێنێ (کۆمەڵەی ئاینی یان سیاسی).

- چوونکە تەقلیبوون و چوونە نێو ریزی کۆمەڵە ئاسایش و دڵاراممییەکی زۆر و سامان و کارە دڵخوازەکەی بۆ هێناوەتە دی.

جا پرسیارەکە ئەوەیە کاتێ راکێشانی تاکەکان لەلایەن کۆمەڵەکەوە ببێتە ئامرازێکی وەدیهێنانی پێداویستییەکانی تاك و وەدیهێنانی ئامانجەکانیان چی روودەدات؟ ئایا ئاست و هێزی ئەو بەکێشکردنەی تاك لەلایەن کۆمەڵەوە دادەبەزێت یانیش لە ئاستی جارانی خۆی دەمێنێتەوە ؟ بۆ ئەم پرسیارە دوو وەڵام هەیە:

وەڵامی یەکەم: هەندێ کەس پێیانوایە ئەو بزاڤ و چالاکییەی کە هۆکارێکی تێرکردن و وەدیهێنانی پێداویستییەك یان ئامانجێك بوو، خودی خۆی دەبێتە ئامانجێکی سەربەخۆ، بەو مانایەی ئەو رەفتارەی کە دەبووە هۆی وەدیهێنانی ئامانجێك، تەنانەت دوای وەدیهێنانی ئامانجەکەش تاك تیایدا بەردەوام دەبێت و ئەمجارە خودی خۆی دەبێتە ئامانج.

وەڵامی دووەم: هەندێ کەس بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بەکێشکردنی تاك لەلایەن کۆمەڵەوە بە ئاستێکی زۆر بەو دەرفەتانە کاریگەر دەبێت کەوا کۆمەڵە پێشکەش بە تاکەکانی دەکات جا بۆ وەدیهێنانی پێداویستییەکانیان بێت یانیش بۆ وەدیهێنانی ئەو

ئامانجانەی هەوڵی بۆ دەدەن، جا ئەگەر ئەم دەرفەتانە کەم بوونەوە ئەگەری ئەوە هەیە ئاستی بەکێشکردنی ئەندامان لەلایەن کۆمەڵەوە کەمتر ببێتەوە.

زۆر توێژینەوە هەن ئەو هەلومەرجانەیان روونکردووەتەوە کە دەبنە هۆی پترکردنی هێزی بەکێشکردنی کۆمەڵە بۆ ئەندامەکانی، ئەوانیش:

* توێژینەوەی (کیلی ١٩٥١): هەرچەندە پێگە و پلەی تاك لە کۆمەڵەدا بەرزتربوویەوە، یان هەرچەندە دەرفەتی ئەوەی پتر بێتە پێش کە لە کۆمەڵەدا بگاتە پۆست و پێگەی بەرز، ئەوا هێزی بەکێشکردنی کۆمەڵە بۆ راکێشانی ئەندامەکە پتر دەبێت.

* توێژینەوەی (ریتز ١٩٥٩): هێزی بەکێشکردنی کۆمەڵە پتر دەبێت هەرچەندە درك و هەستی تاك پتر بوو بەوەی کە جێگەی پەسندکردن و رێزی کۆمەڵەکەیە.

* توێژینەوەکەی (دویش ١٩٤٠) هەرچەندە هاوکاری لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵە پتر بوو و کێبڕکێی نێوانیان کەمتر بوویەوە، ئەندامەکان پتر یەکتریان خۆشدەوێت و هەوڵەکانی کاریگەری دروستکردن لەسەر یەکتری و ئاستی پەسندکردنی یەکتریش پتر دەبێت.

* توێژینەوەکەی (ریڤین ١٩٥٧) هەرچەندە درککردنی تاك لەهەمبەر ئامانجەکانی کۆمەڵە و شێوازی بەکارهاتوو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان روونتر بوویەوە، رۆڵ و پێگەی خۆیشی لەنێو کۆمەڵەکەدا بۆ روونبوویەوە، ئەوا کۆمەڵە پتر دەتوانێت ئەندامانی بۆ خۆی رابکێشێت.

* توێژینەوەکەی (بوفاروا): هەرچەندە کارلێکی نێوان ئەندامان پتربوو ئەوا پتەوی و یەکگرتووییان پتر دەبێت، هەروەها چەند هۆکارێك هەن دەبنە هۆی سستی و لاوازیی

پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە و دابەزینی هێزی بەکێشکردنی کۆمەڵە لەهەمبەر تاکەکانی، هۆکارەکانیش ئەمانەن:

- ئەگەر هاتوو کۆمەڵە هۆکار و ئامرازی وەبیرهێنانەوەی هەستوسۆزە ئازاربەخشەکانی تاك بوو.

- ئەگەر تاکەکەس هەستی کرد لە رووی پێگە و شوێنی کۆمەڵایەتییەوە لە خەڵکانی دیکە نزمترە یان کۆمەڵەکە خستبێتیە بەر چەند هەڵوێستێك کە تیایدا شکستی خواردبێ.

- ئەگەر داوای ئەنجامدانی هەندێ کار لە تاك کرا کە لەسەرووی توانای خۆی بێت یانیش لەگەڵ تواناکانی نەگونجێت، یانیش لەسەرووی تواناکانی خۆی بێت.

- هەرچەندە کۆمەڵە قەبارەکەی گەورەتر بوو، جیاوازیی نێوان ئەندامەکانی لەرووی حەز و خولیا و ئاراستەگرییەکان و گرنگیدانەکان و ئاستی هەوڵی وەگەڕخراو بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵە پتر دەبێت، ئەمەیش کاریگەریی لەسەر رادەی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵەکە دەبێت.

## جیاوازیی لەنێوان کۆمەڵەکان لەشێوەی تۆڕەکانی پەیوەندی

هەندێ کۆمەڵە هەن رێگە بەتاك دەدەن تەنها لەگەڵ ئەو کەسانەدا پەیوەندیی راستەوخۆ بگرێت کە لە ریزبەندیدا لە خوار خۆی یان لەسەرووی خۆیدان، هەندێ کۆمەڵەی دیکەش هەن رێکخستنەکەیان لە دەوری کەسێك یان دووکەس دەخولێتەوە کە کەوتوونەتە چەقی پەیوەندییەکە و ئەو زانیاریانەیان پێشکەش دەکەن کە داوای دەکەن. هەندێ کۆمەڵەی دیکەش هەن کە رێکخستنەکەیان نافەرمیە بەشێوەیەك رێگە

بە گشت تاکەکان دەدات لەگەڵ یەکتریدا زانیارییەکان بگۆڕنەوە. ڕەنگە ڕێکخستنیش وەها لە هەندێ تاك بکات هەست بەوە بکەن پێگە و شوێنی گرنگ لە کۆمەڵەکەدا داگیردەکەن و هەندێکی دیکەش هەست بەوە دەکەن کە کەوتوونەتە پەراوێزی کۆمەڵەوە.

هارۆڵد لیڤین بۆ شرۆڤەکردنی تۆڕە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندی و کاریگەریی هەریەکێکیان لەسەر ڕەفتاری ئەندامەکان ئامرازێکی نوێی داهێناوە و نەخشەی بۆ چەند هەڵوێستێکی ئەزموونی داناوە بەشێوەیەك کۆمەڵەکان لە پێنج ئەندام پێکدێن و پەیوەندییان لەنێواندا هەیە، ناوبراو هەوڵدەدات ژمارەیەك لەو گرفتانە چارەسەر بکات کە چارەسەرەکەی پێویستی بە بڕێك زانیاری و دواتریش ئاڵوێرکردنی ئەو زانیاریانە هەیە لەنێوان گشت ئەندامەکان، کۆمەڵەکانی خۆی لەسەر چوار جۆری پەیوەندی ڕێکخستووە، ئەوانیش

| بازنە | ڕاستە هێل | پیتی Y | و | پیتی X |
|---|---|---|---|---|
| ∘ | ــــــــ | X | | Y |

لە جۆرە بازنەییەکەدا مافی هەر ئەندامێکە تەنها زانیاری لەگەڵ دووکەسەکەی لای ڕاست و چەپی خۆیدا ئاڵوێر بکات. لە جۆرە ڕاستە هێڵەکەشدا هەمان بنەمای پێشووی بەسەردا پیادە دەبێت تەنها کەسەکانی تەنیشتەکان پەیوەندیی بە یەك لاوە دەکەن. لەجۆری Y دا ئەو ئەندامەی دەکەوێتە لای مەڵبەندی ڕێکخستنەکە بەسەریدا دەسەپێندرێ ببێتە سەنتەری زانیارییەکان. لە چەشنی Y شدا ئەو کەسانەی دەکەونە لایەکانەوە تەنها پەیوەندی بەو ئەندامەوە دەکەن کە دەکەوێتە سەنتەرەکەوە و ئەویش بە ڕۆڵی خۆی زانیاری لەگەڵ گشت ئەندامەکانی کۆمەڵەکەدا ئاڵوێر دەکات.

لەم تاقیکردنەوەیەی پێشوودا ئەوە بەدیاردەکەوێت بازنە و راستە هێڵەکە لەو رێکخستنانەیە کە کارامەیی زۆر کەمە، بەڵام لەکاتی هەڵەکردن لە رێکخستنی بازنەییدا، ئەوا راستکردنەوەی لە گشت جۆرەکانی دیکە ئاسانترە و بۆ فێربوونی پەیوەندییەکان دەرفەتی زۆر بۆ گشت ئەندامان رێکدەخات و لە کارکردنیشدا گەورەترین دەرفەتی سەربەخۆیی بۆ ئەندامان دەرەخسێنێ و هەست ناکەن چەند پۆست و پێگەیەکی رووکەشانەی پەراوێزییان داگیرکردووە.

لە تاقیکردنەوەیەکی دیکەی (فرنچ) دا ئەوە بەدیاردەکەوێت کە رێکخستنی کۆمەڵە کاریگەریی بەسەر رەفتاری تاکەکانیدا هەیە، بۆیە توێژینەوەیەکی لەسەر جیاوازیی نێوان دوو کۆمەڵە کرد کە یەکێکیان رێکخراو بوو و یەکتریان دەناسی، کۆمەڵەکەی دیکەش لە رووی چۆنیەتیی کاردانەوەی لەهەمبەر بێهیواییدا نا رێکخراو بوو لەو کاتەی چارەسەری هەندێ گرفتی دەکرد. رێکار و رێنماییەکانی ناوبراو بریتیبوو لەوەی کە هەر کۆمەڵەیەک وەک گروپێکی یەکگرتوو کار بکات، چوونکە گرفتەکان و چارەسەرکردنەکانیان پێویستی بە هاوکاریی نێوان تاکەکانی کۆمەڵەکە هەبوو، لەم توێژینەوەیەدا ئەوە بەدیارکەوت کە کۆمەڵە نا رێکخراوەکە گرنگی و پەرۆشیی خۆی لەکاردا لەدەست دەدات و دادەپچڕێت کاتێ شکست دەهێنێ و دەبێتە چەند کۆمەڵەیەکی بچووکتر یان دەبنە چەند جووتە کەسێک بۆ ئەوەی سەرقاڵی گرفتەکە بنەڕەتییەکە یان گرفتە نوێیەکە بن کە لەهەڵبژاردنی خۆیەتی و پەیوەندی بەو گرفتە نییە کە دەبوایە چارەسەر بکرابوایە، لە کاتێکدا کۆمەڵە رێکخراوەکە پاڵی پێوە دەنان کارێک بکەن کە لە تاقیکردنەوەکەدا وەک داواکاری بەسەریاندا سەپێندرابوو هەروەها حەزێکی بە کۆمەڵیشیان هەبوو لەوەی کە وەک گروپێک لەچارەسەرکردنی ئەو

گرفتانەدا بەباشی رەفتار بکەن کە رووبەڕوویان دەبوویەوە، بۆماوەیەکی زۆرتریش هەوڵی خۆیان لەسەر چارەسەرکردنی گرفتەکاندا چڕ دەکردەوە، هەرچەندە هەندێ گرفت و ناکۆکییان هەبوو لەوکاتەی لە چارەسەرکردنی گرفتەکاندا هەستیان بە بێهیوایی دەکرد، بەڵام چوونکە لەنێو هاوڕێیانی خۆیاندا بوون بۆ گوزارشتکردن لە خودی خۆیان هەستیان بە سەربەستییەکی پتر دەکرد. تێبینیی ئەوە دەکەین کە هەستی خۆشەویستی و دۆستایەتیی نێوان تاکەکانی کۆمەڵە ڕێکخراوەکە حەز و گوڕوتاوی خۆی بۆ سەرکەوتن پاراست و وەهای لێکردن وەك گرۆپێکی کار بەردەوام بن هەرچەندە تەنگوچەڵەمەیەکی زۆریان هەبوو وەك کەمیی نەرمی و خۆگونجاندن و بێهیوایی و مەترسی.

## پێکهاتەی دیموکراسی و ئۆتۆکراتیی کۆمەڵەکان

توێژینەوەکان رووپانکردە شەنوکەوکردنی کاریگەریی جیاوازیی نێوان کۆمەڵەکان لە رووی پێکهاتنی لەسەر رەفتاردا، لەوانە توێژینەوەکەی (لیڤین و هوایت) بوو بۆ بەراوردکردنی رەفتاری منداڵان لە تەمەنی یانزە ساڵی لە کەش و دەوروبەرە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان بەو مانایەی کاتێ سەرۆك و سەرپەرشتیارانی ئەو منداڵانە لە رووی شێوازی کارکرد و رۆڵگێڕانیان جیاواز دەبن.

لە کەش و ژینگە دیموکراسیەکەدا سەرپەرشتیارەکە گشت فێرخوازانی بانگدەکرد و رێژەی کات و سەرچاوە بەردەستەکانی بۆ راڤە دەکردن و پرسیاری لێدەکردن کە ئاخۆ حەز بە ئەنجامدانی چ کارێك دەکەن، هەروەها خۆی بە ئەندامێکی کۆمەڵەکە دەزانی و کاری لەگەڵ دەکردن و لە دانانی پلانەکانیشدا لەگەڵیان بەشدار دەبوو.

بەڵام لە کەش و ژینگە داپڵۆسێنەرەکەدا سەرپەرشتیارەکە کۆمەڵێك فێرخوازی بانگدەکرد بۆئەوەی ئەو شتانەیان بۆ وەسفبکات کە دەبوایە ئەنجامی بدەن، هەروەها چۆنیەتیی ئەنجامدانی کارەکانیشی بۆ راڤە دەکردن، زۆر بەوردی و چاوی کراوەوە تێبینیی منداڵەکانی دەکرد بۆ ئەوەی لەگشت هەنگاوێکدا فەرمانیان بەسەردا بکات بۆیان روونبکاتەوە بەچ شێوەیەك رەفتار بکەن.

لە دەرەنجامەکاندا ئەوە بەدیارکەوت کە سیستمی داپڵۆسێنەر دەبێتە هۆی بڵاوکردنەوەی رکابەری و دوژمنایەتی و رقوکینە ئاراستەی قۆچەکانی قوربانیی نێو کۆمەڵەکە دەکرایەوە نەك خودی سەرپەرشتیارەکە، هەروەها کۆمەڵە داپڵۆسێنراوەکە بەکەمیی گورِوتاو و متمانەکردن بە سەرپەرشتیارەکە دەناسرایەوە، سەرکردە داپڵۆسێنەرەکەیش چەق و سەنتەری گەیاندنی زانیارییەکان بوو. لە کاتێکدا سیستمی دیموکراسی کارێکی وەهای کردبوو کەوا کۆمەڵەکەی لە ئاڵوێرکردنی زانیارییەکاندا پشکێکی مەزنتری هەبێت و بە رێژەیەکی زۆرتریش ئەو دەستەواژانەی تیادا بەکاردەهات کە جێناوی (ئێمە) یان تیادابوو و رێژەیەکی زۆرتری ئەو پێشنیارانەشی تیادا پێشکەش دەکرا کە پەیوەندییان بە سیاسەتی کۆمەڵەکەوە هەبوو و لەهەمبەر سەرکردەشدا ئاستێکی بەرزتری خۆشەویستی و سۆزی تیادا دەبینرا.

# کۆمەڵەکانی مەرجەعی و پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە

ڕەفتار بە چەندان ڕێگەی جۆراوجۆر و پلەی جیاواز بە تاکەکانی دیکە کاریگەر دەبێت، چوونکە تاك بەر لەوەی بڕیارێك بدات زۆربەی جار ڕەچاوی ئەو شتە دەکات کە دەیکات و دەیڵێت یان بیروڕای خەڵك و کۆمەڵەی دیاریکراو لەبەر چاو دەگرێت. ئەم بڕیار و گرنگیدانەی تاك بە ڕاوبۆچوونی ئەو کەس و کۆمەڵانە سەرگەی باسەکەی ئێمەیە کە بریتییە لە چەمکی کۆمەڵەی مەرجەعی Reference Group.

کۆمەڵەکانی مەرجەعی بە دوو ڕێگەی سەرەکی کاریگەریی لەسەر ڕەفتاردا دەکەن، ئەوانیش:،

یەکەم: ئاستەکانی بەرتەمایی (طموح): بۆ نموونە ئەگەر کەسانی دیکەی کۆمەڵەی مەرجەعیی تاکەکە (بۆنموونە هاوسێ) لە کەسەکە دەوڵەمەندتر و بەناوبانگتر و کارامەتربوون، ئەوا تاکەکە لە ئاستی خۆی ڕازی نابێت، ڕەنگە هەوڵ بدات بگاتە ئەو شتانەی کەوا خەڵکانی دیکە پێی گەیشتوون، هەستکردنیشی بە بێبەشبوون دەدرێتەوە پاڵ ئەو کۆمەڵەیەوە.

دووەم: جۆرەکانی ڕەفتار: کۆمەڵەکانی مەرجەعی چۆنیەتیی بەکارهێنانی سامان و ناوبانگ لەلایەن تاك و جۆرەکانی دیکەی ڕەفتار دیاریی دەکات، هەروەها شتە بڤە و قەدەغەکراوەکانیش دیاریی دەکات، ڕەنگە توانای ئەوەیشی هەبێت کە تاکەکە لە کۆمەڵەکە وەدەربنێت.

ئەم دوو جۆرە کاریگەرییە هاوبەشییەکی زۆریان لەنێواندا هەیە، هەردووکیشیان لەخۆگری درککردنێکی دیاریکراوە لەلایەن ئەو تاکەی کە سەر بە کۆمەڵە تایبەتمەندییە مەرجەعییەکەیە کە ڕەنگە پێی بناسرێتەوە و لەوانەشە پێی نەناسرێتەوە، هەروەها هەردووکیان لە ڕووی دەروونییەوە لەخۆگری پاداشت و سزان.

کاریگەریی کۆمەڵەی مەرجەعی لەسەر بڕیاری تاکەکان بەندە بە چەندان هۆکاری تێکچڕژاوەوە کە هەندێکیان پەیوەندییان بە تاکەکەوە هەیە، وەك: هەستکردن و نەکردن بە ئاسایش لەهەمبەر ئەوشتانەی پەیوەندییان بە کۆمەڵەکانی مەرجەعی و درککردنی هەڵوێستی ئەو کۆمەلانەوە هەیە سەبارەت بە جۆرەکانی رەفتارە پێشبینیکراوەکان و ئاراستەکانی هەمبەر بابەتە دیاریکراوەکان و ئاستی زانینی ئەو بابەتەی کەوا بڕیاری لەبارەوە دەدرێت، هەندێ هۆکاری دیکەش پەیوەندییان بەو بابەتەوە هەیە کەوا بڕیاریان لەبارەوە دەدرێت.

چەمکی کۆمەڵەی مەرجەعی بەم شێوەیە هەندەی نەماوە ببێتە ئەمری واقیع و گشت خەڵك لەسەری کۆك بن ، بەلام دەروونناسیی کۆمەلایەتی گرنگیی بە دیاریکردن و شیکردنەوەی ئەو شتانە دەدات کە پەیوەندییان بەچەمکی ئەو گرفتانەوە هەیە بەشێوەیەك کە بتوانرێ لە هەڵوێستی دیاریکراودا سوودی لێوەربگیرێت.

## جۆرەکانی کۆمەڵەکانی مەرجەعی

چەندان جۆری کۆمەڵە هەن کە تاك لەکاتی هەڵسەنگاندن و هەموارکردنەوەی رەفتاری خۆیدا بۆیان دەگەڕێتەوە، لەوانە:

١- ئەو کۆمەڵە ئەندامییانەی کە تاك بەشێوەیەکی راستەقینە پەیوەستیانە، ئەم کۆمەلانەیش ئەمانە دەگرێتەوە:

أ) کۆمەڵە بچووکەکانی رووبەڕووبوونەوە کە پەیوەندیی راستەقینە تیایاندا بەرقەرارە، وەك: خانەوادەکان و رێکخراوەکان، جا ئەگەر رێکخراوەکانی کارین، یانیش رێکخراوەکانی ئاینی و کۆمەلایەتی و سیاسی.

ب) ئەو کۆمەلانەی تاك پەیوەستیانە بەبێ ئەوەی لەخۆگری هاوکاریی (زمالە)ی راستەقینەی کەسی بێت (وەك ئەندامیەتی لە کۆمەڵەی هەرەوەزی بەبێ ئامادەبوون لە کۆبوونەوەکانی)، رەنگە ئەم کۆمەلانەی دوایی لەهەمان جۆری کۆمەڵەکانی پێشوو بن،

بەڵام تەنها لەوەدا لەگەڵی جیاواز بێت کە هاوکاریی کەسی و رووبەڕووبوونەوە و یەکتربینینی تیادا نەبێت.

٢- ئەو گروپ و دەستەوتاقمانەی کە تاك بەشێوەیەکی خۆکارانە و بەهۆی تەمەن و رەگەز و رۆشنبیری و کەلتووری و دۆخی هاوسەرگیرییەوە پێیانەوە پەیوەستە، ئەم پەیوەندییە بەکۆمەڵەی مەرجەعی چەمکی رۆڵ لەخۆی دەگرێت، بۆنموونە بەر لەوەی تاك کارێکی دیاریکراو ئەنجام بدات ئەوە رەچاو دەکات کە ئاخۆ ئەم کارە (وەك پیاوێك یان وەك خوێندەوارێك و کێخوا و کەسێکی بەتەمەن، یان هەر کۆمەڵەیەکی دیکەی دیاریکراوی رۆڵەکان) لەگەڵی دەگونجێت.

٣- کۆمەڵەکانی پێشنیارکراو یان چاوەڕوانکراو، بۆنموونە ئەگەر تاکێك حەز بە ئەندامیەتی کۆمەڵەیەك بکات کە پێشتر ئەندام و پەیوەستی نەبووە، ئەگەری ئەوە هەیە تاکەکە بۆی بگەڕێتەوە یانیش لەکاتی بڕیارداندا خۆی بە پێوەرەکانی بەراوردبکات، پتر لەو ئەگەرەی بگەڕێتەوە بۆ پێوەری ئەو کۆمەڵەیەی کەوا بەڕاستی ئەندامیەتی و پێیەوە پەیوەستە و حەز دەکات بەجێی بهێڵێ، وەك ئەو جووتیارە هەژاریەی کە حەز بەوە دەکات پارچە زەوییەك ببێتە موڵکی، یان ئەو کەسەی بۆ پۆستی نوێنەرایەتی و ئەندامیەتی کۆمەڵەیەك پاڵێوراوە، یان هەندەی نەماوە بچێتە حەج.

٤- رەنگە کۆمەڵە مەرجەعییەکە نەرێیی بێت، ئەویش لەو کاتەی کە هەندێ کات تاك خۆی لە ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو بە دوور دەگرێت کە پەیوەندیی بەو کۆمەڵەیەوە هەیە(جا ئەگەر تاکەکە بەڕاستی ئەندامی بێت و پێی وابەستەبێت یانیش بەپێچەوانەوە) حەز دەکات لێی جیابێتەوە، بۆنموونە: وەك ئەو رەبەنانەی کە بەرەو ژیانی هاوسەری هەنگاو دەنێن و ئەو گوندنشینانەی حەز دەکەن گوند بەجێبهێڵن.

# کارلێکی کۆمەڵایەتی

کارلێکی کۆمەڵایەتی بە چەمکێکی سەرەکیی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دادەندرێت، چوونکە گرنگترین لایەنی پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و شیاندنی کۆمەڵایەتییە، کارلێکی کۆمەڵایەتیش کۆمەڵێك پێشبینیی لەلایەن کەسانی بەشداربووی نێوی لەخۆ دەگرێت.

هەروەها کارلێکی کۆمەڵایەتی درککردنی رۆڵی کۆمەڵایەتی و رەفتاری تاك لەخۆ دەگرێت لەژێر تیشکی ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتیانەی کە رۆڵە کۆمەڵاتییەکەی و رۆڵی خەڵکانی دیکەش دیاریی دەکات.

## چەمکی کارلێکی کۆمەڵایەتی

سواسۆن وەها پێناسەی کارلێکی کۆمەڵایەتی دەکات بەوەی کە : ئەو کردەیەیە کە ئەندامەکانی کۆمەڵە لە رووی ئەقڵی و پاڵنەری و پێداویستی و حەز و ئامرازەکان و مەبەستەکان و زانیارییەکان بەیەکتری دەبەستێتەوە.

هەروەها بەشێوەیەکی جێبەجێکاریش وەها پێناسەی کارلێکی کۆمەڵایەتی دەکات کە ئەو شتەیە لەکاتی پەیوەندیی نێوان دووکەس یان پتر روودەدات و بەهۆیەوە رەفتار دەستکاری دەکرێت و هەموار دەکرێتەوە.

هەروەها سەعد جەلال وەها پێناسەی کارلێکی کۆمەڵایەتی دەکات بەوەی کە پەیوەندیی ئاڵوێرکراوی دوو لایەنەی نێوان دووکەس یان پترە کە رەفتاری هەر یەکێکیان بەوی دیکە بەندە، یانیش رەفتاری گشتیان بە رەفتاری خەڵکانی دیکەوە بەندە.

چەمکی کارلێکی کۆمەڵایەتی بۆ ئاماژەکردن بە کاریگەریی ئاڵوێرکراوی دوولا (دووکەس یان دوو کۆمەڵەی بچووك یان تاك و کۆمەڵەیەکی بچووك و گەورە) بەکاردێت و هەر یەکێکیشیان کاریگەریی بەسەر رەفتاری ئەوی دیکە دەبێت.

چەمکی کارلێکی کۆمەڵایەتی ئاماژە بە کردە ئاڵوێرکراوەکانی دوولایەنی کۆمەڵایەتی دەکات لە هەڵوێست و نێوەندێکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەك کە رەفتاری هەر یەکێکیان وروژێنەر و ئاگادارکەرەوەی رەفتاری لایەنەکەی دیکە دەبێت.

لەو باسەی رابردوودا دەتوانین ئەم تایبەتمەندیانەی کارلێکی کۆمەڵایەتی هەڵبهێنجین:

١- کارلێکی کۆمەڵایەتی بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ئاراستە کراوە.

٢- گشت تاکێك رۆڵ و بەرپرسیاریەتیی خۆی ئەنجام بدات.

٣- گشت تاکێك لەمیانی کارلێکی کۆمەڵایەتییەوە بە تاکیەتی و کەسێتیی خۆی دەناسرێتەوە.

## مەرجەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی

١-ئاڵوێرکردن مەرجی سەرەکیی روودانی دیاردەی کارلێکی کۆمەڵایەتییە،بەبێ ئاڵوێرکردنیش رەفتار یان کاریگەر دەبێت یان کارلێکراو، هەردوو کاریگەریەکەش مانای کارلێکی کۆمەڵایەتی نییە، بۆنموونە کاتێ تۆ رێنمایی و رێکار دەبەخشیت یانیش وەریدەگریت، کاتێ قسە بۆ کۆمەڵەیەك دەکەیت، یان گوێ لە وانەیەك رادەگریت، لەوکاتەی ئاماژە بەوانەی دوای خۆت دەبەخشیت کە بە ئوتومبێلەکەت بەرەو لای چەپ بسوڕێیتەوە، یان ئاماژەیەك لە ئوتومبێلی دیکە وەردەگریت بەوەی کە دەیەوێ بە پێشت بکەوێت. تۆ لەم هەڵوێستەدا لە هەڵویستی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا نیت. بەڵکو کارلێك لەو کاتەدا دروست دەبێت کە رێوشوێن دەبەخشیت و کەسی وەرگر گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات و داوای روونکردنەوە و هەموارکردنەوە دەکات، کاتێکیش گوێ لە وانەیەك رادەگریت راوبۆچوونی خۆت لەبارەی خاڵێکی وانەکە دەدەیت، یان داوای روونکردنەوەی پتر دەکەیت.

٢- بەردەوامبوون مەرجی سەرەکیی رووداني دیاردەی کارلێکی کۆمەڵایەتییە، چوونکە بەبێ بەردەوامبوون هەڵوێستە رەفتارییەکە کار و کاردانەوە، یان هۆ و ئەنجام دەبێت لەیەك ئاراستەدا. مەسەلەکەش تەنها بەند دەبێت بەو کەسەی کە ئاگاداری و ورووژانێك وەردەگرێت و وەڵامی دەداتەوە و کارەکەیش لەم ئاستەدا دەوەستێت. کەسێك بەیانیان سڵاوت لێدەکات و تۆیش وەڵامی دەدەیتەوە.

ئاڵوێرکردن و بەردەوامیش بەیەکەوە بەستراون و بەبێ ئاڵوێرکردنی رەفتاریش بەردەوامی نایەتەدی و بەبێ بەردەوامیی رەفتاریش ئاڵوێرکردن نایەتەدی.

٣- رووبەڕووبوونەوە: هەروەها مەرجێکی دیکەی پێویست بۆ وەدیهێنانی کارلێکی کۆمەڵایەتی هەیە و بەندە بە ئاڵوێرکردنەوە ئەویش رووبەڕووبوونەوەیە، واتا پەیوەندیی راستەوخۆی نێوان دووکەسی کارلێککەر یان کۆمەڵێك کەسی کارلێککەر، دەبێ ئاڵوێرەکەش بەشێوەیەکی رووبەڕوو بێتەدی.

٤- تێکچڕژان و ئاوێتەبوونی رەفتار: هەروەها بەردەوامی پێویستی بەوە هەیە کە رەفتاری کەسە کارلێککەرەکان ئاوێتەی یەکتری بن بەشێوەیەك رەفتاری یەکێکیان پشت بە رەفتاری ئەوی دیکە ببەستێت و رەفتاری هەر یەکێك ببێتە وەڵامدانەوەی رەفتاری ئەوی دیکە و لەهەمان کاتیشدا ببێتە ئاگادارکەرەوەی. تۆ بە توورەیی وەڵامی رەفتاری هاوڕێیەکەت دەدەیتەوە و توورەییەکەت دەبێتە ورووژێنەری رەفتاری لێبوردەیی هاوڕێیەکەت.

٥- هەماهەنگی و گونجانی ئاڵوێرکراو: مەبەست لە هەماهەنگی و گونجانی ئاڵوێرکراو ئەوەیە کە وەڵامدانەوە و کاردانەوەی کەسەکان لە هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتیدا بەرێگەیەکی ئاسان کامڵ ببێت، بەشێوەیەك ئاڵوێرکردنی رەفتارەکانی نێوانیان وەك یەك خووی فرە رەهەندی کەسێك بێتە بەرچاو، باشترین نموونە بۆ ئەم

مەسەلەیە کە وێنەیەکی روونی ئەم هەماهەنگی و گونجانە ئالۆزکراوە دەداتە دەست، رەفتاری تیپی تۆپی پێیە، ئەم هەماهەنگیەش بە دوو تایبەتمەندی دەناسرێتەوە:

یەکەم: بوونی کۆمەڵەیەکی هاوبەشی پێشبینییەکان لەلایەن گشت کەسێکەوە لەهەمبەر کەسی دیکە.

دووەم: گشت کەسێك رۆڵێکی دیاریکراوی هەبێت و پەیوەندییەکە لەنێوان رۆڵەکان بێت، لەنێوان دایك و کوڕ، سەرکردە و جەماوەر، یان لەنێوان فێرخواز و مامۆستا و نەخۆش و پزیشك و هاوڕێ و هاوڕێ.

## ئامرازەکانی کارلێکی کۆمەلآیەتی

ئامرازەکانی کارلێکی کۆمەلآیەتی لەمیانی نێوەندە جۆراوجۆرەکان دەبێت و دەتواندرێ دابەش بکرێنە سەر:

- ئامرازەکانی واژەیی verbal
- ئامرازەکانی نا واژەیی non- verbal

**یەکەم: ئامرازە کارلێکەرەکانی واژەیی:** زمان بە ئامرازێکی گرنگی کارلێکی کۆمەلآیەتی دادەندرێت، چوونکە زمان قسەی گوتراو و بیستراو دەگرێتەوە و بە دەنگو خێرایی و تۆن و کات و بێدەنگی و گوێگرتن و واژەکان و مانا و هزرەکان کاریگەر دەبێت.

**دووەم: ئامرازە ناواژەییەکانی کارلێککردن:** گشت ئەو شتانە دەگرێتەوە کە وروژێنەر و ئاگادارکەرەوەیەکی رەفتاری جۆراوجۆر پێکبهێنێت و بەشداری لە روودانی کردەی کارلێکی کۆمەلآیەتی و چالاککردنی بکات، هەروەها کۆی شتە نا واژەییەکان

دەگرێتەوە وەك جوولەی جەستە و دەست و پێیەکان و ئامازە و دەنگە نا قسەییەکان و تەوقەکردن.

## قۆناغەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی

ورچر و کۆپەر ئامازەیان بە بوونی ژمارەیەك قۆناغی کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتی کردووە، ئەوانیش:

**قۆناغی یەکەم: قۆناغی یەکترناسین:** هەردوو لا دەستەواژەکانی خۆشخۆیی و بیروڕای سەرپێیانەی نەخشە بۆ نەکێشراو ئاڵوێر دەکەن و گشت لایەکیش هەوڵی ئەوە دەدەن بچنە نێو قووڵایی ژیانی یەکترییەوە و هەوڵی ئاشکراکردن و دیاریکردنی بەها و سوودەکەی دەدەن لەهەمبەر خۆی و ئامانجەکەی، لەمەیشدا پشت بە بنەمای (تێچوون و قازانج و ئاستی گونجان و هەماهەنگی و وێکچوونی هەردوو لا دەبەستێت.

**قۆناغی دووەم: قۆناغی دانوستان و سازشکردن:** گشت لایەك هەوڵی دیاریکردنی جۆری ئەو پەیوەندییە دەدات کە دەیەوێ پێی بگات و لەگەڵ کەسی بەرانبەردا دروستی بکات و بەدوای باشترین دەرەنجام و دەستکەوتی ئەم پەیوەندییەدا دەگەڕێت.

**قۆناغی سێیەم: قۆناغی هەماهەنگی و پابەندبوون:** هەر لایەك لە ڕووی تایبەتمەندیو بەهاوە باوەڕ بە لایەکەی دیکە دەکات، چیدی بەدوای جێگرەوەی دیکە ناگەڕێت و تەنها بەو پەیوەندییە دەست هەڵدەگرێت کە لەگەڵ لایەنەکەی دیکە دروستی کردووە.

**قۆناغی چوارەم: قۆناغی راگەیاندنی پەیوەندی و پتەوکردن و جێگیرکردنی:** ئەو بڕیارانە رادەگەیەندرێن کە گوزارشت لە باوەڕەکان و ئەو پابەندبوونە دەکات کە لایەنەکان لە قۆناغەکانی پێشوودا پێیگەیشتوون بۆ ئەوەی جەخت لەسەر جۆر و چەشنی ئەو پەیوەندییە بکەنەوە کەوا پێیگەیشتوونە و بەهۆی کارلێکەوە وەدیهاتووە.

## هۆکارە کاریگەرەکانی نێو کارلێکی کۆمەڵە

بیلز چوار هۆکاری دیاریکردووە کەوا کاریگەری لە کارلێکی کۆمەڵایەتی دەکات، ئەوانیش:

١. کەسێتیی و رۆڵی ئەو کەسانەی کە لە کردەی کارلێك بەشدارن.

٢. تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی نێوانیان و ئەو رۆشنبیری و کەلتوورە تایبەتەی پێی پەیوەستن.

٣. رێکخستنی پەیوەندییانەی کۆمەڵە، واتا ئەو پێشبینییانەی کە تاکەکان لەبارەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و پێگە و رۆڵەکانیان لەهەمبەر یەکتریدا هەیانە.

٤. سروشتی ئەو گرفتەی رووبەڕووی کۆمەڵە دەبێتەوە، هەروەها ئەو رووداوانەی کە لە گرفتەکەدا هەڵدەقوڵێن بەپێی کارلێکی کۆمەڵەوە دەگۆڕێت و پێشدەکەوێت.

# کردەکانی کۆمەڵایەتی وەك رەهەندێکی کارلێکی کۆمەڵایەتی

ئەم چوار کردەیەی کارلێکی کۆمەڵایەتی بەگشتی لە گشت کۆمەڵگەیەکدا بەدیاردەکەوێت، بەڵام بەشێوەی جۆراوجۆر و جیاواز لە کۆمەڵە جۆراوجۆرەکاندا بەدیاردەکەوێت.




## یەکەم: ململانێ

ململانێ لەو کاتەدا روودەدات کە تاك خۆی لەنێو دوو هەڵوێستی دژ بەیەك دەبینێتەوە و یەکێکیان رەفتارێکی دیاریکراو و ئەوی دیکەشیان داوای رەفتارێك دەکات کە لەگەڵ رەفتارەکەی دیکە ناگونجێت، هەروەها دوو جۆرە پاڵنەری دژبەیەکو ناکۆك دەبنە هۆی پەکخستنی تاکەکەسەکە و نایەڵن بگونجێت.

کەواتە ململانێ لەم دۆخانەی خوارەوەدا روودەدات:

– بوونی تاك لە نێو دوو هەڵوێستی دژ بەیەك کە هەریەکێك لەو هەڵوێستانەش رەفتارێکی دیاریکراوی گەرەکە و دژی یەکترین.

– بوونی دوو جۆرە پاڵنەری ناکۆك و دژبەیەك وادەکات تاکەکە نەتوانێت بگونجێت. ململانێش دەبێتە هۆی دروستبوونی شڵەژان و نیگەرانی و هەڵچوون و دڵتەنگی و ئیفلیجبوونی توانای کارکردن.

جۆرەکانی ململانێ




## ململانێی ناوەکی Intra Personal

★ نزیکبوونەوە– نزیکبوونەوە Approach - Approach : کاتێ تاك رووبەڕووی دوو مەسەلە دەبێتەوە و لەیەك کاتدا حەز بە هەردووکیان دەکات و دەزانێ کە تەنها دەتوانێ یەکێکیان وەدەست بهێنێ.

* خۆ دوورگرتن – خۆ دوورگرتن Avoidance - Avoidance : کاتێ داوا لە تاك دەکرێت کە لەنێوان دوو شتی نەرێنیدا هەڵبژێرێت.

* نزیکبوونەوە – خۆ دوورگرتن – Avoidance Approach: کاتێ تاك رووبەرووی مەسەلەیەك دەبێتەوە کە هەندێ شتی باشی تیادایە و پاڵی پێوەدەنێت هەنگاوی بۆ بنێت، هەروەها هەندێ شتی خراپیشی تیادایە کە لێی دوور دەکاتەوە و خۆی لێ بەدوور دەگرێت.

* دووسەرە یان دوو فاقی – Avoidance Approach Double: کاتێ تاك سەرپشك دەکرێت لەنێوان دوو ئامانجدا کە هەردووکیان باشە و خراپەیان هەیە.

٢. ململانێی نێوان کۆمەڵە و کەسەکان

ئەم جۆرەیان لەو کاتەدا روودەدات کە مەبەست یان شێوازیان لە وەدیهێنانی مەبەستەکەدا دژی یەکتری دەوەستنەوە، یان لەوکاتەی کە مەبەستەکان کۆکن و بیروڕای هەمبەر وەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکان جیاواز و دژبەیەکن و بە پێچەوانەشەوە، بۆنموونە: رەنگە ململانێی نێوان کۆمەڵەکان بەم شێوەیە سەرهەڵبدات: بەندیخانە و یاخیبووەکان، ئامانجی یاخیبووەکان وەدیهێنانی پێویستی و داواکارییەکانیان و سزانەدانیانە بەهۆی یاخیبوونەکە، ئامانجی بەرپرسانیش وەدینەهێنانی داواکارییەکانیان و سزادان و رزگارکردنی بارمتەکانی ژێر دەستی یاخبووەکانە، رەنگە خودی بەرپرسەکانیش ببنە دوو دەستەی دژ بەیەك بەهۆی پەسندکردنی ئامانجەکانیان و جیاوازییان لە شێواز و رێگەکانی وەدیهێنانی ئامانج و داواکارییەکان، چوونکە دەستەیەك هەڵدەکوتنە سەر بەندیخانەکە و بارمتەکان ئازاد

دەکەن، ئەوانی دیکەش دانوستان بەشێوازێکی رزگارکردنی بارمتەکان لەقەڵەم دەدەن.

ململانێی نێوان کۆمەڵەکانیش لەو کاتەدا سەرهەڵدەدات کە خەڵك بەشێوەیەکی گشتی لەهەمبەر کۆمەڵەکەیاندا هەست بە شانازی دەکەن و پێیانوایە کۆمەڵەکەیان لە کۆمەڵەکانی دیکە باشترە. ئەم هەست بە شانازیکردنە کاریگەری بەسەر تاك و رەفتارەکانیان دەکات بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئاخۆ هەستێکە پاساوی خۆی هەیە یانیش هیچ بنەمایەکی رێك و دروستی نییە. لە هەندێ دۆخیشدا دەبینین کە ئەم هەستە لەسەر یەکگرتوویی رایاندەهێنێت و پاڵیان پێوە دەنێت شتی مەزن وەدەستبهێنن و کاری مەزن ئەنجام بدەن، لە هەندێ دۆخی دیکەشدا ئەو شانازیکردنە بە کۆمەڵە لەسەر بنەمای بەراوردکردنی کۆمەڵەکە و کۆمەڵەی دیکە بونیادنراوە، ئەمەیش دەبێتە هۆی کێبڕکێ و ململانێی نێوان کۆمەڵەکان ئەگەر هاتوو بەرژەوەندییەکانیان دژی یەکتری وەستاوەیەوە.

دەتوانین چەند نموونەیەك لەبارەی ململانێ بهێنینەوە، لەوانە ململانێی نێوان نەوجەوانان و کۆمەڵەکانی ئاینی، چەندان توێژینەوە تاوتوێی ئەو بوارانەیان کردووە کە پەیوەندییان بە ململانێی نێوان کۆمەڵەکانەوە هەیە، لە ئەنجامدا ئەوە بەدیارکەوتووە کە هەستی شانازیکردن بە کۆمەڵە لە هەندێ هەلومەرجی دیاریکراودا بووەتە هۆی کێبڕکێ و ململانێی نێوان کۆمەڵە و کۆمەڵەکانی دیکە، جگە لەو توێژینەوانەی کە پەیوەندییان بە لایەنگریی کۆمەڵە و کۆمەڵەکانی دیکە هەیە (پشتگیری و پەیوەستبوونە دوو فاقییەکان)، واتا ئایا تاکێك دەتوانێت پەیوەستبوون و پشتگیریی خۆی بۆ پتر لە کۆمەڵەیەك بپارێزێ. ئایا پشتگیری و پەیوەستبوونی تاك لەهەمبەر یەکێك لەو کۆمەڵانە لە کۆمەڵەکانی دیکە پترە، بۆنموونە: ئەو نەوجەوانەی

سەر بە خانەوادەیەکی دیاریکراوە و پێوەی پەیوەستە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە هەوڵی ئاساییکردنەوەی دەدات، لە هەمان کاتیشدا پەیوەستی کۆمەڵەی هاوڕێیان و دۆستانەو داواکاریی ئەوەیان لێی هەیە کە پابەندی پێوەرەکانی بێت و ئەو ئاراستە و خولیایانە وەربگرێت کە دژی ئاراستە و خولیای خانەوادەکەن، کاتێکیش ئەو ئاراستە و خولیایانە دژی یەکتری بوون رەفتاری چۆن دەبێت؟ ئایا ئەندامیەتی خۆی لە هەردوو کۆمەڵەدا دەپارێزێت و دەتوانێت پشتگیریی خۆی بۆ هەردوو کۆمەڵە بپارێزێت بەبێ ئەوەی یەکێکیان بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵبێت.

چەندان توێژینەوە سەبارەت بە بابەتی پەیوەستبوون و پشتگیریکردنە دوو فاقییەکانەوە ئەنجام دراون و ئەوەیان روونکردووەتەوە کە رەنگە ئەم جۆرە خەڵکە نەتوانن لە هەردوو کۆمەڵەدا سەرکەوتن وەدەستبهێنن. دەرەنجامی توێژینەوەکانی دیکەیش ئەوەیان لێ بەدیارکەوتووە کە تاکەکان بەپێی توانا خۆیان لەگەڵ هەردوو کۆمەڵەدا دەگونجێنن. ئەوەی لە گشت توێژینەوەکاندا سەبارەت بە پرسی ململانێی نێوان کۆمەڵەکانەوە گرنگە ئەوەی بۆمان روونکردووەتەوە کە ئەندامیەتیی تاك لە کۆمەڵەیەکی دیاریکراودا لەرووی ئاراستەکردنی رەفتاردا گرنگیی خۆی هەیە، هەروەها گرنگیی شرۆڤەکردنی ئەندامیەتی تاکی لە کۆمەڵەکان و کۆمەڵە جۆراوجۆرەکاندا روونکردووەتەوە.

ململانێی کۆمەڵایەتیی نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان ئەم شەقڵ و شێوانەی خوارەوە بەخۆیەوە دەگرێت:

### ١. ململانێی کەسی:

ئەم ململانێیەش لەو کاتەدا روودەدات کە کێبڕکێی نێوان دوو کەس هێندە توند ببێت بگاتە ئاستی رق و دوژمنایەتی جا بەهۆیەکی دیاریکراو بێت یانیش هیچ هۆیەکی لەپشتەوە نەبێت، هەردوو لایش بەچەندان ئامراز و هۆکاری بەردەست هەوڵی

لەناوبردن و شکستپێهێنان و ملپێکەچکردنی ئەوی دیکە دەدات. دەتوانین ئەم جۆرە ململانێیە کەسییە لە چەندان بواری جۆربەجۆری ژیاندا ببینین، زۆربەی جاریش خۆپەرستی و خۆویستی و حەزی کۆنترۆڵکردن و هەژموون پەیداکردن و سامان، پاڵنەری سەرەکیی ئەو ململانێیە کەسییانەن.

### ٢. ململانێی سیاسی:

ئەم ململانێیە لە چوارچێوەی یەك کۆمەڵگە و دەوڵەتدا روودەدات، بۆنموونە وەك ململانێی نێوان پارتەکانی سیاسی، ئەم ململانێیەش چەند دیمەنێکی وەك ماوەی پڕوپاگەندە و جنێوەکان و رووبەڕووبوونەوە مەترسیدارەکان لەخۆیدەگرێت. هەروەها رەنگە ململانێیەکە نێو نەتەوەییش بێت، واتا لەنێوان کۆمەڵگە و کۆمەڵگەیەکی دیکە بێت، ئەم ململانێیەش شێوەی هێرشەکانی پڕوپاگەندە و هەڕەشەکردن و ئابلۆقەی ئابووری و بڕینی پەیوەندیی سیاسی و جەنگەکان لەخۆیدەگرێت.

### ٣. ململانێی چینایەتی:

ئەم ململانێیە لەنێو یەك کۆمەڵگەدا و لەنێوان چینە جیاجیاکاندا سەرهەڵدەدات، هەروەها لە چوارچێوەیەکی نێو نەتەوەییشدا بەدیاردەکەوێت. ئەم جۆرە ململانێیە لەئەنجامی هەستکردنی کۆمەڵە و چینێك سەرهەڵدەدات بەوەی کە بەرزتر و پێشکەوتووترە لە کۆمەڵەکەی دیکە و وەها هەست دەکات لە کۆمەڵەکەی دیکە پێشکەوتووترە، بۆیە هەوڵ دەدات کۆنترۆڵی بکات و بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندییە سیاسی و چینایەتییەکانی بەکاریدەهێنێت. ئەم جۆرە ململانێیە دیمەنی شڵەژان و شۆڕشەکان و دەستدرێژی و لێدان و کوشتن و سووتاندن و تاڵانکردن بەخۆیەوە دەگرێت.

٤- ململانێی ئاینی:

ئەمەیش لەنێوان ئەو کۆمەڵە و تائیفانەدا روودەدات کە سەر بە ئاینی جیاجیان، هەروەها هەندێ جاریش لەنێوان ئەو تائیفانەدا روودەدات کە سەر بە یەك ئاینن.

٥- ململانێی نەژادی:

ئەمەیش لە ئەنجامی هەستکردنی نەژادێك بەسەرکەوتن و باشتربوون لە رەگەز و نەژادێکی دیکەدا سەرهەڵدەدات، چوونکە گشت جۆرەکانی توندوتیژی و چەوساندنەوەی لەدژدا بەکاردەهێنێت، ئەم ململانێیە لە شێوە و دیمەنێکی پڕ لە شڵەژان و شۆڕش و خۆپیشاندانەکان و هەندێ جاریش شەڕی ناوخۆیی و دەرەکیی نێوان دەوڵەتاندا بەدیاردەکەوێت، بۆنموونە: ئەو ململانێیەی کە لە باشووری ئەفریقادا باوبوو مۆرکی هەڵاواردنی نەژادیی نێوان رەشپێست و سپیپێستەکانی بەخۆیەوە گرتبوو.

## جۆری ململانێیەکانی نێوان کۆمەڵەکان

★ململانێی دەرەنجام سفر (ململانێی تەواو) Zero- Sum: لەم جۆرە ململانێیەدا قازانجی لایەنێك دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەوی دیکە و بەپێچەوانەشەوە.

* ململانێی پاڵنەر جۆراوجۆر Mulit Motive Situation: لەم جۆرە ململانێیەدا قازانجی لایەنی یەکەم نابێتە هۆی زیانی لایەنی دووەم، زیانی لایەنی یەکەمیش نابێتە هۆی قازانجی لایەنی دووەم.

## دووەم: ڕێکخستنی هاوکاریانە و کێبڕکێیانەی کۆمەڵە

چەند توێژینەوەیەک لەسەر فێرخوازانی زانکۆیەکاندا ئەنجام درا کە (مۆرتۆن دویچ)ی توێژەر ئەنجامی دا و کەشێکی هاوکارانە و کێبڕکێیانەی لەنێو پۆلی خوێندندا دروستکرد و بەگشت فێرخوازانی نێو هەردوو کۆمەڵەکەی ڕاگەیاند لەکاتی ئامادەییان بۆ خوێندنی دەروونناسیی گشتی کە ڕێگە بەشێوەی وانەگوتنەوەی تیۆری نادات، بەڵکو توێژینەوەی چەند دۆخێکی واقیعیان پێشکەش دەکرێت بۆ ئەوەی شیبکەنەوە و گفتوگۆی لەسەر بکەن.

فێرخوازانی تیپە کێبڕکێکارەکە ئەوەیان پێ ڕاگەیەندرا کە لەگشت وانەیەکدا بە ڕیزبەندییەکی سەربەرەو خوار ڕێکدەخرێن، ئەمەیش پێشبینییەکە بۆ ئاستی باشییان لە شیکردنەوەی دۆخەکە و گفتوگۆ لەسەرکردنی، دوا نمرەیش کە بۆ گشت فێرخوازێک دادەنرێت لە کۆتایی مادەکەدا بریتی دەبێت لە مامناوەندیەتی ڕیزبەندی و ڕێکخستنەکانی لە گشت ئەو وانانەدا.

بەڵام بۆ تیپە هاوکارەکە گەورەترین لایەنی دوانمرەی بەند دەبێت بە پلەی باشیی تیپەکە بۆ گفتوگۆکردن و شیکردنەوەی دۆخەکە.

ڕێنماییەکانی پێشوو ئەوەیان ڕوونکردەوە ئامانجی تاک لە کۆمەڵە هاوکار و هەروەزەکە لەگەڵ ئامانجی کۆمەڵەکە دەهاتەوە و سووربوون لەسەر زەرورەتی کارلێککردنی ئەندامان، لەکاتێکدا لە کۆمەڵە کێبڕکێکارەکەدا داوا لە تاکەکان دەکرا هەریەکە و لەپێناو بەرژەوەندیی خۆی کاربکات و ئەوەشیان بۆ ڕووندەکردنەوە هیچ شتێکی دیکەیش سوودیان پێنابەخشێت.

ئەم جیاوازییە لە ڕێنماییەکاندا بووە هۆی جیاوازییەکی گەورە لە کار و هەوڵ و ڕەفتاردا، چوونکە ئەمەی خوارەوە ڕوونبوویەوە:

کۆمەڵە هاوکارەکە ڕێژەیەکی زۆرتری هزر و بیری بەرهەم دەهێنا و کوالیتیەکەیشی باشتر بوو، ئەندامەکانیشی لەنێوان یەکتریدا توانایەکی زۆرتریان بۆ پایەداریی و ڕەسەنایەتیی هزری هەبوو و لە کارکرد و هەوڵی کۆمەڵەکەیش رازیتر بوون. هەروەها ئەوەیش ڕوونبوویەوە کە ڕێکخستنی ڕۆڵ و دەورەکان لەنێوان هەردوو کۆمەڵەدا جیاواز بووە، چوونکە ژمارەیەکی زۆرتری ئەندامانی گروپە هاوکارەکە دەستیان بە ڕێکخستنی گفتوگۆ و وەدیهێنانی ڕەگەزی کامڵبوون دەکرد.

کۆمەڵەی دووەمیش: بەوە ناسرایەوە کە بوار و دەرفەتێکی زۆری تیادایە و تاکەکان هەوڵی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵەکەیان دەدا و هەوڵیان دەدا دان بەهەوڵ و تواناکانیان بنرێت و ڕێزیان لێبگیرێت.

لەم باسەی رابردوودا دەبینین تایبەتمەندیی کەسێتیی ئەندامەکان لە بۆنە دەستەجەمعییەکاندا ڕۆڵێکی سەرەکی لە دیاریکردنی ڕەفتارەکاندا دەبینێت و ئەوەیش ڕووندەبێتەوە کە ڕەفتار لە زانکۆیەکاندا بەو کەشە کۆمەڵایەتییە کاریگەر دەبێت کە ڕێکخستنی کۆمەڵە دەیهێنێتە ئاراوە و ڕێکخستنەکانی بەکۆمەڵیش ئەو هەستەی تاک پتر دەکات بەوەی کە پێگە و شوێنێك لەنێو کۆمەڵەکەی داگیر دەکات و هانی سەربەستیی و بەردەوامیی هزری دەدات و بۆ گشت ئەندامێکیش دەرفەتی ئەنجامدانی ڕۆڵە خۆش و سەرنجڕاکێشەکان دەڕەخسێنێ لەپێناو وەدیهێنانی بەرژەوەندیی هاوبەشدا.

## ١. كێبڕكێ Competition

كردەیەكە كە لە سەرگەی ئەوەوە جۆری دابەشكردن و پێشكەوتن لە كۆمەڵگەدا دیاری دەكرێت. كێبڕكێ كردەی ململانێی ئاڵۆزكراوی نێوان تاكەكان و كۆمەڵەكان لە خۆ دەگرێت بۆ گەیشتن بە مەبەستێكی دیاریكراو. كێبڕكێ هەوڵی گشت تاك و كۆمەڵەیەكە بۆ وەدەستهێنانی گەورەترین پشكی شتە دیاریكراوەكان، بۆنموونە فێرخوازان لەسەر چوونە زانكۆ كێبڕكێ دەكەن، دەوڵەتانیش لەسەر ئەو شوێنانەی جیهان لە كێبڕكێدان كەوا سامانێكی زۆری سروشتیی تیادایە.

كەواتە كێبڕكێ دیمەنێكی كۆمەڵایەتیانەی كردەی كارلێككردنی نێوان تاكەكان و كۆمەڵەكانە سەبارەت بە شتە دەگمەنەكان، چوونكە دەگمەنیی شتەكان سەرچاوەی كێبڕكێیە.

كێبڕكێ شەقڵ و تایبەتمەندییەكی سەرەكیی كارلێكی كۆمەڵایەتییە و چەشنێكی سروشتیی رەفتاری مرۆیی و هۆكارێكی گۆڕان و پێشكەوتنە لە كۆمەڵگەدا. كێبڕكێ كردەیەكی بەردەوام و پایەدارە لە كۆمەڵگەدا.

## ٢. هاوكاری Cooperatin

هاوكاری كامڵبوونی نێوان رۆڵ و دەورەكانە، چوونكە كەسی هاوكار و یارمەتیدەر لە خەڵكانی دیكەدا كەسانێك دەبینێ كە لە رووی تایبەتمەندی و تواناكانەوە وەك ئەو نین و جیاوازن،لەبەر ئەوە بە كامڵكردنی توانای خۆی ئەوان بۆ وەدیهێنانی ئامانجە هاوبەشەكان هەوڵی بەكارهێنان و خستنەگەڕی تایبەتمەندی و تواناكانیان دەدات.

هاوكاری دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە و كاریگەریی دوولایەنەی ئاڵۆزكراوی نێوان تاكەكان لە ئەنجامدانی كارێكی دیاریكراو رەنگدانەوەی تیادا دەبێت، لە هاوكاریدا

هەوڵی خۆگونجاندن و یەکتری تەواوکردن لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دەبینرێت جگە لە وەدیهێنانی ئامانجی هاوبەش.

### ٣. گونجان و هەماهەنگی Assimilation and Accmmodation

تاك لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتییەکەیدا لە دۆخی کارلێکی بەردەوام دایە، بەردەوامیش هەوڵ دەدات لە رەگەز و لایەنەکانی دەوروبەر بگات و هەوڵی وەرگرتنی کاریگەرییەکانی دەدات بۆئەوەی بینوێنێ بەشێوەیەك ببێتە هۆی هەموارکردنەوە و دەستکاریکردنی جۆر و شێوازەکانی رەفتاری تاکو بتوانێ خۆی بگونجێنێت و لەگەڵ رەگەزەکانی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی چوار دەوریدا کاردانەوە و گونجانی دروستی هەبێت.

## ئەو بیردۆزانەی لێکدانەومیان بۆ کارلێکی کۆمەڵایەتی کردووە

### یەکەم: لێکدانەوەی رەفتارییەکان لەهەمبەر کارلێکی کۆمەڵایەتیدا

رەفتارییەکان کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتیی نێوان تاکەکان بۆ بیردۆزی وروژاندن و کاردانەوە و هاندان دەگێڕنەوە، ئەم بیردۆزەیش لەلایەن سکنەری زاناوە رێبەرایەتیی کراوە.

ئەم کەسانە پێیانوایە کە بوونەوەرە کۆمەڵایەتییەکان لە کارلێکی خۆیاندا نەرێیی نین، بەڵکو ئەوان کاردانەوە و وەڵامدانەوەیان لەهەمبەر ئەو کاریگەری و وروژێنەرانە دەبێت کە لەمیانی ئەو شیاندنە کۆمەڵایەتییەوە وەریدەگرن کە لەسەر کارلێککردن وەستاوە:

ئەو کەسێتییەی کە بۆ تاك و کۆمەڵەیش دروست دەبێت دەرەنجامی راستەوخۆی ئەم کارلێکەیە.

کارلێکیش بەم مانایە لەو وەڵامدانەوە و کاردانەوە ئاڵۆێرکراونەی نێوان تاکەکان لە نێوەند و هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی بەدیاردەکەوێت بەشێوەیەك هەر یەکێکیان دەبێتە وروژێنەر و کاریگەری رەفتارێکی دیکە.

کارلێککردن

وروژێنەر ⟵⟶ کاردانەوە ⟵⟶ وروژێنەر ⟵⟶ کاردانەوە ⟵⟶ وروژێنەر

سکنەر پێیوایە کە مرۆڤ حەز بە دووبارەکردنەوەی ئەو رەفتارانە دەکات کە پێداویستییەکانی دەهێننەدی یانیش حەزێکی تێردەکەن یان ئامانجێکی بۆ دەستەبەر دەکەن.

## دووەم: لێکدانەوەی نیوکمب لەهەمبەر کارلێکی کۆمەڵایەتیدا

نیوکمب بە پشتبەستن بە بنەمای وێکچوون و هاوسەنگی، لێکدانەوە بۆ کارلێکی کۆمەڵایەتی دەکات و بەڕای ناوبراو کارلێکی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی تێکەڵبوون و گونجان (الاندماج)ی کۆمەڵایەتی.

بەپێی بیردۆزەکەی نیوکمب دەتوانین بە سێ رێگە پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی لێکبدەینەوە، رێگەکانیش:

١.ئەو رێگە و بنەمایەی پێیوایە کە کارلێك لە ئەنجامی وێکچووندا دێتەدی کە ئەگەر هەبێت دەبێتە هۆی پەیوەندیی هاوسەنگانەی کۆمەڵایەتی.

٢. ئەو رێگە و بنەمایەی پێیوایە کەسە وێکچووەکان لەنێوان خۆیاندا ئەو پاداشتە پێشکەشی یەکتری دەکەن کە کارلێکی نێوانیان پتەو دەکات و دەبێتە هۆی راکێشانیان بەرەو یەکتری.

٣. ئەو ڕێگە و بنەمایەی کە پێیوایە وێکچوون دەبێتە هۆی پێشبینیکردنی ئەو بەکێشکردنەی کە کردەی کارلێك و بەردەوامیی وابەستەبوون بەرەو پەیوەندییەکی ئەرێیی کۆمەڵایەتی دەبات.

نیوکمب ناوی لە بیردۆزەکەی خۆی ناوە (أ ب س) بۆ ڕاکێشان ABX Theroy Attaction، نیوکمب پێیوایە کە جۆرە پەیوەندییەکی هاوسەنگانە لەنێوان دووکەسی کارلێککەردا باو دەبێت کاتێ ئاراستە و خولیا و بیروبۆچوونەکانیان لەهەمبەر شت و کەس و هەڵوێستێکی دیایکراودا پێکدەچێت. هەروەها پەیوەندیی جۆری گرژ و ناهاوسەنگ لەنێوان دوولایەنی ئاشنا (متـألفین)دا سەرهەڵدەدات ئەگەر هەریەکێك لەو دوو لایەنە چەند هزر و ئاراستە و خولیای جیاوازیان لەهەمبەر لایەنی سێیەمی هاوبەشدا هەبێت. هەروەها پەیوەندیی نا هاوسەنگ لەنێوان دوو لایەنی نەگونجاودا دروست دەبێت ئەگەر لە هەڵوێست و ئاراستەکانیشیاندا لەهەمبەر لایەنی سێیەم وێکچووبن. نیوکمب دەڵێت : دروستکردنەوە و گێڕانەوەی هاوسەنگی، بەندە بە گۆڕانی یەکێك یان چەندان ڕەگەزی کارلێککەر کە بە پەیوەندییەکەوە بەیەکەوە گرێدراون.

## سێیەم: لێکدانەوەی سامبسۆن بۆ کارلێکی کۆمەڵایەتی

سامبسۆن پێیوایە کە پەیوەندیی هاوسەنگ لە چوارچێوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی دەرەنجامی:

* بیروباوەڕی لایەنێکە بەوەی کە لایەنەکەی دیکە (ئەوەی کە خۆشماندەوێت) هەمان بیروڕا و بەهای هەیە کە لەلای ئێمەدا هەیە و بە هی ئێمە دەچێت.

* ئەو بیروباوەڕەیە بەوەی کە لایەنەکەی دیکە (ئەوەی کە خۆشمان ناوێت) هەمان بیروباوەڕ و بەهای وەك ئێمەی نییە و بە ئێمە ناچێت.

بەڵام پەیوەندییە گرژ و نا هاوسەنگەکان:

* ئەو بیروبۆچوونەیە بەوەی کە ئەو لایەنەی خۆشماندەوێت چەند بیروباوەڕ و داوەرییەکی هەیە کە دژی بیروباوەڕ و داوەرییەکانی ئێمەیە.

* ئەو بیروبۆچوونەیە بەوەی کە ئەو لایەنەی خۆشمان ناوێت چەند بیروبۆچوون و داوەریەك پیشان دەدات کە بەهی ئێمە دەچێت.

## چوارەم: لێکدانەوەی فیلدمان لەهەمبەر کارلێکی کۆمەڵایەتی

بیردۆزی فیلدمان سەبارەت بە کارلێکی کۆمەڵایەتی لەسەر (بەردەوامی پالپشتیکردنی رەفتاریی) نێوان ئەندامەکانی کۆمەڵە و کۆمەڵەکانی دیکە بونیادنراوە.

ناوبراو پێیوایە کە کامڵبوونی کۆمەڵایەتی سێ لایەن لەخۆی دەگرێت کە ئەوانیش بریتین لە:

تەواوبوونی ئەرکی: ئەو بزاڤ و چالاکییە پسپۆڕانە و تایبەتمەندە رێکخراوەیە کە پێداویستییەکانی کۆمەڵە لە رووی وەدیهێنانی ئامانجەکانی و رێکخستنی پەیوەندییە ناوەکییەکانی نێوی و پەیوەندییە دەرەکییەکانی نێوان کۆمەڵەکە و کۆمەڵەکانی دیکە وەدیدەهێنێ.

– تەواوبوونی کارلێکی: واتا تەواوبوون و کاملبوونی کەسەکان لە رووی کاریگەری دروستکردن و کاریگەربوون و پەیوەندییەکانی خۆشەویستی دوولایەنە و گشت ئەو شتانەی کە ئاماژە بە پتەوی و یەکگرتووییان دەکات.

– تەواوبوونی پێوەری: واتا تەواوبوون و کامڵبوونی تایبەت بە پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و ئەو بنەما باو ناسراوانەی کە لە کۆمەڵەدا رەفتاری تاکەکان بەرزەفت دەکات.

## پێنجەم: بیردۆزی بیلز بۆ کارلێکی کۆمەڵایەتی

بیڵز توانیویەتی بگاتە بیردۆزی کارلێکی کۆمەڵایەتی کە سیستمێکی دیاریکراو لەخۆیدەگرێت و یارمەتیدەری دیراسەکردنی جۆرەکان و قۆناغەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی و لێکدانەوە و شیکردنەوەیانە لەپێناو چاکترکردنی دۆخی ئەم کارلێکە و پێشخستن و سەرلەنوێ رێکخستنەوەی بۆ ئەوەی بۆ وەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی توانایەکی پتری هەبێت.

مەبەستیش لە کارلێکی کۆمەڵایەتی لەچوارچێوەی بیردۆزەکەی بیڵزدا: رەفتاری دیار و بەرچاوی تاکەکانە لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا و لە چوارچێوەی کۆمەڵەیەکی بچووکدا، بەڵام هەڵوێستەکە لەو کەسانە پێکدێت کە رەفتارەکەیان ئاراستە دەکرێت وەك خود و خەڵکانی دیکە و ئەو رەگەزە مادییانەی کە هەڵوێستەکە لەخۆی دەگرێت.

بەڵام کۆمەڵەی بچووك لە هەر ژمارە ئەندامێك پێکدێت کە رووبەڕوو و یەك جار و چەندان جار کار لەیەکتری دەکەن و هەریەکە و بەشێوەیەکی تایبەت ئەوی دیکە دەناسێت و کاردانەوە و وەڵامدانەوەی لە هەمبەریدا دەبێت.

کارلێکیش لەلای بیلز گشت کردارێکە جا ئەگەر لەنێوان کەسەکە و خودی خۆیشیدا بێت، دەبێتە هۆی کاردانەوەیەك یان چەند کاردانەوە و وەڵامدانەوەیەك لە چوارچێوەی کردەی ئاڵوێرکردنی کردار و کاردانەوەکان.

بیلز بەم شێوەیەی لای خوارەوە قۆناغەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی دابەش کردووە:

* ناسینەوە: واتا گەیشتن بە پێناسەیەکی هاوبەش بۆ هەڵوێستەکە، ئەمەیش ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

– داواکردنی زانیاری و رێنمایی و رێکارەکان و روونکردنەوە و جەختکردنەوە (گرفتەکە چییە– بۆچی کۆدەبنەوە؟)

– بەخشینی زانیاری و رێنمایی و رێوشوێنەکان و رێکارەکان و سەرلەنوێ روونکردنەوە (دیاریکردنی گرفتەکە).

⋆ هەڵسەنگاندن: واتا دیاریکردنی سیستمێکی هاوبەش کە لەژێر تیشکیدا چارەسەری جۆراوجۆر پێشنیار دەکرێت و هەڵدەسەنگێنرێ، ئەمەیش ئەمانە لەخۆی دەگرێت:

– داواکردنی راوبۆچوون و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە و گوزارشتکردن لە هەستوسۆزەکان (ئایا گرفتەکە گرنگە؟)

– دەربڕینی راوبۆچوون و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە و گوزارشتکردن لە هەستوسۆز و حەزەکان.

– بەرزەفتکردن: واتا هەوڵی تاکەکان بۆ کاریگەری دروستکردن لەسەر یەکتری، ئەمەیش ئەمانە دەگرێتەوە:

– داواکردنی پێشنیارەکان و ئاراستەکردن و رێگە کردەییەکانی چارەسەرکردن (رێك چی دەکەن؟)

– پێشکەشکردنی ئەو پێشنیار و رێنماییانەی کە یارمەتیدەری گەیشتنە بە چارەسەرەکان.

★ دەرکردنی بڕیار: واتا گەیشتن بە دوا بڕیار، ئەمەیش ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

– رازی نەبوون و رەتکردنەوە و خۆ وابەستەکردن بە شتە رووکەشەکان و یارمەتی نەدان.

– رازیبوون و پەسندکردن و تێگەیشتن و گوێڕایەڵی.

★ بەرزەفتکردنی گرژی: واتا چارەسەرکردنی ئەو گرژیانەی کە لە کۆمەڵەدا سەرهەڵدەدەن، ئەمەیش ئەمانە دەگرێتەوە:

– پیشاندانی گرژی و پاشەکشەکردن لە مەیدانی کۆمەڵە.

– کەمکردنەوەی گرژی و دروستکردنی دڵخۆشی و شادومانی.

★ کامڵبوون: واتا باشڕاگرتن (صیانە) وهێشتنەوەی کامڵبوونی کۆمەڵە، کە ئەمانە دەگرێتەوە:

– پیشاندانی لەیەکترازان و دووبەرەکی و دوژمنایەتی و کەمکردنەوەی رێز و بەهای خەڵکی.

– پیشاندانی پتەوی و یەکگرتوویی و بەرزکردنەوەی پایە و رێزی خەڵکی.

بیلز بەم شێوەیەی لای خوارەوە چەشنەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتیی دابەش کردووە:

١. کارلێکی بێلایەنانەی کۆمەڵایەتی (پرسیارەکان): قۆناغەکانی (١–٣) دەگرێتەوە و بە پرسیارکردن دەناسرێتەوە: داواکردنی زانیاری و پێشنیار و راوبۆچوونەکان.

٢. کارلێکی بێلایەنانەی کۆمەڵایەتی (وەڵامەکان) قۆناغەکانی (٤–٦) دەگرێتەوە بە هەوڵدانی جۆراوجۆر دەناسرێتەوە بۆ وەڵامدانەوە: بەخشینی زانیاری و پێشکەشکردنی پێشنیارەکان و را دەربڕینەکان.

٣. کارلێکی هەڵچوونیانەی کۆمەڵایەتی (نەرێیی): قۆناغەکانی (٧–٩) دەگرێتەوەو بە وەڵامدانەوەی نەرێیی دەناسرێتەوە: رازینەبوون، گرژی، پچڕان و پاشەکشەکردن.

٤. کارلێکی هەڵچوونیانەی کۆمەڵایەتی (ئەرێیی): قۆناغەکانی (١٠– ١٢) دەگرێتەوە و بە وەڵامی ئەرێیی دەناسرێتەوە: رازیبوون و کەمکردنەوەی گرژی و پیشاندانی یەکگرتوویی و پتەوی.

بیلز پێیوایە بۆ ئەوەی ئەم نموونەیە لە کارلێکی کۆمەڵایەتی بێتەدی، پێویستە چەند مەرجێکی دیاریکراو لە کۆمەڵە و گرفتەکەدا بێتەدی، ئەوانیش:

١. تاکەکان کەسانی ئاسایی بن.

٢. کەسەکان پێگەیشتووبن.

٣. تاکەکان لە ئاستێکی ماقووڵی فێربووندابن.

٤. گرفتێکی دیاریکراو هەبێت کە پێویستی بە نەخشە و دانانی پلان و بڕیاردان هەبێت.

٥. دەبێ هەندێ نزیکبوونەوە لە مەڵبەند و سەنتەرە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵەدا هەبن.

٦. بتوانرێ لەمیانی کاتی گفتوگۆدا گرفتەکە چارسەربکرێت.

ئەم خشتەیە جۆر و چەشن و قۆناغەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتیی لەلای بیلز پیشان دەدات:

| جۆر و چەشنەکانی کارلێك | قۆناغەکانی کارلێك |
| --- | --- |
| کارلێکی بێلایەنانەی کۆمەڵایەتی (پرسیارەکان) | ١. داواکردنی زانیاری.<br>٢ داواکردنی راوبۆچوون.<br>٣. داواکردنی پێشنیار. |
| کارلێکی بێلایەنانەی کۆمەڵایەتی (وەڵامەکان) | ٤. بەخشینی زانیاری.<br>٥. دەربرینی راوبۆچوون.<br>٦. پێشکەشکردنی پێشنیار. |
| کارلێکی هەڵچوونیانەی کۆمەڵایەتی(نەرێیی) | ٧. رازینەبوون.<br>٨.پیشاندانی گرژی.<br>٩. پیشاندانی پچڕان و لێکترازان. |
| کارلێکی هەڵچوونیانەی کۆمەڵایەتی (ئەرێیی) | ١٠. رەزامەندی.<br>١١. کەمکردنەوەی گرژی.<br>١٢. پیشاندانی پتەوی و یەکگرتوویی. |

## هێزی بەکێشکردنی نێوان کەسەکان

ئەگەر کارلێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان دووکەسدا دروستبوو و ئەم بەردەوامی و پەیوەندییە ماوەیەك درێژبوویەوە، ئەوا رەنگە پەیوەندییەك لەنێوانیاندا دروستببێت کە پێگە و بناغەکەی سەرسامبوون و متمانە و پشتگیریکردن بێت، هەرئەمەیشە بە بەکێشکردن ناودەبرێت، چوونکە لەئەنجامی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا دروستدەبێت، رەنگە ئەم کارلێکە کۆمەڵایەتییەش چەندان جۆری دیکەی پەیوەندیی لێ سەرهەڵبدات

کە هەندێکیان ئەرێیی و هەندێکیشیان نەرێیین، چوونکە پەیوەندیی نێوان دووکەس یەکێکە لەم سێ جۆرە پەیوەندییە:

پەیوەندیی ئەرێیی ئاڵوێرکراو واتا هەر دوو کەسەکە یەکتریان خۆشدەوێت و بەیەکتری سەرسامن و پشتگیری لەیەکتری دەکەن و یەکتری پەسند دەکەن، ئەم پەیوەندییەش پەیوەندیی بەکێشکردنە بەم دروشمە بیرکارییە (+ +) هێمای بۆ دەکرێت.

پەیوەندیی نەرێیی ئاڵوێرکراو، واتا هەردوو کەسەکە رقیان لەیەکتری دەبێتەوە و متمانە بەیەکتری ناکەن و پشتگیریی لەیەکتری ناکەن، ئەم پەیوەندییەش پەیوەندییەکی رق و لەیەکتری دوورکەوتنەوەیە و بە هێمای (− −)ی بیرکاری ئاماژەی بۆ دەکرێت.

پەیوەندییەکی تێکەڵ کە هەردوو لایەنی ئەرێیی و نەرێیی تیادایە و لایەنێکیان ئەرێییە و باوەشی بۆ ئەوی دیکە کردووەتەوە و خۆشیدەوێت، بەڵام لایەنەکەی دیکە نەرێییە و لێی دوور دەکەوێتەوە، ئەمەیش پەیوەندیی ئاڵوێرنەکراوە یان پەیوەندییەکی نایەکسانە و بە هێمای (+ −)ی بیرکاری هێمای بۆ دەکرێت.

# ئەو هۆکارانەی وەدیهێنەری بەکێشکردنن

**یەکەم: وێکچوون**

زۆربەی توێژینەوەکان ئەو وێکچوونەیان شەنوکەو کردووە کە دووکەسی خۆشەویست و نزیك بەیەکەوە دەبەستێتەوە، هەروەها شەنوکەوی وێکچوونی خولیا و ئاراستە و کەسێتیی و سیفەتی دیکە کراوە، گرنگترین ئەو شتانەی کە لێکۆڵینەوەکان پێیگەیشتوون ئەمانەی خوارەوەن:

* وێکچوون لە ئاراستە و خولیاکاندا
* بەکێشکردن دەبێتە هۆی درککردن بە وێکچوون لە خولیا و ئاراستەکاندا.
* وێکچوون لە ئاراستەگری و خولیاکاندا دەبێتە هۆی بەکێشکردن.
* کاریگەریی بابەتی ئاراستە.

ئایا وێکچوون لە ئاراستەدا بەرەو بابەتێکی گرنگ دەبێتە هۆی وەدیهێنانی هەمان نمرەی ئەو بەکێشکردنەی کە وێکچوون لە ئاراستەدا لەهەمبەر بابەتێکی پڕوپووچ دروستی دەکات؟

توێژەران ئەوەیان بۆ روونبووەتەوە کە گرنگیی بابەتی ئاراستە بەنیسبەت کەسێك کاریگەرییەکی گەورەی لە دیاریکردنی ئاستی ئەو بەکێشکردنەدا دەبێت کە بەهۆی درککردنی وێکچوون لەگەڵ کەسێکی دیکە لەهەمبەر بابەتێکی دیکە دروستی دەکات، چوونکە وێکچوون لە ئاراستەدا بەرەو بابەتێکی گرنگ دەبێتە هۆی بەکێشکردنێکی بەهێزتر لەو رێککەوتن و گونجانەی کە لە ئاراستە بەرەو بابەتێکی پڕوپووچدا هەیە، بۆنموونە: تۆ ئەو کەسانەت خۆشدەوێت کە لە ئاراستەت بەرەو سەرکردەیەکی نیشتیمانی هەتە، خۆشەویستیت بۆ ئەو کەسە پترە نەك ئەو کەسەی لە ئاراستەی

خۆشەویستیت لەهەمبەر یاریزانێکی تۆپی پێدا بەتۆ دەچێت، بەتایبەت ئەگەر تۆ لەو کەسانە بیت کەوا گرنگیی بە تۆپی پێ نادەن.

درککردن بە وێکچوون لە ئاراستەکاندا دەبێتە هۆی بەکێشکردن و سەرسامبوون و رێزگرتن، پرسیارەکەیش ئەوەیە: بۆچی درککردن بە وێکچوونی ئاراستەکان دەبێتە هۆی بەکێشکردن؟ هەروەها ئایا وێکچوون لە ئاراستەکاندا بۆ ئەو کەسە چی بەرهەم دەهێنێت کە درکی پێدەکات، بەشێوەیەك ببێتە هۆی خۆشەویستیی و راکێشرانی بەرەو کەس و لایەکەی دیکە؟

## هۆیەکانی سەرهەڵدانی بەکێشکردن لە درککردن بە وێکچوونی ئاراستەکان

١. بەکێشبوون و راکێشران بەرەو ئەو کەسەی کە لە ئاراستەکاندا وێکچووی ئێمەیە دەبێتە هۆی وەدیهێنانی هەماهەنگی و گونجانی مەعریفی. هەماهەنگی و گونجانی مەعریفیش لە پێداویستیە دەروونییەکانە، چوونکە کەسی ئاسایی(لەرووی دەروونییەوە) بەگشت ئاراستەکانیەوە خۆی خۆشدەوێت، جا بۆئەوەی زانیارییەکانی گونجاو و هەماهەنگ بن، هەردەبێ ئەو کەسانەی خۆشبویت کە لەم ئاراستانەدا بەو دەچن (مەبەست لەو ئاراستانەیە کە لەدەروونی خۆیدا خۆشیدەوێن.

٢. درککردن بە وێکچوونی ئاراستەکانی نێوان کەسێك و کەسێکی دیکە دەبێتە هۆی راستی و دروستیی ئەو ئاراستانە و پاڵپشتیی لێ دەکات و پێداویستی هەڵسەنگاندنی بیروڕا و بۆچوونەکانی وەدیدەهێنێت، ئەمەیش بەپێی بیردۆزی (بەراوردکاریی کۆمەڵایەتییە) چوونکە ئەم بیردۆزە جەخت لەسەر گرنگیی پێداویستیی هەڵسەنگاندنی راستی و دروستیی راوبۆچوونەکان و ئاراستەکان دەکاتەوە، لە سەرچاوەکانی ئەم

هەڵسەنگاندنەش حەقیقەتی کۆمەڵایەتییە، واتا ئاراستە و بیروبۆچوونی خەڵکانی دیکە. کاتێکیش کەسێك دەبینێ کەوا کەسەکەی دیکە هەمان ئاراستەی ئەوی هەیە، دڵنیایی لەهەمبەر ئاراستەکانی خۆی پەیدا دەکات و لەوە دڵنیا دەبێتەوە کە ئاراستەکانی ساغ و دروستن، جا لەم دۆخەدا راستییەکی کۆمەڵایەتیی وەدەستهێناوە. کاتێکیش دەبینین کەوا کەسێکی دیکە ئاراستەکانی بە ئاراستەکانی ئێمە دەچێت ئەوا پاڵمان پێوەدەنێت پەیوەندییەکی ئەرێیانەی لەگەڵدا ببەستین (بەکێشکردن).

٣. ئاراستەکان پێشبینیی رەفتار دەکەن و بوونی وێکچوون لە ئاراستەکاندا لەهەمبەر بابەتێکدا پێشبینیی رووداني بەشداریکردنی رەفتاری دەکات لەهەمبەر ئەم بابەتەدا. پێشبینییەکەیش ئەوە لەخۆیدەگرێت کە پاداشتێکی دیاریکراو دێتەدی لەئەنجامی کارلێککردنمان لەگەڵ کەسێکی دیکەدا و یارمەتیمان دەدات بۆئەوەی لەگەڵ کۆمەڵەیەکدا کۆببینەوە کە بەشداربین لە خۆشویستن و ئەنجامدانی چالاکییەك کەوا لە خۆشەویستییەکەی بەشدارین.

٤. کاتێ کەسێك درك بە وێکچوونی خۆی و کەسێکی دیکە دەکات، چاوەڕوانیی ئەوەی لەو کەسە هەیە خۆشیبوێت بەپێی بوونی ئەو وێکچوونەی کە لەنێوانیاندا هەیە بۆیە ئەو کەسەی خۆشدەوێت کەوا ئەوی خۆشدەوێت.

## وێکچوونی کەسێتی

ئەو کەسەی درك بە خۆشەویستترین کەسی خۆی دەکات هەست دەکات کەوا زۆر پێی دەچێت، هەروەها کاتێ درك بەوە دەکات رقی لەکەسێك دەبێتەوە هەست دەکات ئەو کەسە زۆر بەکەمی بەو دەچێت، جا ئایا ئەو کەسانەی یەکتریان خۆشدەوێت و هاورێی یەکترین لە سیفەتەکانی کەسێتیی خۆیاندا بەراستی بەیەکتری دەچن؟.

زۆربەی پەندەکانی پێشینان ئەم مەسەلەیە پشتڕاستدەکەنەوە" پێم بڵێ کێ هاوڕێتە پێتدەڵێم تۆ کێیت". بەلآم ئەو ڕێگە زانستیانەی شرۆڤەی ئەم دیاردەیە دەکەن پەنا دەبەنە بەر هەڵبژاردنە کەسییەکان بۆ ئەوەی سیفەتی کەسیی دوو هاوڕێ بپێوێ و بەراوردی ئەو دەرەنجامانە بکەن کە لەو تاقیکردنەوانەدا دەستیان دەکەوێت و تیایدا بەدوای وێکچووندا دەگەڕێن. لەو لێکۆڵینەوانەی کەوا ناویانگێکی مەزنی بەدەستهێنا لێکۆڵینەوەیەك بوو کە هەریەکە لە English and Reader ئەنجامیان دا، ئەم دووکەسە پێنج تاقیکردنەوەی کەسییان لەسەر کۆمەڵێك جووتە هاوڕێ و کۆمەڵێك کەسی نا هاوڕێدا ئەنجام دا، دەرەنجامی هەردوو دۆخیان دەستکەوت و دەرەنجامەکانیش لە دۆخی هاوڕێکاندا ئاماژەیان بە بوونی پەیوەندیی ئەرێیی مەزن کرد. هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی دیکەش ئەنجام درا چوونکە لێکۆڵەران تەنها بەوەندە دەستیان هەڵنەگرت کەوا خودی کەسەکە حوکم لەسەر سیفەتە کەسییەکانی خۆی بدات، بەڵکو پەنایان بردە بەر حوکمدانی خەڵکانی دیکەش لەسەر سیفەتی ئەو هاوڕێیانە، واتا جگە لە ڕاوبۆچوونی خودی کەسەکانیش لەسەر خۆیان پرسیاریان لە خەڵکانی دیکەش دەکرد کە ئاخۆ ڕاوبۆچوونیان لەسەر سیفەتی کەسیی هاوڕێیەکان چییە بۆئەوەی ڕاوبۆچوونی خەڵکانی دیکە لەهەمبەر سیفەتی هاوڕێیەکاندا بکەنە بناغەی حوکمدان لەسەر وێکچوون. دەرەنجامەکان بوونی پەیوەندیی نێوان شتە باوەکانی کەسەکە و ئەو شتانەیان ڕوونکردەوە کەوا هاوڕێی کەسەکەی پێ وەسف دەکرێت. هەروەها ئەو وێکچوونەی کەوا خەڵکانی دیکە لەسەر هاوڕێیان بڕیاریان لەسەر دەدا زۆر توندتربوو لەو وێکچوونەی کە لە وەسفکردنی گشت هاوڕێیەك بۆ خودی خۆی ڕووندەبوویەوە.

بەشێوەیەکی گشتیش لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان بەدیارخست کە وێکچوون لە کەسێتیدا توندییەکەی کەمترە و کەمتر باوە لە وێکچوونی ئاراستەکانی نێوان هاوڕێیەکان، بەم شێوەیە هۆکاری وێکچوون لە کەسێتیدا کاریگەرییەکی کەمتری هەیە لە وەدیهێنانی بەکێشکردن لە هۆکاری وێکچوونی ئاراستەکان.

لەگەڵ ئەمەیشدا لێکۆڵینەوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو وێکچوونەی لە سیفەتی کەسێتیی نێوان هاوڕێیاندا هەیە زۆر لەو وێکچوونە بەرزترە کە لەنێوان دوو کەسی نا هاوڕێدا هەیە. جا ئایا چ شتێك لێکدانەوە بۆ وێکچوونی نێوان کەسە نا هاوڕێیەکان دەکات؟ ئایا هاوڕێیەتی و لەگەڵ یەك بوونە؟ یانیش کەسەکە لە بنەڕەتەوە حەز بە هاوڕێیەتیی ئەو کەسانە دەکات کەوا بەو دەچن؟ وەڵامەکە بەم شێوەیە دەبێت:

**هاوڕێیەتی و پەیوەندیی بە لەیەکچوونەوە:** ئەگەر هاوڕێیەتی ئەو هۆکارە بێت کە ببێتە هۆی وێکچوون لە کەسێتیدا، ئەوا مانای وایە کە هەرچەندە ماوەی هاوڕێیەتییەکە زۆرتر بوو وێکچوونی کەسێتییەکە توندتر و زۆرتر دەبێت. چەندان توێژینەوە سەبارەت بە کاریگەریی درێژیی ماوەی هاوڕێیەتی لەسەر وێکچوونی کەسێتیی ئەنجام دراوە، ئەو نموونەیەی کە تاقیکردنەوەکەشیان لەسەر ئەنجام درا چەند هاوسەرێك بوون کە ماوەی ژیانی هاوسەرییان جیاواز بوو، بەڵام دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان پشتڕاست نەکردەوە کە درێژیی ماوەکە دەبێتە هۆی وێکچوون بەو مانایەی کە درێژیی ماوەی ژیانی هاوسەری وێکچوون بەهێزترین سیفەتە کەسییەکەی نەبووە (کەواتە هاوڕێیەتی نابێتە هۆی وێکچوون) جا ئایا وێکچوون دەبێتە هۆی هاوڕێیەتی؟ بەو مانایەی کە هاوڕێیەتی لە ئەنجامی درککردن بە وێکچوون دێتەپێشێ؟ زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە بۆ شرۆڤەکردنی رۆڵی کەسەکە ئەنجام دران

ئەو کەسەی کەسێکی دیکەی خۆشدەوێت شیمانەی ئەو سیفەتانەی خۆی لە دەروونی کەسە هاوڕێیەکەی دەکات واتا ئەو سیفەتانەی خۆشدەوێت کە لەخۆیدا هەن ئەمەیش لەئەنجامی حەزە نەرگسییەکانیەتی، واتا ئەو سیفەتانەی لەکەسی بەرانبەر خۆشدەوێت کە لەخودی خۆیدا هەن، لەبەرئەوە درککردن بە وێکچوون دەبێتە هۆی دروستکردنی بەکێشکردن لەنێوان دووکەسدا.

**وێکچوون لە لایەنەکانی دیکەدا:** جگە لە وێکچوون لە ئاراستەکان و کەسێتیدا توێژینەوەکان گرنگییان بە لایەنی دیکەی وەك وێکچوون لە توانای ئەقڵی و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی داوە. لە توێژینەوەکاندا ئەوە بەدەرکەوتووە کە وێکچوونێك لەنێوان کۆمەڵە گەنجێکی دەستگیراندار هەیە، بەتایبەت لە لایەنەکانی وەك هەلومەرجی خانەوادەیی و شوێنی نیشتەجێبوون و ئاستی خوێندن و دەرامەت و ئاستی کۆمەڵایەتیی باوکانیان، هەروەها وێکچوونێك لە ئاین و جۆری پەیوەندییە باوەکەی نێو خانەوادەدا هەبووە.

## دووەم: کامڵبوون

هەندێ تێبینیی ژیانی رۆژانەمان ئاماژە بەوە دەکەن کە بەکێشکردن تەنها لەسەر بنەمای وێکچوون لە گشت دۆخەکاندا دێتەدی و جیاوازبوونیش لە هەندێ سیفەتدا رەنگە ببێتە هۆی بەکێشکردن. هەندێ لێکۆڵینەوە جەخت لەسەر رۆڵی ئەو جیاوازییە دەکەنەوە لە وەدیهێنانی بەکێشکردندا، بەتایبەتیش جیاوازی لە لایەنە هاوبەشە گشتییەکانی وەك پێداویستیەکانی دەروونی. ئەو جیاوازیەی کە لێرەدا مەبەستمانە و دەبێتە هۆی بەکێشکردن، ئەو جیاوازییەیە کە لە رووی سیفەتیانەوە کامڵبوونی نێوان دووکەس دەهێنێتەدی. لەم جیاوازیەدا سیفەتی لایەنێك لە سیفەتی لایەنەکەی دیکە و

لەهەمان کاتیشدا لە تەواوبوونیدا جیاوازە. چوونکە ئەو کەسەی بە تایبەتمەندیی حەزی کۆنترۆڵکردن دەناسرێتەوە بەرەو ئەو کەسە بەکێش دەکرێت کە بەتایبەتمەندیی ملکەچکردن دەناسرێتەوە، هەروەها رەنگە پێچەوانەکەشی رووبدات، چوونکە تایبەتمەندی کۆنترۆڵکردن و تایبەتمەندیی ملکەچیکردن یەکتری تەواو دەکەن و لەکاتی بەیەکترگەیشتنیشیان رەنگە وەها لە دوو کەسەکە بکات کاملبن. لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەو گەنجانە ئەنجام درا کە تازە چووبوونە نێو ژیانی هاوسەرییەوە، دەرەنجامەکان ئەوەیان پیشان دا کە تەواوبوون لە پێداویستییە دەروونییەکاندا بنەمای هەڵبژاردنی هاوسەرانە، بەو مانایەی گەنجان کەسانێك هەڵدەبژێرن کە سیفەتەکانیان تەواوکەری سیفەتەکانیان بێت و پێداویستییە دەروونییەکانیان وەدیبهێنێت، ئەو کەسانەش هەڵنابژێرن کە لەرووی پێداویستییە دەروونییەکانیاندا بەوان بچن.

هەروەها بیرۆکەیەکی دیکەش هەیە پێیوایە گشت کەسێك پێویستی بەوە هەیە لەو هاوکار و هاورێیەی کەوا هەڵیدەبژێرێت هەمان کۆمەڵە سیفەتی پەسندی ئەوانیان هەبێت وەك جوانی و زیرەکی و هاوسەنگیی هەڵچوونی، پێداویستیشی بۆ ئەم سیفەتانە لە هاورێ و هاوکارەکەیدا زۆرتر دەبێت هەرچەندە ئەو سیفەتانە لەخۆیدا کەم بێتەوە.

## سێیەم : ئاڵوێرکردن

بنەمای پاڵپشتکردنی رەفتار (پاداشتکردن) زۆربەی جار دەبێتە بناغەی لێکدانەوەی پەیوەندیی نێوان هاورێیان: تاك ئەو کەسەی خۆشدەوێت کە پاداشتی دەکات، رقیشی لەو کەسە دەبێتەوە کە سزای دەدات. پاداشتیش چەندان شێوەی جیاجیا لەخۆدەگرێت، وەك: وێکچوون لە ئاراستەکان و بەشداریکردن لە چالاکی و حەزو کاملکردن بەمانای دابینکردنی پێداویستییە دەروونییەکان و تەواوکردن بەمانای

وەدیهاتنی ئەو وێنەیەیە کە کەسەکە لە کەسێتیی هاوڕێیەکەیدا بۆ خۆی دەیخوازێ.

ئێستە باسی بەهێزترین جۆرەکانی پاداشتکردن دەکەین لە پەیوەندییەکانی کەسییدا کە ئەویش ئاڵوێرکردنە، تێبینیکردنی کەسێك لەهەمبەر پەیوەندییەکانی سەرسامی و حەزی کەسێك لەهەمبەر خۆیدا دەبێتە هۆی ئەوەی ئەویش حەزی بۆ کەسی بەرانبەر بچێت و پێی سەرسام بێت، ئەمەیش لەبەر دوو هۆیە:

١. چوونکە کاتێ کەسەکەی دیکە پێی سەرسام دەبێت یان خۆشیدەوێت بەمە یارمەتیی دەدات ئامانجەکانی وەدیبهێنێ، لەبەرئەوە ئەم خۆشەویستییە تەنانەت لەهەمبەر هەمان ئەو کەسەدا هێزی پێدەبەخشێت، ئەمەیش وای لێدەکات بتوانێ کاریگەریی لە رەفتاری بکات، هەروەها ئەوەشی بۆ دابیندەکات کە تەنانەت لەکاتی ئامادەنەبوونیشیدا لەهەمبەریدا وەفادار بێت.

٢. خۆشەویستیی کەسێك بۆ کەسەکە هەستێکی بەهێزتری پێدەبەخشێت لەهەمبەر بەها کەسییەکەی خۆیدا و خودی خۆی پێ دەسەلمێنێ و هەست دەکات کەسێکی گرنگە.

لەگەڵ ئەمەیشدا ئەمە مانای ئەوە نییە کەوا تاك بەرەو ئەو کەسانەش بەکێشدەکرێت کە ستایشێکی دەکەن و خۆیشی دەزانێت شایانی ئەو ستایشە نییە، یان لەهەمبەر ئەو کەسەی سیفەتی باشی دەخاتە پاڵ و خۆیشی دەزانێ ئەو سیفەتانە لە ناخیدا نییە، چوونکە لە چەندان لێکۆڵینەوەدا ئەوە بەدیارکەوتووە کە ئەو کەسانەی لەهەمبەر کارێکی بچووکدا ستایش کراون لەهەمبەر ئەو کەسانەی کەوا ستایشیان کردوون کاردانەوەیان ئەرێیی نەبووە، بەڵکو کاردانەوەی ئەو کەسانە زۆر بووە کە لەهەمبەر کارێکی باشدا ستایش کراون. هەروەها ئەوەیش روونبووەتەوە کە

ئەو کەسانەی لەهەمبەر کارێکی باشدا بەشێوەیەکی نەرێیی هەڵسەنگێنراون بێزارییان زۆر لەو کەسانە زۆرتر بووە کە بەهۆی کارێکی بچووکەوە بەشێوەیەکی نەرێیی هەڵسەنگێنراون.

## کەمکردنەوەی توندیی ئاستی نیگەرانی و متمانە بەخۆنەکردن

کاتێ کەسێك هەست بە نیگەرانی دەکات هاوڕێیەتی ئەو کەسانە دەکات کە دەیحەسێننەوە و پاداشتی دەکەن. چەندان لێکۆڵینەوە ئەنجام دراون و ئەوەیان سەلماندووە کە ئەو کەسەی هەست بە نیگەرانی دەکات بۆ هاوڕێیەتی کردنی خەڵکانی دیکە حەزێکی زۆرتری هەیە، چوونکە حەزکردن بە هاوڕێیەتی لەگەڵ پتربوونی نیگەرانیدا پتر دەبێت. بەڵام سەبارەت بە جۆری ئەو کەسانەی کەوا کەسی نیگەران هەڵیاندەبژێرێت ئەوە روونبووەتەوە کەوا کەسی نیگەران هەوڵ نادات لەگەڵ کەسێکی دیکەدا پەیوەندی و هاوڕێیەتی بگرێ، بەڵکو ئەو کەسە هەڵدەبژێرێت کەوا هەڵوێستەکەی بەهی خۆی بچێت، واتا وەك خۆی نیگەران بێت. لێکۆڵەران ئەو هۆیانەیان روونکردووەتەوە کەوا لە کەسێکی نیگەران دەکات هاوڕێیەتی کەسێکی نیگەرانی وەك خۆی بکات، هۆیەکانیش ئەمانەن:

١. هەڵاتن یان سووربوون، چوونکە کاتێ کەسێك لە هەڵوێستێکی نیگەرانیکاردا دەژیەت، وا هەست دەکات قسەکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەهەمان هەڵوێستی ئەودان یارمەتیدەری دەبێت بۆئەوەی پلانێك دابڕێژن و لەو هەڵوێستە رزگاربن و خۆیان لە ئازارەکە بەدوور بگرن.

٢. کەمکردنەوەی نیگەرانی بە رێگەی راستەوخۆ، چوونکە قسەکردن لەگەڵ خەڵکانی دیکە دڵ دەحەسێنێتەوە و وەها دەکات هەردوولایەن پشتی یەکتری بگرن، بەمەیش ئازایەتی باڵ بەسەریاندا دەکێشێت.

٣. روونکردنەوەی راستییەکان، چوونکە کاتێ هەڵوێستەکە بۆ کەسەکە نوێیە یان لێڵە، هەوڵی بێوچان دەدات بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی لەگەڵ خەڵکی دیکە بکات بەڵکو هەڵوێستەکەی بۆ روونبکاتەوە و بەرچاوڕوونیەکی پێ ببەخشێت.

٤. کەمکردنەوەی نیگەرانی بە رێگەی نا راستەوخۆ، چوونکە قسەکردن لەگەڵ کەسانی دیکە وەها لە کەسە نیگەرانەکە دەکات سەرقاڵ بێت و لە نیگەرانی دوور بکەوێتەوە و بیر لەوە نەکاتەوە کە ئاخۆ دوای کەمێکی دیکە چ هێدمە و سزا و دەرەنجامێکی چاوەڕوانکراو رووبەڕووی دەبێتەوە.

٥. هەڵسەنگاندنی خود، چوونکە کەسی نیگەران پێویستی بە کەسێکی دیکە هەیە کە پاساو بۆ هەڵچوون و هەستوسۆزەکانی بهێنێتەوە، بوونی پێداویستیی هەڵسەنگاندنی خود وەك هەوڵێکی کەسە نیگەرانەکەیە بۆ هاوڕێیەتی خەڵکانی دیکە، ئەمەیش لەلایەن چەندان لێکۆڵینەوەوە پشتڕاست کراوەتەوە.

بەڵام ئایا خەڵك لە پێداویستیی هاوڕێگرتن وەك یەکن کاتێ نیگەرانیی روویان تێدەکات؟ لێکۆڵەران ئەوەیان دۆزیوەتەوە کەوا کەسەکان لەمەدا جیاوازن و ئەم جیاوازیەش هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ ریزبەندیی تاك لە نێو خوشك و براکانی، ئەوەشیان روونکردووتەوە کە منداڵە یەکەمەکان (گەورەکان) لە خانەوادەکانیاندا لە ئەوانی دیکە پتر دووچاری نیگەرانی بوونەتەوە و لەو کاتەی نیگەرانی روویان تێدەکات پتر حەز بە هاوڕێیەتی کەسانی دیکە دەکەن. ئەم جیاوازیەی نێوان نۆبەرە و پاشەبەرەیان بە ئەزموون و تاقیکردنەوەی هەردووکیان لێکداوەتەوە و هۆیەکەشیان بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن و رەفتارکردنی خانەوادە لێکداوەتەوە لەهەمبەر هەردووکیاندا:

یەکەم: دایك وەڵام و کاردانەوەی لەهەمبەر منداڵی نۆبەرە پترە و لەهەمبەر منداڵەکانی دوای ئەودا کەمترە، چوونکە دایك زۆر بەخێرایی وەڵامی منداڵی نۆبەرە دەداتەوە و دەیەوێ هۆی نیگەرانییەکانی نەهێڵێ و ماوەیەکی درێژتر لەگەڵیدا دەمێنێتەوە، بەڵام لەگەڵ منداڵانی دواتردا بەم شێوەیە نییە. کاتێ منداڵی دووەمیش دێتە سەر دونیاوە دایکەکە ئەزموونی لە پەروەردەکردنی منداڵ وەدەستهێناوە و کەمتر بەرەو پیلی منداڵی دووەم دەچێت و زۆر بەدوای هاوار و قیژەیدا ناچێت و ماوەیەکی زۆریش لەتەکیدا نامێنێتەوە. بەڵام لەهەمبەر منداڵی چوارەم و پێنجەمدا هێندە گرنگی بە قیژەیان نادات و پشتگوێی دەخات. هەروەها دەبینین منداڵی یەکەم بەوە دەناسرێتەوە کە نیگەرانی و کەمکردنەوەی نیگەرانییەکە بە سۆز و خۆشەویستیی خەڵکانی دیکە دەبەستێتەوە، بەڵام ئەم بەستنەوەیە لەلای منداڵی پاشەبەردا نابیندرێ.

دووەم: منداڵی پاشەبەرە کەسانێك لە دەوروبەریدان کەوا دەیترسێنن و نیگەرانی دەکەن، بەڵام منداڵی نۆبەرە ناکەوێتە نێو ئەم هەڵوێستەوە، ئەگەر بکەوێتە نێویشیەوە زۆر بەدەگمەن دەبێت، چوونکە کوڕی گەورە کوڕی بچووکتر دەترسێنێ و ستەمی لێدەکات (کوڕە گەورەکەش) کەسانی گەورە لە چواردەوریدان کە حەسانەوەو ئارامیی بۆ دەستەبەر دەکەن، چوونکە خەڵکانی دیکە لەهەمبەر منداڵی بچووکتردا ستەمکارن و لەهەمبەر منداڵی گەورەدا یان منداڵی یەکەمدا نیگەرانییەکەی کەمتر دەکەنەوە.

جا لەبەر ئەوەیە کە منداڵی نۆبەرە و تاقانە لە خانەوادەدا کاتێ گرفتاری نیگەرانی دەبنەوە پتر پێویستیان بە هاوڕێیەتیی خەڵکانی دیکە دەبێت.

## كەمكردنــەوەی تونــدیی متمانــە بەخۆبــەكردن و پەیوەنــدیی بــە بەكێشكردنەوە

لێكۆڵینەوەكان ئەوەیان روونكردووەتەوە كە هەرچەندە ئاستی متمانەبەخۆكردن نزم بێت، كەسەكە پتر پێویستی بەوە هەیە خەڵكانی دیكە باوەشی بۆ بكەنەوە و پەسندی بكەن و پتریش پێویستی بە خۆشەویستیی خەڵكانی دیكە دەبێت، واتا باوەشكردنەوەی خەڵك و پەسندكردنیان پێداویستییەكی زۆر بەهێزتر لە پێداویستیی ئەو كەسە وەدیدەهێنێت كە لەلایەن كەسی متمانەبەخۆكەردا دێتەدی، لەبەر ئەوە پەسندكردن و باوەشكردنەوە بۆ كەسێكی بێ متمانە یان ئەو كەسەی متمانە بەخۆكردنی لاوازە، دەبێتە هۆی بەكێشكردنێكی بەهێزتر هەرچەندە متمانەی ئەو كەسە بەخۆی نزمتر بێت. هەروەها دەرەنجامەكانی لێكۆڵینەوەكان سەبارەت بە بابەتی پەسندكردن و باوەشكردنەوە بۆ هاوڕێیەتی كەسانی دیكە ئاماژەیان بەم خاڵانەی خوارەوە كردووە:

* ئەو كەسەی متمانەی بەخۆی كەمە رقی لەو كەسە دەبێتەوە كەوا رەتیدەكاتەوە، ئەو رقەشی لە رقی ئەو كەسە زۆر پترە كە متمانەی بەخۆی هەیە و كەسێك رەتیدەكاتەوە.

* ئەو كەسەی متمانەی بەخۆی كەمە ئەو كەسەی زۆر خۆشدەوێت كە پەسندی دەكات و باوەشی بۆ دەكاتەوە، هەڵبەتە لەمەیشدا خۆشەویستییەكەی لەهەمبەر ئەو كەسەی پەسەندی كردووە لەخۆشەویستیی ئەو كەسە زۆر زۆرترە كە متمانەی بەخۆی هەیە و كەسێك خۆشیدەوێت.

* لەوکاتەی کەسەکە نازانێ ئەو کەسەی باوەشی بۆ کردووەتەوە چ کەسێکە ئاخۆ کەسێکە پەسندی دەکات یان رەتیدەکاتەوە، ئەو کەسەی متمانەیەکی زۆری بەخۆی هەیە پێیوایە کەسەکە خۆشیدەوێت، بەڵام ئەو کەسەی متمانەی بەخۆی نییە باوەڕی وەها نییە.

بەم شێوەیە هەریەکە لە کەمکردنەوەی توندیی نیگەرانی و کەمکردنەوەی متمانەبەخۆنەکردن دەبنە هۆی وەدیهێنانی بەکێشکردنی نێوان کەسەکان، چوونکە ئەو کەسەی لە دۆخی نیگەرانیدایە هەوڵ دەدات هاوڕێیەتی لەگەڵ خەڵك بکات بۆ ئەوەی نیگەرانییەکەی کەم بکەنەوە، هەروەها لەدۆخی نەمانی متمانە بەخۆبوونیشدا هاوڕێیەتی خەڵکانی دیکە قبوڵ دەکات بۆ ئەوەی متمانە بەخۆکردنی پتەوبێت.

# گونجان و وێکچوون

ئەگەر کارلێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان کەسێك و کەسێکی دیکە یان کۆمەڵێك کەس هاتەدی، ئەوا پێویستە بیروبۆچوونی کەسەکە لەگەڵ بیروبۆچوونی کەسانی دیکە نزیك بێت، رەفتاریشی بە رەفتاری ئەوان بچێت، ئەمەیش لەئەنجامی چەندان هۆکاری دەروونی تاکەکەسیی و کۆمەڵایەتی و هەڵوێستی و چەندان هۆکاری دیکە دێتەدی، ئەم دیاردەیە بە گونجان و وێکچوون ناودەبرێت.

رەفتاری گونجان و وێکچوونیش وەها پێناسە دەکرێت بەوەی کە رەفتارێکە و مەبەست لێی وەدیهێنانی چاوەڕوانی و پێشبینیەکانی کۆمەڵەیە لە رووی ئەو رەفتارە پێوەرییەی کە لە ئەندامەکانی داوای دەکات، رەفتاری گونجاو و وێکچووی تاکیش لەسەر بنەمای درککردنی ئەو چاوەڕوانی و پێشبینیانەوە بونیادنراوە.

زاراوەی گونجان و وێکچوون ئاماژە بەو هەڵوێستانە دەکات کە کەسەکە هان دەدات بەهۆی بینین و روانین لە کەسێك یان کەسانی دیکە کە هەمان رەفتار دەکەن، رەفتارێکی دیاریکراو بکات و رەوتێکی دیاریکراو بگرێتە بەر

# جۆرەکانی گونجان و وێکچوون

وەك پێشتریش پێناسەی وێکچوون و گونجانمان کرد بە مانای وەرگرتن و رازیبوونە لەهەمبەر کاریگەریی کۆمەڵە و خۆ چواندن پێی، دابەشیش دەبێتە سەر دوو جۆری سەرەکی ، ئەوانیش:

١. گونجان و وێکچوونی هاوشێوە

هیچ دەرفەتێکی هەڵبژاردن و گۆڕان لەبەردەم کەسەکەدا ناهێڵێتەوە، بەڵکو بە مۆرکێکی دیاریکراوی کەلتووری و رۆشنبیری مۆرکراوە، یانیش بەچەند خوو نەریتێکی خانەوادەیی رەنگی دەکات، لە هەردوو دۆخیشدا زۆر قورسە ئەم مۆرك و خوو نەریتانە بگۆڕدرێن. ئێمە ناتوانین ئەو زمانە بگۆڕین کە لەگەڵماندا نشونمای کردووە، هەروەها ناتوانین ئەو خۆراکە بگۆڕین کەوا کۆمەڵگەکەمانی پێ دەناسرێتەوە، بەڵکو ئەو شتەی لەسەری پەروەردەکراوین گەورەکراوین لەگەڵ سەلیقەی تایبەتی کەسیمان دەگونجێت. ئەم جۆرە وێکچوون و گونجانە پێیدەگوترێت پاشکۆبوونی کۆمەڵایەتی.

٢. گونجان و وێکچوونی جووڵە

ئەمەیش پاشکۆبوونێکی رێژەییە و بەسەر کەسەکەدا ناسەپێندرێ کە خۆی بەگشت وردەکارییەکانی رەنگ بکات و سەدا سەدا بکەوێتە ژێر کاریگەرییەکەیەوە، بەڵکو ئاراستەیەکی گشتیی پێدەبەخشێت و ئەو سەربەستییەی پێدەبەخشرێت کە لە ئەنجامدانی رەفتارەکانیدا ئازادییەکی هەبێت و هێندە خۆی بە وردەکارییەکان نەبەستێتەوە، ئەم سەربەستبوونە لە رەفتارکردندا گۆڕانی رەفتار دەگرێتەوە بەشێوەیەك لەگەڵ هەلومەرجی ژیانی نوێ بگونجێت، واتا گونجان و وێکچوون لەم دۆخەدا نوێ دەکرێتەوە و لەگەڵ هەلومەرجی هەنووکەییدا رێتەدەکات و دەگونجێت،

بۆنموونە: ئێمە زۆربەی ڕێگەکانی ژیانمان دەگۆڕین، جا چ لە خۆراک و پۆشاک بێت یانیش لە مامەڵە و ڕەفتارکردن بێت لەگەڵ خەڵك (لە دۆخی جەنگ) ئەوساکە ئەو گونجان و وێکچوونە لەلایەن ئێمەوە دەبێتە گونجان و وێکچوونی جوولە.

## ئەو هۆکارانەی کار لە هەڵوێستی وێکچوون و گونجان دەکەن

ئەمانەی خوارەوە گرنگترین ئەو هۆکارانەن کەوا کاریگەریی لە هەڵویستی وێکچوون‌و گونجان دەکەن هەروەك چۆن لە لێکۆڵینەوەکانی Asch & Crutch و Field و چەندانی دیکەدا بەدیارکەوتوون

**یەکەم: هۆکاری کەسی**

١. **هۆکارەکانی ئەقڵی:** لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە گونجاو و وێکچووەکان زیرەکییان لە نەگونجاو و وێکنەچووەکان کەمترە و لە ڕووی هزریشەوە هەژارن و لە کردەکانی درککاریشدا چەقبەستوو و وەستاون.

٢. **هۆکارەکانی پاڵنەری:** لە پێوەرەکانی کەسیدا ئەوە بەدیارکەوتووە کە گونجاو و وێکچووەکان لە هێزی (منێتیدا) کەمترین نمرە و کەمترین توانای بەرهەڵستیکردنی فشاریان هەیە، ئەوەش روونبووەتەوە کە گونجاو و وێکچووەکان لەرووی ویژدانییەوە زۆر ڕەق و چەقبەستوون، هەروەها لەخۆوەبیان (تلقائی) کەمترە و پاڵنەرەکانیان زۆر دەچەپێنن و نیگەرانتر دیارن.

هەروەها ئەوەیش دۆزراوەتەوە کە ئەو جۆرە کەسانە بەرەو هەستکردن بە کەموکورتی بێتوانایی دەچن و متمانەیان بەخۆیان نییە.

لەو هۆکارانەی کار لە هەڵوێستی گونجان و وێکچوون دەکات ترس و نیگەرانییە، چوونکە ئەو کەسانەی لەهەندێ ئەزمووندا نیگەرانییەکی زۆریان هەبوو لەگەڵ سرووشی کەسانی دیکە پتر گونجانیان پیشان دەدا. هەروەها ئەوەش روونبووەتەوە ئەو کەسە نیگەرانانەی پێشبینی ئەوەیان دەکرد هێدمەی کارەبایی لێیان بدات، لە خەڵکانی دیکە پتر خۆیان لەگەڵ کاریگەرییەکانی هەڵوێستەکەدا دەگونجاند.

٣. ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە ئاراستە و بەهاکانەوە هەیە: ئەوە روونبووەتەوە کە گونجان چەند ئاراستە و بەهایەکی تەقلیدی و ئاکاری پیشان دەدات کە زۆر لە نەگونجاوەکان پترە، لەبەر ئەم هۆیە کەسی گونجاو و وێکچوو چەند حەزێکی دیاریکراوی پیشەیی هەیە، بۆنموونە: دەبینین ئەو کاروپیشانە هەڵدەبژێرێت کە جەخت لەسەر بەها تەقلیدییەکانی کۆمەڵایەتی دەکەنەوە، وەك: کاروباری پۆلیس و کارە نووسینگەییەکان و کاری بانکەکان و هتد.

بەڵام کەسی نا نەگونجاو و وێکنەچوو حەز و مەیلی لەگەڵ حەز و مەیلی ئەو پیشانە دەگونجێت کە پێویستیان بە داهێنانی هونەری و دۆزینەوەی زانستییەوە هەیە، وەك هونەرمەندان و موسیقییەکان و نووسەر و رۆژنامەوانان و زانایانی بیرکاری و فیزیا و ئەندازیارانی بیناسازی.

سەبارەت بەو شتانەی پەیوەندییان بە ئاراستەکانی دایبابیەوە هەیە، ئەوە بینراوە کە گونجاو و وێکچووەکان دایبابانیان وەك وێنەیەکی نموونەیی دەبینن، بەڵام کەسانی نا نەگونجاو ناسازگار لە حوکمدانیان لەسەر دایبابانیان کەسانی بابەتین ئینجا چ لە ستایشکردن بێت یانیش لە لۆمەکردنیان بێت. دایك و باوکی گونجاو و لەباریش بەوە

دەناسرێنەوە کەوا لە پەروەردەکردنی منداڵانیان ئاراستەی تەقلیدیی توندوتیژیان هەیە، لەکاتێکدا کەسانی نەگونجاو و نالەبار کەسانی نەرم و لێبووردەن.

٤. ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە پەیوەندیی هەیە لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا: ئەوە روونبووەتەوە کەوا کەسی گونجاو و لەبار زۆر بە خەڵکانی دیکەوە سەرقاڵە، بەڵام کەسانی نا لەبار و نەگونجاو سەرقاڵییەکی کەمتری هەیە، ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ پشتبەخۆبەستان و ئاراستە سەربەخۆییەکانی. ئەوەیش روونبووەتەوە کەوا پەیوەندییەکانی کەسی گونجاو و لەبار بەخەڵکانی دیکەوە مۆرکێکی نەرێیی هەیە، واتا پشت بە خەڵکانی دیکە دەبەستێت، لەهەمان کاتیشدا ئاراستەکانی متمانە نەکردن بەخەڵکانی دیکە لە دەروونیدا پێکدێت.

## دووەم: هۆکارەکانی هەڵوێستی

### ١. ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە هەیە

ئەلف) قەبارەی کۆمەڵە: هەرچەندە قەبارەی کۆمەڵە گەورەتر ببێت، فشاری لەسەر تاك پتر دەبێت بۆئەوەی خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێت. بەڵام ئەم کاریگەرییەی قەبارەی کۆمەڵە لە ئاستێکی دیاریکراودا دەوەستێت، جا ئەگەر قەبارەی کۆمەڵەکە دوای ئەمە پتربوو ئەم زیادبوونە هیچ کاریگەرییەکی نامێنێ. Asch ئەوەی دۆزیوەتەوە کاتێ کەسی بەرهەڵستکار بەتەنها یەك کەسە، ملکەچکردن بۆ بەرهەڵستیەکەی زۆر کەم دەبێت واتا کەسی دیکە زۆر بەکەمی لەگەڵیدا دەگونجێت. کاتێکیش دووکەس بەرهەڵست دەبن کەسی دیکە کەمێك ملکەچیان دەبێت، بەڵام بە بوونی سێ یان چوار بەرهەڵستکار ملکەچیی کەسەکە دەگاتە ترۆپك بەشێوەیەك ملکەچی و گونجانی لەگەڵیاندا یەکسانە بە ملکەچی و خۆگونجاندن لە هەمبەر پەنجا

کەس و پتر. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە یەك کەس کاریگەریی بەسەر ئەوی دیکە نابێت، چوونکە راوبۆچوونی بەرهەڵستکارانە لەگشت هەلومەرجێکدا هەیە، ئەگەر دووکەس شتێکی درکپێکراوی لێڵیان بینی زۆر سانایە ئەو دووکەسە یەکێکیان راوبۆچوونی ئەوی دیکە بگوڕێت تاکو لەگەڵ راوبۆچوونی هاوڕابێت.

ب) کۆدەنگی و کۆ رایی لەنێو ئەندامانی کۆمەڵەدا: کاتێ ئەندامێکی کۆمەڵە دژ بە راوبۆچوونی کۆمەڵەکە دەبێت و بەرهەڵستیی دەکات، رەنگە کاریگەرییەکی بەهێز لە ئاستی یەکگرتوویی ئەو ئەندامانەی کۆمەڵە بکات کەوا پشتگیریی ئەو رایە دەکەن، چوونکە ئەگەر وەها رێککەوت کە ئەندامانی دیکە پشتگیریی لە بۆچوونە دژەکە بکەن رەنگە ببێتە هۆی دووکەرتبوونی کۆمەڵەکە و رای دژ و بەرهەڵستکاریش بەهێز ببێت، جا لێرەدا بوونی کەمینەیەکی بەرهەڵستکار بەدیاردەکەوێت.

ج) فراوانبوونی بواری کۆمەڵایەتیی کۆمەڵە: کۆمەڵە تەنها بەشێوەیەکی خۆپێبەسبوون (اکتفاء الذاتی) ناژیەت، بەڵکو دەبێتە بەشێکی بواری کۆمەڵایەتی کە لە بازنەکەی خۆی فراوانترە، وەك بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و هەلومەرجی مێژوویی. رێژەی ئەو گونجانەی کە فشاری بەکۆمەڵ دەیسەپێنێ بەو بوارە فراونترە کاریگەر دەبێت، بۆنموونە کاتێ کەشی گشتی رێبازێکی دیاریکراوی سیاسی رەتدەکاتەوە، حەزی ئەندامەکانی کۆمەڵەکە بەرەو خۆگونجاندن لەگەڵ کەشی گشتیی ئەم رەتکردنەوەیە بەهێزتر دەبێت.

د) یەکگرتوویی و پتەویی کۆمەڵە: لەتێبینیەکانی ژیانی رۆژانەماندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو کۆمەڵانەی زۆر یەکگرتوون بۆ بڵاوکردنەوەی تجانس لەنێوان ئەندامەکانیاندا بەتواناترن.

هـ) وەدیهێنانی ئامانجی بەکۆمەڵ: ئەمەیش کاریگەریی کۆمەڵە بەهێزتر دەکات و یارمەتیدەری گونجان دەبێت کاتێ کۆمەڵە ئامانجێکی دەبێت و دەیەوێ وەدیبهێنێ.

## ئەو هۆکارانەی وابەستەی پەیوەندیی تاکن بە کۆمەڵەوە:

ئەلف) پێگەی کەسانی بەرهەڵستکار لە کۆمەڵەدا بەنیسبەت تاك و بۆچوونی لەهەمبەریاندا، ئایا وەها تەماشایان دەکات بەوەی کە پێگەیان لەو بەرزترە. ئەگەر ئەمە روویدا ئەوا کاریگەرییان بەسەریدا زۆر دەبێت و بەئاسانی لەگەڵیاندا دەگونجێت، بەلأم ئەگەر لەگەڵی جیاوازبوون و لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی کە لەهەمبەریاندا هەست بە یەکسانی دەکات، ئەوا جیاوازیی نێوان خۆی و خۆیان ململانێیەکی توندوتیژ لە دەروونیدا دروست دەکات.

هەروەها شتێکی دیکەش کاریگەریی بەسەر پێکهاتەی کۆمەڵە دەکات ئەگەر هاتوو ئەم کۆمەڵەیە کۆمەڵەی هاوڕێیان یان کۆمەڵەی بێگانەکان بوون، لەنێوان هاوڕێیاندا تاك هەست بە ئاسایش دەکات بۆیە لەوە ناترسێ لەگەڵیان نەگونجێت، بەلأم لەلایەکی دیکەوە رێز لە راوبۆچوونی هاوڕێیانی دەگرێت. لێرەوە لەگەڵیان رێکدەکەوێت و لەوە دەترسێت رێز و خۆشەویستیان لە دەست بدات ئەگەر بێت و دژیان بوەستێتەوە. ئەگەر تاکیش لە کۆمەڵەدا تاك و نامۆ بوو، هەستکردنی وەك هەستی ئەو پیاوە پەراوێزخراوە دەبێت کە سوورە لەسەر بەدەستهێنانی هەستوسۆزی کۆمەڵە و پەسندکردنیان، بۆیە زۆر بەئاسانی لەگەڵیاندا دەگونجێت.

ب) پێگەی تاك لە کۆمەڵەدا: هەرچەندە پێگەی تاك لە کۆمەڵەدا بەرزبوویەوە ئەگەری گونجانی کەمتر دەبێتەوە، چوونکە ئەو کەسەی پێگەیەکی ئابووری هەیە

پاڵنەری بۆ خۆگونجاندن لاواز دەبێت و نایەوێ پێگەیەکی دیکە لەهی ئەو بەرزتر بێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا حەزێکی زۆری هەیە بۆ ئەوەی لە پێوەرەکانی کۆمەڵە لانەدات بۆ ئەوەی پێگەی خۆی لەدەست نەدات. هۆڵندێر پێیوایە کە هەرچەندە پێگەی تاك لە کۆمەڵەدا بەرزبوویەوە ترسی لە لادان لە پێوەرەکان زۆرتر دەبێت واتا سوورە لەسەر ئەوەی لەو شتانە لانەدات کەوا کۆمەڵە چاوەڕوانییان لێی هەیە لەسەری بڕوات.

ج) پێگەی سۆسیۆمەتریانەی تاك لە کۆمەڵەدا: Harvey and Consalvi پەیوەندیی نێوان گونجان و پەسندکردنیان (لەلایەن کۆمەڵەوە) شرۆڤەکردووە و شیمانەی ئەوەیان کردووە کە هەرچەندە پلەی سۆسیۆمەتریی تاك بەرزبوویەوە، واتا هەرچەندە پلەی پەسندکردنی تاك لەلایەن کۆمەڵەوە بەرزبوویەوە، ئەگەری گونجانی لەگەڵ کۆمەڵەدا کەمتر دەبێتەوە و پلەی ئەم گونجانەیش دادەبەزێ. ڕاستیی ئەم شیمانەیە سەلمێنراوە و لە دەرەنجامەکانیشدا ئەوە روونبووەتەوە کە ئەو کەسانەی زۆرترین پشکیان لە ستایش و پەسندکردنی کۆمەڵەدا هەیە، کەمترین گونجانیان لەگەڵیدا هەبووە، دوای ئەویش نەگونجاو و نالەبار کەمترین پشکی لە ستایش و پەسندکردن هەیە لەلایەن کۆمەڵەوە، بەڵام ئەوەی نێوەڕاستی دارەکەی گرتووە و کەوتووەتە نێوەندەوە لە پلەی ستایش و پەسندکردنی کۆمەڵەوە لەهەمبەر ئەودا ئەوا لەهەموویان پتر لەگەڵ کۆمەڵەدا گونجاو بووە.

٣. ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە بابەتی گونجانەوە هەیە ، واتا پەیوەندییان بە وروژێنەر و ئاگادارکەرەوە هەیە:

ئەلف) لێڵیی وروژێنەر و ئاگادارکەرەوە: هەرچەندە وروژێنەر یان بابەتی درککردنەکە بۆ کەسەکە لێڵ بێت زیاتر حەزی کردووە لەگەڵ حوکمی کۆمەڵەدا

بگونجێت، واتا جوولەکانی بەرەو گونجان بەهێزتربووە، پشتڕاستکردنەوەی پڕوپاگەندە باشترین نموونەی ئەم دۆخەیە.

ب) سەر لێتێکچوونی تاك سەبارەت بە جیاکردنەوەی نێوان وروژێنەرەکان: بۆنموونە کاتێ داوا لە کەسێك دەکرێت حوکم لەسەر کۆمەڵێك بینراو بدات بۆ ئەوەی یەکێکیان هەڵبژێرێت و لەگەڵ وروژێنەرێکی دیکە بەیەکی بگرێت و بەیەکتریان بچوێنێ، دوودڵییەکەی توندتر دەبێت ئەگەر هاتوو ئەو شتە بینراوانە وێکچوو بن، بۆنموونە ئەگەر لە درێژیدا لەیەکتری نزیك بن، لەم دۆخەدا متمانەی بەخۆی کەمتر دەبێتەوە و پتر پشت بە خەڵکانی دیکە دەبەستێت.

ج) نزیکبوونەوەی حوکمەکان لەسەر وروژێنەرەکەدا: هەرچەندە حوکم و داوەریی تاك لە حوکم و داوەریی خەڵکانی دیکە نزیکتر بوو، بۆ وەرگرتنی راوبۆچوونی خەڵکی حەزی بەهێزتر دەبێت، واتا گونجان روودەدات هەروەك چۆن جیاوازیی نێوان حوکمی تاك و کۆمەڵە کەم بوو، چوونکە لەم دۆخەدا زۆر ئاسانە تاك داوەری و حوکمێك قبوولْ بکات کە زۆر بە حوکمی خۆی بچێت لەوەی حوکمێك هەڵبژێرێ کە زۆر لە حوکم داوەرییەکانی دوور بێت.

## نمرەکانی گونجان

Charles and kiesler گرنگیی لەیەکتر جیاکردنەوەی نێوان تەنها ملکەچی و ملدان و نێوان ئەو گونجانەیان روونکردووەتەوە کە لەسەر بنەمای قبولکردنی کەسی تایبەتەوە داڕێژراوە. چەندان بەڵگە و شایەتیان هێناوەتەوە و دەیسەلمێنن کە ئەو فشارە توندەی ئامانجی ملپێکەچکردنە رەنگە وەها لە تاکەکەس بکات خۆی لەگەڵ کۆمەڵەدا بگونجێنێت، بەڵام تەنها کاریگەرییەکی سادەی لە وەدیهێنانی قبوڵی تایبەتی

تاکدا دەبێت. فشاری زۆر لەسەر تاکەکانی کۆمەڵە چەکێکی دووسەرەیە و رەنگە وەها لە تاك بکات پتر بەرهەڵستیی ئاراستە و رەوتەکانی کۆمەڵە بکات.

لەسەر بنەمای دەرەنجامی زۆربەی لێکۆڵینەوەکان، روونبووەتەوە کە گونجان چەند ئاست و نمرەیەکی هەیە، ئەوانیش:

١. گونجانی رووکەشانەی بەرچاو، واتا گونجانی دیار بەبێ گونجانی ناوەکی، ئەمەیش لەو کاتەدا روودەدات کە تاك ملکەچی داواکارییەکانی کۆمەڵە دەبێت و لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجە بەکۆمەڵەکان و کەسییەکان دان بە راوبۆچوونەکانیدا دەنێت، ئاشکرایە کە ئەمە لەسەر بنەمای بیروباوەڕی تاك نییە. زۆربەی جار ئەم جۆرە گونجانە فریسییە (نفاق).

٢. گونجانی ناوەکی یان یەکگرتن و ئاوێتەبوونی خودی لەگەڵ کۆمەڵەدا، ئەم جۆرە گونجانە رێککەوتنێکە لە دەرەوە و ناوەوە لەگەڵ کۆمەڵەدا، ئەم جۆرە گونجانە لەگەڵ راوبۆچوون و رەفتاری کۆمەڵە دەرەکی و ناوەکییە، بەڵام جۆرە گونجان و وێکچوونێکی تەواو نییە و ناگاتە قوڵترین ئاست. چوونکە تەنها تا ئەو ئاستە بەنێو دەروونی تاکدا قووڵ دەبێتەوە کە وەها بکات تاکەکە لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا بگونجێت، واتا بەرێژەی ئەنجامدانی ئەو رۆڵەیە کە خەڵکانی دیکە چاوەڕوانن ئەنجامی بدات.

٣. گونجانی باوەڕ (ایمان): لەو کاتەدا دێتەدی کاتێ گونجانی رووکەش و بەرچاو دەبێتە باوەڕهێنان بەو بەهایانەی کە تاك لەپێناویدا رێگە دەبڕێت. بەڵام ئەم جۆرە گونجانە چەند نمرەیەکی هەیە،بەو مانایەی هەندێ جار رەهایە و هەندێ جاریش رێژەییە، ئەمەیش بەندە بە رێژەی ئەو سوودانەی کەوا بەهاکان دەیهێننە دی،

ئایەتێکی قورئان هەیە کە گوزارشت لەم جۆرە گونجانە دەکات، ئایەتەکە دەڵێت (قالت الأعراب آمنا قل لم تؤمنوا قولوا أسلمنا ولما یدخل الأیمان في قلوبکم) (سورة الحجرات) مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە کە باوەڕ لەلای ئەم نەتەوەیە هێشتا نەگەیشتووەتە پلەی ئەو باوەڕە رەهایەی کە لەسەر بنەمای وەرگرتن و هەڵمژینی تەواوی بەهاکانی نێو ئیسلام بونیادنراوە.

# ئاراستە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان

# Social Attitudes

## پێشەکی

ئاراستە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان بە گرنگترین دەرەنجام و بەرهەمی کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتی دادەندرێن، لەلای گشت تاکێک پێکدێت و لەهەمبەر تاك و کۆمەڵەو دەستگە و هەڵوێستەکاندا چەند ئاراستەیەك گەشەپێدەدات.

هێربرت سپێنسەری فەیلەسووفی ئینگلیزی یەکەم کەس بووە کە لەساڵی ١٨٦٢دا ئەم زاراوەیەی بەکارهێناوە، کاتێ گوتی: گەیشتنمان بە چەند ئەحکامێکی دروست لە پرسە وروژێنەرەکانی زۆربەی بێژبازییەکاندا، بەرادەیەکی زۆر پشت بە ئاراستە ئەندێشەییەکەمان دەبەستێت کاتێ گوێ لەم بێژبازییە رادەگرین و بەشداریی تیادا دەکەین.

لەو بابەتانەی کە زۆربەمان ئاراستەمان لەهەمبەریاندا پێکهێناوە، پرسەکانی ئاین و هاوسەرگیریی زوو و هێنانی ئافرەتێکی کارگەر و رێکخستنی رادەی وەچەخستنەوە و خوێندنی کچ لە خوێندنی باڵا و پیشەی وانەگوتنەوە بە بێگانەکان و کارە سەربەستە سەرمایەدارییەکان و سۆسیالیزمییەکان و تێکەڵبوونی هەردوو رەگەز و هتد.

# پێناسەکردنی ئاراستە

* دۆخێکی ئامادەیی و تەیاربوونی دەماری و دەروونی و رێکخستنە لە میانی شارەزایی تاك و کاریگەرییەکی ئاراستەکارانە و دینامیکیانەی لەسەر کاردانەوەی تاك دەبێت بۆ گشت ئەو بابەت و هەڵوێستانەی کە کاردانەوەکە دەیوریوژێنێ.

* رێکخستنێکی وەرگیراوە و سیفەتی بەردەوامبوونێکی رێژەیی ئەو بیروباوەڕانەی هەیە کە تاك لەهەمبەر بابەتێك یان هەڵوێستێکدا پێکیدەهێنێت و ئامادەی دەکات بۆ ئەوەی کاردانەوەی هەبێت، کاردانەوەکەشی لەلای خودی تاکەکەدا باشتربوونێکی هەیە.

* خولیا و ئاراستەگریی و ئامادەیی پێشوەختەی تاکە بۆ هەڵسەنگاندنی بابەتێك یان هێمایەکی ئەو بابەتە بە رێگەیەکی دیاریکراو.

* ئامادەییەکی دەروونی یان ئامادەباشییەکی ئەقڵیی دەماریی وەرگیراوە بۆ کاردانەوە و وەڵامدانەوەیەکی ئەرێیی یان نەرێیی بەرەو کەس و شت و بابەت و هەڵوێست و هێماکانی ئەو ژینگەیەی کە ئەم کاردانەوەیەی تیادا دەوروژێنێ.

* دۆخێکی ئامادەیی ئەقڵی و دەمارییە کە لەمیانی ئەزموونەکان و شارەزایی پێشووی مرۆڤ پێکهاتووە و کار بۆ ئاراستەکردنی کاردانەوە و وەڵامدانەوە دەکات بەرەو ئەو بابەت و هەڵوێستانەی پەیوەندییان پێیەوە هەیە.

* حەزکردنی بە هەستکردن و رەفتارکردن و بیرکردنەوە بە رێگەیەکی دیاریکراو لەهەمبەر خەڵکانی دیکە و رێکخراوەکان و بابەتەکان و هێمایەکان.

# تایبەتمەندییەکانی ئاراستە

– ئاراستەکان وەرگیراون و مرۆڤ فێریان دەبێت و شتێکی بۆماوەیی و زگماکی نین.

– پەیوەندیی بە وروژێنەرەکان و هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتییەوە هەیە.

– لە بۆشاییدا دروست نابێت، بەڵکو بەردەوام پەیوەندیی نێوان تاک و بابەتێك لە بابەتەکانی ژینگە لەخۆیدەگرێت.

– بەپێی ئەو وروژێنەرانە دەگۆڕێت کە پەیوەندییان پێی هەیە و لێی جیاوازن.

–پتر لایەنی خودی بەسەریدا زاڵە نەك بابەتی.

– هەندێکیان لێڵن و هەندێکیان روونن.

– هەندێکیان بەهێزن و بەرهەڵستی دەستکاریکردن و هەموارکردنەوە دەکەن و هەندێکیشیان دەستکاریکردنیان ئاسانە.

– ئاراستە بە ئامراز و شێوازی جۆراوجۆر دەپێورێت و هەڵدەسەنگێنرێت.

– ئاراستە بەردەوام دەکەوێتە نێوان دوو لایەنی بەرانبەر کە یەکێکیان ئەرێییە و ئەوی دیکەشیان نەرێییە و بریتین لە پشتگیریکردنی رەها و بەرهەڵستیکردنی رەها.

# پێکهاتەکانی ئاراستە

★ **پێکهاتـەی مەعریفیانـەی ئاراستە:** پێکهاتـەی مـەعریفی بریتییـە لـە گشت ئـەو کردە درککاری و بیروباوەڕ و هزرانەی کە پەیوەندییان بـە بابـەتی ئاراستـەوە هەیـە و گشت ئەو بیانوو وبەڵگانەی تاك دەگرێتەوە کە لەپشت پەسندکردنی بابەتی ئاراستەکە دەوەستن، جا ئەگەر بابەتەکە لە کرۆکی خۆیدا کردەیەکی بەباشتردانانی بابەتێك بێت لـە بابـەتێکی دیکـە ئـەوا کردەکـە پێویـستی بـە هەنـدێ پرۆسـەی کرداریـی وەك جیاکردنـەوەو تێگەیشتن دەبێـت، پێکهاتـەی مـەعریفیی ئاراسـتەش لـەدۆخی پێـوانی ئاراستەی هەمبەر ئافرەت ڕووندەبێتـەوە لەئاست کاردا، ئەمـەیش لـە ئاسـتی توانـای کارکردن و ئەنجامدانی کارەکەدا بەدیاردەکەوێت.

* **پێکهاتـەی سـۆزیانەی ئاراسـتە (هەڵچوونی):** لـەمیانی هەسـتو سـۆز و حـەزی کەسێك لەهەمبەر بابـەتێك و ڕادەی ڕووتێکـردن و پەسـندکردن و خـۆ لـێ دوورگـرتن و خۆشەویـستی و ڕقـی لەهەمبەریـدا بەدیاردەکـەوێت، هـەروەها پێکهاتـەی سـۆزیانەی ئاراستە لەمیانی ئەو وروژانەدا بەدیاردەکەوێت کە پرسی چـوونەدەرەوەی ئـافرەت بـۆ کار و دڵخۆشی و ڕقی هەندێ کەس لەهەمبەر ئەم پرسەدا بەدیاردەکەوێ.

★ **پێکهاتــەی ڕەفتاریانــەی ئاراســتە، پێکهاتــەی کــارکرد (الاداء) یــان خولیــا و ئاراستەگریی بۆ ئەنجامـدانی کار:** پێکهاتـەی ڕەفتارییانـەی ئاراسـتە لـە کاردانـەوەی کردەی هەمبەر ئاراستە بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان بەدیاردەکەوێت، چـوونکە ئاراسـتەکان وەك ئاراستەکارەکانی ڕەفتاری مرۆڤ کار دەکەن و پاڵی پێـوە دەنـێن کـارێکی نـەرێیی ئەنجام بدات کاتێ ئاراستەی نەرێیی دەبێت لە هەمبەر بابەتـەکانی دیکـەدا، پێکهاتـەی ڕەفتاریانەی ئاراستە لەهەمبەر دەرچوونی ئافرەت بۆ کارکردن لـە بەجێهێـشتنی مێـرد لەلایەن ژن و ژن لەلایەن مێرد و منداڵ لەلایەن باوکەوە بەدیاردەکەوێت.

# پەیوەندیی نێوان پێکهاتەکانی ئاراستە

پێکهاتەکانی ئاراستە بەچەندین هۆکاری جۆراوجۆر کاریگەر دەبن، لەو هۆکارانە دەوروبەرە بە چەمکە فراوانەکەی، جا ئەگەر خانەوادە بێت یان فێرگە و کۆمەڵگە بە خوو و عادەت و بەها باوەکانیەوە. ئاراستەکان لە واقیعی هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و لەمیانی کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتی و سیستمی ئاینی و ئاکاری و ئەزموونەکانی کەسیی نێو هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی هەڵدەقوڵێت، بۆنموونە: پێکهاتەی رەفتاری بە یاسا بەرزەفتکارەکانی منی بالاَ و فشارەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کاریگەر دەبێت، پێکهاتەی مەعریفیش بەو بەڵگەو راستییانە کاریگەر دەبێت کەوا خەڵکی خاوەن راوبۆچوون و شارەزا و بەرنامەی زانستی و ئاینی و رۆشنبیری لەبەر دەستیانە و لەمیانی ئامرازەکانی راگەیاندن پەخش دەکرێن. بەڵام سەبارەت بە پەیوەندیی ئەم پێکهاتانە بەیەکترییەوە، لەنێوان تایبەتمەندییەکانی ئاراستەدا دەتوانین وێنای بوونی پەیوەندییەکی نەرێیی بکەین، بۆنموونە کاتێ باوکێك باوەڕی بە چوونە دەرەوەی کوڕەکەی هەیە بۆ ئەوەی بچێتە بازاڕ و شت بکرێت بەڵام لە رووی هەڵچوونییەوە ئاسوودە نییە بەوەی کوڕەکەی بەتەنها بتوانێ ئەم کارە بکات، هەروەها لەهەمان کاتیشدا رێگەی پێنادات بچێتە دەرەوە، لەبەرئەوە پێشبینیی ئەوە ناکرێت کە لەم دۆخەدا مامەڵەکانی پەیوەندیی بەرزبن.

لە خوارەوەدا باس لەو دەرەنجامانە دەکەین کەوا لێکۆڵینەوەکان لەبارەی گونجانی پێکهاتەکانی ئاراستەکانەوە پێی گەیشتوون

**یەكەم: گونجانی پێكهاتەكانی ئاراستە لە رووی هێزەوە:**

لێرەدا هێز واتای توندیی ئاراستەكە دەگەیەنێت و پێكهاتەكانی ئاراستە لەم سێ جۆرەی خوارەوەدا بەهێز و بێهێز دەبن:

١- **پێكهاتەكانی مەعریفی:** هێزێكی زۆری هەیە ئەگەر هاتوو زانیاریی كەسە خاوەن ئاراستەكە لەهەمبەر بابەتی ئاراستەكەدا زانیاریی ئەوتۆبن كە بابەتەكە لەبەرچاوی وەهالێدەكەن زۆر باش یان زۆر خراپ بێنە بەرچاو، جا لەنێوان ئەم دوو جەمسەرەدا چەند پلەیەكی باشی و خراپی هەن، واتا ئەم زانیاریانە زۆر بەتوندی پشتگیری لە بابەتەكە دەكەن یانیش زۆر بەتوندی دژی دەوەستنەوە.

٢- **پێكهاتەكانی ویژدانی:** ئەگەر هاتوو لەهەمبەر ئەو بابەتەی كە ئاراستەكە بۆی دەچێت وزەیەكی ویژدانی زۆر ئەرێیی و وزەیەكی ویژدانی زۆر نەرێیی هەڵبگرێت زۆر بەهێز دەبێت. واتا یان بەتەواوی روو لە بابەتەكە دەكرێت خۆشویستییەكی زۆر لە هەمبەریدا دەبێت، یانیش رق و خۆ دووركرتن لەهەمبەر بابەتەكەدا پەیدا دەبێت، لەنێوان ئەم دوو لایەنەش چەند پلەیەكی هێز و بێهێزی هەن.

٣- **پێكهاتەكانی كرداری:** ئەگەر هاتوو ئامادەیی كەسە خاوەن ئاراستەكە كارابێت زۆر بەهێز دەبێت، بەڵام ئەنجامدانی كار یارمەتیدەری بابەتی ئاراستەكە دەبێت یان دەیپارێزێت، یان ئەگەر ئامادەیی كەسەكە بۆ زیانگەیاندن بەو بابەتە و دژایەتیكردن و وێرانكردنی ئامادەییەكی تەواو بێت، لەنێوان ئەم دوو لایەنەشدا چەند پلەیەكی هێز و بێهێزی هەن.

**دووەم: گونجانی پێکهاتەکانی ئاراستە لە رووی جۆراوجۆربوونی رەگەزەکانی**

جۆراوجۆریی رەگەزەکانی گشت جۆرێك لە جۆرەکانی پێکهاتەکانی ئاراستە، بەم شێوەیەی خوارەوە بەدیار دەکەون:

**١- پێکهاتەکانی مەعریفی:** ژمارەی رەگەزەکانی لە کەمترینی ئەو زانیاریانەوە دەگۆڕێن کە تاك لەبارەی شتێکەوە وەدەستیان دەهێنێ تا دەتوانێت شتەکانی دیکە لەیەکتری جیابکاتەوە و دواتر دەگاتە ئەو ئاستەی زانیارییەکی تەواوی لەهەمبەر شتەکەدا هەبێت و کۆمەڵێك بیروباوەڕ و هزری لەبارەوە پێکدەهێنێ.

**٢- پێکهاتەکانی ویژدانی:** بەنیسبەت ژمارەی رەگەزەکانی دەگۆڕێت و لە سۆزێکی ئەرێیی یان نەرێیی لەهەمبەر بابەتی ئاراستەکەوە بۆ کۆمەڵێکی گەورەی هەستەکانی هەمبەر ئەو بابەتە، رەنگە کەسێك لەهەمبەر کەسێك هەست بە هاوڕێیەتی و سۆز و رێزگرتن و سەرسامبوون بکات و لەهەمبەر کەسێکی دیکەشدا تەنها هەست بە کەمە مەیلێك بکات.

**٣- پێکهاتەکانی کرداری:** لەرووی ژمارەی رەگەزەکانیەوە جیاوازە لە تەنها ئامادەییەکی کرداری بۆ یارمەتیدانی بابەتێك و یان هێرش بردنە سەری دەستپێدەکات تا دەگاتە کۆمەڵێکی گەورەی ئامادەیی کرداری لەهەمبەر ئەم بابەتەدا، چوونکە ئەو کەسەی ئاراستەی پشتگیریکردنی عەرەبی هەیە لە هەڵوێستیان دژ بە ئیسرائیل ، رەنگە بەشێوەیەکی مادی و مەعنەوی ئامادەیی یارمەتیدانی عەرەبی هەبێت و وەك بەرگریکارێك لە پرسەکەیان ببێتە هاوسەنگەریان- هەروەها رەنگە جگە لە پشتگیریکردن بە قسە هیچ ئامادەییەکی کرداریی نەبێت.

Kaiz and Stotland ١٩٥٩ لە زانکۆی میشیگانی ئەمریکادا لێکۆڵینەوەیەکی سەبارەت بەو گونجانە کرد کە لەئەنجامی پەیوەندی و وابەستەیی نێوان جۆرەکانی ئاراستەکان سەری هەڵدابوو، لەرووی ژمارەی پێکهاتەکانی هەر جۆرێك، بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاراستەکانی دابەشکردووەتە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

١- ئەو ئاراستانەی پشت بە پێکهاتە ویژدانییە زۆرەکان دەبەستن و لە بەرانبەریاندا تەنها کەمترین ژمارەی رێتێچووی پێکهاتەکانی مەعریفی و کەمترین مەیلی کرداری هەن.

٢- ئەو ئاراستە ئەقڵیانەی کە پێکهاتەی مەعریفیی زۆریان هەیە جگە لە پێکهاتە ویژدانییە بە ژمارە کەمەکان و ئامادەیی کردارییان نییە، ئەم جۆرە ئاراستانە وەك ئەوانی پێش خۆی یارمەتیی پێشبینیکردنی وردی رەفتاری ئایندەیی نادات.

٣- ئەو ئاراستانەی ئامادەییەکی کردارییان هەیە و لەهەمبەر ئەو بابەتانەی کەوا کەسەکە بەشێوەیەکی دیاریکراو هەڵیسەنگاندوون چەند حەزێکی کرداری دەنوێنن، لەگەڵ کەمترین ناوەڕۆکی رێتێچووی مەعریفی.

٤- ئەو ئاراستانەی پێکهاتەکانی هاوسەنگن، لە پێکهاتە مەعریفییە بەسوودەکان و ئامادەییە کردارییەکان و پێکهاتە ویژدانییەکان پێکدێت و لەگەڵ پێکهاتە مەعریفی و کردارییەکاندا هاوسەنگیی دەهێننە دی.

بەکورتی و پوختی ئەو سێ جۆرە پێکهاتەیەی ئاراستە بەشێوەیەکی زۆر گەورە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە و هەر یەکێکیشیان بە رێگەیەکی تایبەت کار دەکەن و ئەرکێکی تایبەت ئەنجام دەدەن و چەند زانیارییەك پێشکەش دەکەن کە بۆ تێگەیشتن لە ئاراستەکان یارمەتیمان دەدەن.

# سەرهەڵدانی ئاراستەکان

ئاراستەکانی هەرکەسێك بەهۆی سێ ڕێگەی سەرەکییەوە سەرهەڵدەدەن، ئەوانیش:

یەکەم: پەیوەندیی ڕاستەوخۆ بە بابەتی ئاراستەکە.

دووەم: کەوتنە بەر کاریگەریی ئەو ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیانەی کە گشت لایەنەکانی ژیان دەگرنەوە.

سێیەم: کەوتنە بەر کاریگەریی ڕاگەیاندن دەبێتە هۆی پێکهێنانی ئاراستەی نوێ و گۆڕینی ئەو ئاراستانەی کە پێشتر پێکهاتوون. لێرەدا زۆر بە وردی باس لە گشت ڕێگەکان دەکەین.

**پەیوەندیی ڕاستەوخۆ بە بابەتی ئاراستەکە**

مەبەستمان لە پەیوەندیی بە بابەتی ئاراستەکە لە ڕێگەی شارەزایی و ئەزموونی ڕاستەوخۆیە کە دەبێتە هۆی پێکهێنانی ئاراستە لە هەمبەریدا، دوو جۆرە شارەزایی ڕاستەوخۆ هەن کە چەندان لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونیان بۆ کراوە، ئەوانیش:

١- شارەزایی و ئەزموون لە وەرگرتنی هێدمە و نەهامەتیی لایەنی بەرجەستە. زۆربەی لێکۆڵەران باوەڕیان وەهایە کە تاقیکردنەوە و ئەزموونی هێدمەیی بە بابەتەکە ڕەنگە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ئاراستە بەرەو لای ئەو یان گۆڕانی ئاراستە لەهەمبەریدا، چەندان نموونە هەن کە پشتگیریی ئەم ڕاستییە دەکەن، لەوانە وەرچەرخانەکانی ئاینی و ئەو شڵەژانە نیرۆسیسیانەی کە لە هێدمەکانی جەنگەوە سەرهەڵدەدەن.

٢- شارەزایی و ئەزموونی ڕاستەوخۆ لەسەر شێوەی پەیوەندییەکی دووبارەبووەوە وروژان کەڵەکە دەکات. ئەم جۆرە شارەزایی و ئەزموونە چەندان لێکۆڵینەوەی

لەبارەوە کراوە کە زۆربەیان لەهەمبەر کارلێکی کۆمەڵایەتیی نێو کۆمەڵەبووە لە سەرهەڵدانی ئاراستەکانی ئەندامەکانی کۆمەڵەدا.

## کەوتنە بەر رێکخستنەکانی کۆمەلایەتی گشت لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە

### گرنگترین ئەم رێکخستنانەش :

١. رێکخستنی خانەوادەیی- کە ئەرکی شیاندنی کۆمەڵایەتیانەی منداڵ دەگرێتە ئەستۆ.

٢- ئەو کۆمەڵانەی کەوا نەوجەوان لە رەوتەکانی بەرەو گەیشتن بە قۆناغی پێگەیشتن دەکەوێتە بەر کاریگەرییان و گرنگترینیان کۆمەڵەی هاورێیان و هاوپۆلانی فێرگەن.

٣- ئەو رێکخستنە تایبەتانەی کەوا تاک لە هەلومەرجی تایبەتیدا ملکەچیان دەبێت ، ئەم جۆرە رێکخستنانە کەمتر باون و تەنها ژمارەیەکی کەمی کەسەکان ملکەچیان دەبن، وەك ئەو زیندانە سیاسیانەی کە بۆماوەیەکی زۆر لە بەندیخانەدا بەند دەکرێن و دەکەونە بەر شۆردنەوەی مێشك- یان وەك ئەو کەسە نەرۆسیسیانەی کە بە شیکردنەوەی دەروونی چارەسەر دەکرێن.

### کەوتنە بەر کاریگەرییەکانی راگەیاندن

تاك لە پێکهێنانی زانیارییەکانی سەبارەت بە شتەکان و کەسەکان و سیستمەکان ناتوانێ تەنها پشت بەخۆی ببەستێت، بەڵکو هەر دەبێ بۆ تەواوکردنی ئەو زانیاریانە و دڵنیابوون لە راستییەکانیان پشت بە سەرچاوەی دیکە ببەستێ. منداڵ لەم مەسەلەیەدا پشت بە دایبابی و فێرخواز پشت بە مامۆستاکەی و کەسی دیندار پشت بە پیاوانی ئاینی دەبەستێت. ئێمە بۆ وەرگرتنی زانیارییەکان سەبارەت بە چەندان بابەتی جۆراوجۆر پشت بە ئامرازەکانی راگەیاندن دەبەستین، لە رۆژنامەوانییەوە بگرە

تا دەگاتە رادیۆ و تەلەفزیۆن و هتد. کەواتە بەنیسبەت هەموومانەوە منداڵ و گەنج و پێگەیشتووانمان، زانیارییەکان لە رێگەی نێوەندێکەوە بۆ ئێمە دەگوازرێتەوە نەك بەهۆی رێگەی پەیوەندیکردنی راستەوخۆ بە بابەتی ئاراستەکە، ئامرازی گواستنەوەکەش زمانە، گەرچی هەندێ لێکۆڵەر گرنگیی ئامرازە نا زمانەوانییەکان لە پەیوەندی و کاریگەری زەقتر دەکەنەوە.

## پایەداریی ئاراستەکان

ئاراستە بەوە پێناسە دەکرێت کە بەشێوەیەکی رێژەیی جێگیر و پایەدارە و زۆربەی توێژینەوەکان ئاماژەیان بەم راستییە کردووە، چەند تاقیکردنەوەیەك بۆ پێوانی ئاراستەی گەشەکردنی منداڵانی سپیپێست لەهەمبەر رەشپێستەکان ئامادە کراوە و ئاماژەیان بەوە کردووە کە مامەڵەکانی پەیوەندیی ئەم توێژینەوەیە بە زیادبوونی تەمەنی منداڵ زیاد دەکات، واتا بە پتربوونی گەشەکردنەوە ئاراستەکە بەرەو جێگیری و پایەداریی پتر دەچێت، هەروەها لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان بەدیارخستووە کە جێگیر بوون و پایەدارییەکە لەلای ئەو کەسانەدا سەرهەڵدەدات کە ئاراستەی توندەڕۆیانەی نەرێیی و ئەرێیان هەیە.

دەتوانین بڵێین ئەو ئاراستانەی کە دەکرێ بە پلەیەکی زۆر بە جێگیریان دابنێین و زۆر زەحمەتە بتوانرێ گۆڕانیان بەسەردا بێت، بەتایبەت لە دۆخی:

* هێزی ئاراستەکە و چەسپان و بەرزبوونەوەی بەهایەکەی.
* زیادبوونی پلەی روونبوونەوەی دیمەن و روخسارەکانی ئاراستەی تاك.

## پێشبینیکردنی رەفتار لە ئاراستەدا

لەبارەی ئەگەری پێشبینیکردنی رەفتاری تاك لە ئاراستەکانییەوە ئەوا پشت بە جۆری ئاراستەکە دەبەستێ، بۆنموونە شتێکی کردەییە پێشبینیی بەرهەڵستیی کەسێك بکەین لە هەمبەر بڕیار و فەرمانەکانی دەسەڵات لە بەرهەڵستیکردنی دژ بە پرۆژەکان، هەروەها ئەو کەسەی باوەڕی بە ئاینێکی دیاریکراو هەیە ئەگەری ئەوە هەیە ئاراستەکانی خۆی لەهەمبەر بابەتی دیکەی وەك فێرکردنی منداڵ و هاوسەرگیری بە شتانەوە ببەستێتەوە کە رەنگدانەوەی کاریگەریی بەهاکانی ئاینیی تاکەکەیە و چەمك و تێگەیشتنەکەی لەهەمبەر شتە باش و خراپەکاندا لەمیانی بیروباوەڕەکانیدا روونده‌بێتەوە.

## پەیوەندیی ئاراستە بە ئاراستەی کرداری

ئەگەری ئەوە زۆر زۆرە کە ئاراستەی واچەیی و قسەیی تاك لەگەڵ ئاراستە کرداریيەکەی یەك نەگرێتەوە و وێکچوونیان لەنێواندا نەبێت، لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە ئەنجام دراوە، لەوانە توێژینەوەکەی Zeif، بۆنموونە هەندێ بیروبۆچوونی پڕوپووچی وەك رەشبینی لەهەمبەر ژمارە ١٣ لەلای ئەمریکییەکاندا هەیە، لەکاتی زانینی ئاراستە واچەیی و قسەییەکانیان لەهەمبەریدا ئەوە روونبووەتەوە کە باوەڕیان بەم مەسەلەیە نییە و ئاراستە واچەیی و قسەییەکانیانی بەراورد کردووە و لەمیانی دانانیان لەنێو هەڵوێستەکانی کرداری ئاراستەی کردارییان لەهەمبەر ئەو بیروبۆچوونە پڕپووچەدا روونبووەتەوە، تەنها دوو لەو کەسانەی کە خرابوونە بەر لێکۆڵینەوەکە ئاراستەی کردارییان لەگەڵ ئەو شتەدا چوونیەك بووە کە

بە قسە دەریان بڕیوە، بەڵام ئەوانی دیکە ڕەفتاری کردارییان لەگەڵ ئاراستە واژەییەکاندا نەهاتووەتەوە و وێکچوونیان لەنێواندا نەبووە.

## پێکهاتنی ئاراستەکان

چەند بیردۆزێک هەن کە لێکدانەوە بۆ پێکهاتنی ئاراستەکان دەکەن، پێش باسکردنی ئەو بیردۆزانە باسی ئەو هۆکارە سەرکییانە دەکەین کە لە پێکهاتنی ئاراستەکاندا کاریگەرییان هەیە :

ا) ڕەنگە بۆماوە کاریگەرییەکی زۆر کەمی بەسەر کردەی پێکهێنانی ئاراستەکاندا هەبێت: ئەمەیش لەمیانی جیاوازییە بۆماوەییەکانی تاکەکەسیی وەك هەندێ تایبەتمەندیی جەستەیی و زیرەکی ڕووندەبێتەوە، بەڵام هۆکاری گرنگتر لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا دەورووبەرە بە مانا فراوانەکەی، ئەمەیش لەمیانی کارلێککردن دەبێت لەگەڵ ڕەگەزەکانی.

ب) دایباب ڕۆڵێکی سەرەکی لە کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیانەی منداڵدا دەگێڕن و دەتوانن ئەو ئاراستە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیانەی پێببەخشن، ئەمەیش بە حوکمی کۆنترۆڵکردنی ئەو هۆکارە سەرەکیانەی خوارەوە لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا:

١– پاداشت و سزا (شیرنەمەنی و گەمە و زەردەخەنە بۆ کردن و پەسندکردن و ڕەتکردنەوە و ڕووگرژی و بێبەشکردن لە گەمە و سەیران و پاداشتەکان).

٢– ڕاگەیاندن و ئەو زانیاریانەی لە قۆناغە یەکەمەکانی گەشەکردندا دەگاتە منداڵ: چوونکە منداڵ بۆ وەڵامی گشت پرسیارێکی و ئەو پرسیارە ڕۆژانەییانەی کە بنەمای ئاراستە و بیروباوەڕ و بەها و چەمکەکانی پێکدەهێنێ(خێر، شەڕ، جوان، ناشرین،

هەق، ناهەق، حەلاڵ، حەرام، پەسندکراو، رەتکراوە و هتد.) دەورویەر بە باشترین وەڵامگۆ دەزانێت.

ج) فێرگەش رۆڵێکی گرنگ لە پێشخستن و پێکهێنانی ئاراستەکانی فێرخوازاندا دەگێڕێت، ئەمەیش لەمیانی کارلێکی دەبێت لەگەڵ هاوتەمەن و مامۆستایانی. هاوڕێیانی هاوتەمەن peers لە قۆناغەکانی خوێندندا گرنگترین کۆمەڵەی مەرجەعیی منداڵە. هەروەها چەند رەگەزێکی دیکەی کۆمەڵایەتی هەن کە تاك پەیوەندییان لەگەڵدا دەگرێت و بەردەوامی و بەچەندان شێوەی جیاجیا کارلێکیان لەگەڵدا بەرقەرار دەکات (پۆلیسی هاتووچوو، فرۆشیار، بەقاڵ، کەنناس، پۆستەچی و هتد...).

د) کۆمەڵگەیش بە دابونەریت و بەها باوەکانی و هۆکارە کاریگەرەکانی رۆڵێکی گرنگ لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا دەگێڕێت.

## بیردۆزەکانی لێکدانەوەی پێکهاتنی ئاراستەکان

* یەکەمین بیردۆزەکانی پێکهاتنی ئاراستەکان بیردۆزەکەی هایدرە، ناوبراو پێیوایە کە دوو جۆرە پەیوەندی خۆیان لەپشت ئاراستەکانی هەمبەر کەس و شتەکاندا حەشارداوە، ئەم دوو جۆرەیش بریتین لە:

أ) پەیوەندی یەك (Unit Relationship) وەك قسەی یەکێك کاتێ دەڵێ کتێب دەخوێنێتەوە، ئەم دەستەواژەیە ئاماژە بە پەیوەندیی (یەکەکە) دەکات لەگەڵ کتێبەکەدا کە ئەویش خوێندنەوەیە بەبێ هیچ ئاماژەکردنێك بە ئاراستە و هەڵوێستێکی ویژدانی لە هەمبەر کتێبەکەدا.

ب) جۆری دووەمی پەیوەندییەکە پەیوەندیی سۆزیی (Sentimental)ە کە تیایدا زاراوەکانی وەك رقی لێدەبێتەوە، خۆشیدەوێت، رەتیدەکاتەوە، پێی باشە و هتد تیادا بەکاردێت.

هایدر لە پێکهاتنی ئاراستەکاندا ئاماژە بە جۆر و چەشنە پەیوەندییەك دەکات کە بەسیستمی نیوکمب دەچێت چوونکە دەڵێت کە دووکەسی (ا) و (ب) پەیوەندی و وابەستەیی لەگەڵ یەکتریدا دروستدەکەن و ئەوانیش بە رۆڵی خۆیان پەیوەندی و وابەستەییەکی سۆزی لەگەڵ شت و کەسێکی دیکەدا بەرقەرار دەکەن کە نێوی (س)، هایدر پێیوایە خەڵك حەز بە جۆری پەیوەندییە هاوسەنگەکان دەکەن. ئاراستەی لایەنە پەیوەنددارەکانیش رۆڵێکی گرنگ لە هاوسەنگیی پەیوەندییەکان و نەبوونیشیدا دەگێڕن.

* بیردۆزی دووەمی لێکدانەوەی پێکهێنانی ئاراستەکان بیردۆزەکەی سکنەرە لە فێربوونی مەرجداریی کرداریی ئاراستەکاندا.

خەڵك بەدوای کەمکردنەوەی ئازار و زیادکردنی دڵخۆشیاندا دەگەڕێن و هەوڵی بۆ دەدەن، مرۆڤیش ئەو رەفتارانە دووبارە دەکاتەوە کە دڵخۆشی و شادومانیەکەیانی زیادکردووە، بۆنموونە: ئەو کەسەی لە چێشتخانەیەکدا کە بۆ یەکەم جار رووبتێکردووە داوای سنییەك خواردنی برژاو دەکات و بەو خۆراکە دڵخۆشدەبێت کە پێشکەشی دەکرێت، دووبارە دەچێتەوە چێشتخانەکە و لە ئایندەدا حەز بە داواکردنەوەی هەمان سنییە خۆراك دەکات. سکنەر ناوی لەم جۆرە فێربوونە ناوە فێربوونی مەرجداری کرداری (operant Conditioning) کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

- چێشتخانە= وروژێنەر و ئاگادارکەرەوەی سروشتی.

– داواکردنی سینییەك شتی برژاو– وەڵامدانەوە و کاردانەوە.

– خۆراکە باشەکە– پتەوکردن.

– ئەگەری دووبارە سەردانیکردنەوەی هەمان چێشتخانە و داواکردنی هەمان خۆراك– ئاراستە فێرکراوەکە.

ئاراستەی دەروونیش بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە گرنگترینیان:

١. ڕۆیشتن بە شارەزایی و ئەزموونی تاکەکەسیی بەشەکی کە پەیوەندییان بە بابەتی ئاراستەوە هەیە.

٢. تەواوبوون و کامڵبوونی تاقیکردنەوە و ئەزموونەکان و گونجانیان لە یەکەیەکی هەمەکیدا.

٣. تایبەتمەندی ئەم کۆمەڵە شارەزایی و ئەزموونە و جیاوازییان لە ئەوانی دیکە و بەدیارکەوتنیان لە وێنە و دیمەنەکانی ئاراستەی گشتیی دەروونیدا.

٤. گشتاندن و پیادەکردنی ئەم ئاراستەیە بەسەر ئەو دۆخ و هەڵوێستە تاکەکەسیانەی کە ڕووبەڕووی تاك دەبنەوە و پەیوەندییان بە بابەتی ئاراستەکەوە هەیە.

جا لەبەرئەوەی ئاراستەکان ڕێگەی فێرکراوانەی گونجانن، یان خوو خدەی ئاڵۆزن، ئەوا گەشەکردنەکەی لەسەر چەند بنەمایەکی پێوەریانەی فێربوون دەڕوات کە چۆنیەتیی فێربوونی تاك لەهەمبەر ئەو ئاراستانەدا لێکدەداتەوە، ئەم بنەمایانەش بریتین لە: وابەستی و وەرچەرخان و دابینکردنی پێداویستی.

زۆربەی بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئێمە هەستوسۆزەکان و خولیاکانی کاردانەوە لەمیانی پەیوەندی و وابەستەیی و دابینکردنی پێداویستییەکان و تێرکردنی ڕەمەکەکانەوە فێر دەبین، بۆ نموونە: لەو کەسانەی کە بەهۆی تاقیکردنەوەیەکی ناخۆش پەیوەندی و وابەستەییەکیان لەگەڵ ئێمەدا هەیە فێری ترس دەبین و بەردەوام خۆمانیان لێ بەدوور دەگرین، ئەو کەسانەشمان خۆشدەوێن کە تاقیکردنەوە و

ئەزموونی دڵخۆشکەرانە بەوانمان دەبەستێتەوە و لێیان نزیک دەبینەوە، کاتێکیش خۆمان لە هەڵوێستە ناخۆشەکان بەدووردەگرین و لە هەڵوێستە دڵخۆشکەرەکان نزیک دەبینەوە، ئەوا ئێمە پێداویستییە سەرەتاییەکانی خۆمان بۆ شادومانی و حەسانەوە وەدیهێناوە، زۆربەی ئاراستە سەرەکییەکانیشمان لە قۆناغی منداڵیدا وەردەگرین ئەمەیش لەمیانی کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتی لەگەڵ دایباب و گشت ئەندامانی دیکەی خانەوادەدا دێتەکایەوە، منداڵیش بەزۆری ئاراستە بەهێزەکانی هەمبەر دایبابی گەشەپێدەدات چوونکە پێداویستییەکانی بۆ دەهێننەدی و هەستی حەسانەوەی بۆ دروستدەکەن. بوونی دایبابیش وابەستەی هەستی منداڵە بە دڵارامی و بەختیاری و ئاسایش. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیش و لەگەڵ بەسترانەوەی دایباب بە سزاکانی منداڵەوە و لەگەڵ گرێدرانی دایباب بەسەرچاوەی حەسانەوە و دڵخۆشیی منداڵەوە لەمیانی رەفتارکردنیان لەگەڵ منداڵەکەدا لەکاتی کردەی پەروەردەکردندا، ئاراستەکانی منداڵ بەرەو دایبابی لەپێشوو پتر ئاڵۆزتر و دژبەیەکتر دەبێت.

### قۆناغەکانی پێکهاتنی ئاراستەکان

ئاراستە لەکاتی پێکهاتن و شکڵگیربوونیدا بەم قۆناغانەدا تێدەپەڕێت:

١. **قۆناغی درککاریی مەعریفی**، تیایدا تاك درك بە رووژێنەرەکانی ژینگە دەکات و لەسەر بنەمای ئەمانیشەوە رەفتار دەکات و بۆ تاکەکە زانیاری و ئەزموون وەدەستدەهێنێت و وەك چوارچێوەیەکی مەرجەعی لێدێت.

٢. **قۆناغی هەڵسەنگاندن**: بەپێی ئەو چوارچێوە مەعریفییەی کە لەبارەیەوە پێکی هێناوە تیایدا تاك لەگەڵ رووژێنەرەکان کارلێك دەکات. جگە لە زۆربەی ئەو هەستوسۆزانەی کە پەیوەندییان پێیەوە هەیە.

٣. **قۆناغی بڕیاردان**: تیایدا تاك بڕیارێکی تایبەت بە جۆری پەیوەندییەکانی بەو رووژێنەرانە و رەگەزەکانیان دەدات، جا ئەگەر بڕیارەکە ئەرێیی بوو ئەوا تاکەکە

ئاراستەیەکی ئەرێیی لەهەمبەر ئەو بابەتەدا پێکهێناوە، ئەگەر بڕیارەکەش نەرێیی بوو واتای ئەوەیە ئاراستەیەکی نەرێیی لەهەمبەر بابەتەکەدا پێکهێناوە.

## ئەو هۆکارانەی کاریگەرییان لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا هەیە:

ئەو هۆکارانەی کە بەشداری لە پێکهێنانی ئاراستەی تاکەکاندا دەکەن زۆر و تێکچڕژاون، هەندێکیان پەیوەندییان بە فێربوون و ئەزموونەکانی پێشووەوە هەیە، هەندێکیشیان پەیوەندییان بە کۆمەڵەکانی مەرجەعی و پێکهاتەی کەسێتیی تاکەوە هەیە، ئێستا بەرجەستەترین ئەو هۆکارانە دەخەینەڕوو کە کاریگەرییان لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا هەیە.

### ١- کاریگەریی ئەزموون و شارەزاییەکان لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا:

لەلای ئێمە چەندان ئاراستە لەهەمبەر بابەتی جۆراوجۆر پەیدا دەبن و پێکدێن ئەگەر هاتوو زانیاریی پێویست و شارەزایی پێشوومان لەبارەوە هەبێت، چوونکە مرۆڤ لەگەڵ کەسانی دیکەدا لە دۆخی کارلێکی بەردەوامدایە و لەگەڵیان دەچێتە نێو چەند پەیوەندییەکی کارلێکیی تێکچڕژاو، ئەم پەیوەندی و کارلێکانەی کە تاک لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا پێکیدەهێنێ، لەمیانیاندا چەندان ئەزموون و شارەزایی بەرفراوان وەدەستدەهێنێت کە رەنگە دڵخۆشکەر یانیش ئازاربەخش بن، لەبەرئەوە کلینکر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تاکەکان حەز بە دووبارەکردنەوەی ئەو رووداوانە دەکەن کە پێیدا گوزەریانکردووە و شتی دڵخۆشکەر بوون، ئەمەیش وایان لێدەکات ئاراستەی ئەرێیی لە هەمبەریدا پێکبهێنن، هەروەها ئاراستەی نەرێیی لەهەمبەر ئەو شتانەدا پێکدەهێنن کە تاقیکردنەوە و ئەزموونی ئازاربەخشی بۆ دروستکردوون.

رەنگە تاك لەهەمبەر ئەو رووداوانەی کە وێکچووی رووداوەکانی ژیانی رابردووی ئەون و ئەو ئاراستانەی لەهەمبەریاندا پێکهێناوە بەرەو گشتاندنی تاقیکردنەوە و ئەزموونە دڵخۆشکەر و ئازاربەخشەکانی پێشووی بچێتەوە، بۆیە ئەو ئەزموونە کەسییانەی تاك لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکاندا پێیاندا تێپەڕیوە رۆڵێکی گرنگی لە پێکهێنانی ئاراستە کۆمەڵایەتییەکانیاندا هەیە.

هەروەها ئەو زانیاریانەی تاك لەهەمبەر بابەتی دیاریکراو و ئەزموونی پێشوودا وەدەستیاندەهێنێت، گەورەترین کاریگەریی لە پێکهێنانی ئاراستە ئەرێیی و نەرێییەکانی هەمبەر ئەو بابەتانەدا دەبێت.

### ٢- پێکهێنانی ئاراستەکان لە رێگەی لاساییکردنەوەوە

تاکەکان لە زۆربەی کاتەکاندا حەز بە لاساییکردنەوەی ئەو رەفتارانە دەکەن کە پێیانوایە لەلایەن کۆمەڵگەوە پاداشتیان دەکرێت یان خاوەنەکانیان بەهۆیانەوە سەرکەوتن وەدەستدەهێنن، ئەمەیش پێیدەگوترێت فێربوون بە لاساییکردنەوە. هەروەها خەڵك خۆیان لە لاساییکردنەوەی ئەو رەفتارانە بەدوور دەگرن کە پێیانوایە لەسەریان سزا دەدرێن، ئەمەیش لەترسی کەوتنە بەر سزادانە، بۆنموونە: خەڵك شتی کانزایی ناخەنە نێو پلاکەکانی کارەباوە، نەك لەبەرئەوەی پێشتر کەوتوونەتە بەر هێدمەی لێدانی کارەباییەوە، بەڵکو ئەو زانیاریانەیان وەدەستهێناوە کە ئەم کردارە چەندە زیانبار و مەترسیدارە، یانیش پێشتر بینیوویانە کەوا کەسانێك بەهۆی ئەنجامدانی ئەم کردارەوە دووچاری هێدمەی کارەبایی بوونەتەوە. بەپێچەوانەی ئەمەیشەوە دەبینین زۆربەی فێرخوازان لاسایی رەفتاری چاکی فێرخوازێکی

سەرکەوتوو دەکەنەوە بەهیوای ئەوەی پاداشت بکرێن و ئەو پاڵپشتییە وەدەستبهێنن کە فێرخوازە سەرکەوتووەکە وەدەستیهێناوە.

هەر لەم بارەیەوە باندۆرای رێبەری فێرکردنی کۆمەڵایەتی ئاماژە بەوە دەکات کە تاکەکان کاردانەوە و ئاراستەی نوێ لەمیانی تێبینیکردنی رەفتاری خەڵکانی دیکەی نێو کۆمەڵگە فێردەبن و دواتریش لاسایی دەکەنەوە، چوونکە لاساییکردنەوەی کۆمەڵایەتی یارمەتیی تاك دەدات بۆ پێکهاتنی ئاراستەکانی لەهەمبەر ئەو بابەتانەی کە لەلای ئەودا نەبوون، جگە لە کاریگەریی و هێزی لاساییکردنەوە لە بەهێزکردن و پاڵپشتیکردنی رەفتارە ئەرێییە پەسندەکان و سستکردنی رەفتارە نەرێیی و ناپەسندەکان، لەبەرئەوە منداڵ زۆربەی ئاراستەکانی خۆی لەمیانی لاساییکردنەوەی تاکەکانی نێو خانەوادەکەیدا پێکدەهێنێ، لاسایی دایباب و خوشك و برا گەورەترەکانی دەکاتەوە. لێرەوە لاساییکردنەوە، بە کۆنترین هۆکارە کاریگەرەکانی پێکهێنانی ئاراستەکان و گرنگترینیان دادەندرێت، چوونکە ئاراستەکان ئەو ئاوێنەیەن کەوا ئاستی کاریگەریی خانەوادە بەسەر منداڵەکانی لە قۆناغە زووەکانی تەمەندا و ئاستی ملکەچیی منداڵ و یاخیبوونەکەشیان پیشان دەدات، لەبەرئەوە پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان ئاراستەکانی خانەوادە و ئاراستەکانی منداڵاندا هەیە و دەرەنجامی زۆربەی توێژینەوەکان راستیی ئەم مەسەلەیەیان سەلماندووە.

### ٣. ئەندامیەتیی کۆمەڵە لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا

گشت تاکێك ئەندامی کۆمەڵەیەکی دیاریکراوە و رەنگە تاك ئەندامی چەندان کۆمەڵەیش بێت، لەبەرئەوە ئاراستەکانی هەر تاکێك پیشاندەری بیروباوەڕ و پێوەری کۆمەڵەکەیەتی ئەگەر هاتوو کۆمەڵەکە تەبا و یەکگرتوو بوو. فشاری کۆمەڵە لەسەر

ئەندامەکانی هۆکارێکی گرنگی پێکهێنانی ئاراستەکانیانە. زۆربەی ئاراستەکانی فێرخوازان لەهەمبەر تەواوکردن و تەواونەکردنی خوێندندا لەمیانی ئاراستەکانی هاوپۆلان و هاوڕێیە نزیکەکانی فێرگەوە دیاریی دەکرێن، چوونکە کاریگەریی ئەم هاوڕێیانە زۆر بەهێزە، لەبەرئەوە یەکبوون و توانەوە لەگەڵ هەندێ کەسێتیی کۆمەڵایەتیدا ڕۆڵێکی گرنگ لە وەرگرتنی هەندێ ئاراستەی کۆمەڵایەتیی زۆربەی تاکەکاندا دەبینێت.

**٤- کاریگەریی کەسێتیی تاك لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا:**

تایبەتمەندییەکانی کەسێتیی تاك ڕۆڵێکی گرنگ لە پێکهێنان و گەشەپێدانی ئاراستەکانیدا دەبینن، چوونکە مرۆڤ حەز بە وەرگرتنی ئەو ئاراستانە دەکات کە لەگەڵ تایبەتمەندییە کەسییەکانی دەگونجێت و بەردەوام پاڵپشتیی بوونەکەی دەکات، ئەو ئاراستانەیش ڕەتدەکاتەوە کە دژ بەو تایبەتمەندییانەن.

**٥- کاریگەریی هۆکارە ڕۆشنبیرییەکان لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا**

هۆکارەکانی ڕۆشنبیری و شارستانی بەگشت سیستەمە ئاینی و سیاسی و ئاکاری و ئابوورییەکانیەوە ڕۆڵێکی گرنگ لە پێکهێنانی ئاراستەکانی تاکدا دەگێڕن، چوونکە هۆکارە کەلتووری و ڕۆشنبیرییە باوەکانی کۆمەڵگەیەك، لە هەردوو ڕەوتە ئەرێیی و نەرێییەکانیدا ڕۆڵێکی گرنگ لە گەشەپێدان و پێشخستنی ئاراستە باوەکانی کۆمەڵگەدا دەگێڕێت، چوونکە ڕۆشنبیری و کەلتوور بەگشت ئەو زانیاریە زۆروزەوەندانەی دەستەبەریان دەکات کەلتووری مەعریفیانەی مرۆڤ لەمیانی ئامرازە جۆراوجۆرەکانی نێو کۆمەڵگەدا پێکدەهێنێت، جا ئەگەر لە ڕێگەی خانەوادەوە بێت، یانیش لە ڕێگەی فێرگە و هاوڕێیان و شوێنەکانی پەرستندا بێت، یانیش لە ڕێگەی ئامرازە

جۆراوجۆرەکانی راگەیاندنەوە بێت. کۆی ئەمانە بەسن بۆئەوەی بەشداری لە گەشەپێدان و پێشخستنی ئاراستەکاندا بکەن، بەڵام چوونکە کاریگەرییەکانی رۆشنبیری لە کۆمەڵگەدا جۆراوجۆر و زۆروزەوەندن، ئەوا ئەو زانیاریانەی پێشکەشیان دەکەن رەنگە دژبەیەك و ناکۆك بن، ئەمەیش دەبێتە هۆی پێکهێنانی ئاراستەی ئەرێیی لەلای هەندێ کەس و لەلای هەندێکی دیکەش ئاراستەی نەرێیی پێکدەهێنێت، لەبەرئەوە هەردەبێ تاك سەبارەت بە هەر بابەتێك ئەو ئاراستەیە هەڵبژێرێت کە لەگەڵ چوارچێوە مەرجەعییەکەیدا دەگونجێت جا ئەگەر ئەرێیی بێت یانیش نەرێیی.

## جۆرەکانی ئاراستەکان:

### ١. ئاراستە گشتی و تایبەتەکان (جۆرییەکان)

ئاراستەی گشتی ئەو دیاردەیە دەگرێتە خۆی کە لە گشت رەهەندەکانیدا بە بابەتی ئاراستەکە دادەندرێت، چوونکە بەشێوەیەکی هەمەکی لەخۆی دەگرێت و رووناکاتە لایەنە بەشەکییەکانی و لە وردەکارییەکانی ناکۆڵێتەوە، بە چاوپۆشین لەهەر تایبەتمەندییەکی دیکە کە لەوانی دیکەی جیابکاتەوە، وەك ئاراستەی هەمبەر ئیستیعمار بە گشت شێوە و دیمەنە جۆراوجۆرەکانی، هەروەها ئاراستەی هەمبەر هەڵاواردنی رەگەزپەرستانە بە گشت ئاستەکانی و لە گشت ئەو کۆمەڵگەیانەی کەوا ئەم دیاردەیەیان تیادا دەبیندرێت و هتد. بەڵام ئاراستەی جۆرایەتی(تایبەت) تەنها یەك بەشی ئەو دیاردەیە دەگرێتەوە کە گوزارشت لە پرسی ئاراستەکە دەکات، بەشێوەیەك تەنها جەختی لەسەر دەکاتەوە و خۆی لە قەرەی دیاردەکە نادات وەك گشتێك، چاوپۆشیش لە پەیوەندییە بەشۆکەییەکانی دیکەی دیاردەکە دەکات، وەك ئاراستەی

هەمبەر ئیستعماری سەربازی بەتەنها، یان ئاراستەی هەمبەر هەڵاواردنی ڕەگەزپەرستیی نێوان ڕەشپێست و سپیپێستەکان.

ئاراستە گشتییەکان پتر پایەدارتر و سەقامگیرترن لە ئاراستە تایبەتییەکان، هەروەها ئاراستە تایبەتەکانیش ڕەوتێك دەگرنەبەر کە لە کرۆکی خۆیاندا ملکەچی چوارچێوەی ئاراستە گشتییەکانن، لەبەرئەوە ئاراستەکان پشت بە ئاراستە گشتییەکان دەبەستن و پاڵنەرەکانی خۆیانی لێ وەردەگرن.

### ٢. ئاراستەکانی بەکۆمەڵ و ئاراستەکانی تاکەکەسی:

ئاراستە بەکۆمەڵەکان ئەو ئاراستانەن کە لەنێوان ژمارەیەکی زۆری خەڵك سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو هاوبەشن، ڕەنگە ئاراستەیەکی هاوبەش لەلای ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەهەمبەر سەرۆکی وڵات یان سەرکردەیەك ،یان بەرهەم و کەرەستەیەکی دیاریکراو و هتد پێکبێت.

بەڵام ئاراستە تاکەکەسییەکان خودین و پەیوەندی و وابەستەییان تەنها بە خودی تاکەکەسەکەوە هەیە لەهەمبەر دیاردەیەکی دیاریکراودا، چوونکە مرۆڤ ئاراستەکانی خۆی لەمیانی چوارچێوە مەرجەعییەکەی خۆیدا پێکدەهێنێت کە شێوازی ژیانی تایبەتی دەگرێتە خۆ و لەخەڵکانی دیکەی جیا دەکاتەوە، بۆنموونە: کاتێ تاکێك ئاراستەیەك لەهەمبەر هاوکارێکی کار و جۆرە پۆشاکێکی تایبەت و پسپۆڕییەکی دیاریکراوی بواری خوێندن پێکدەهێنێت و هتد.

### ٣. ئاراستە ئاشکرا و نهێنییەکان:

ئاراستەکان لەو کاتەدا بە ئاشکرا لەقەڵەم دەدرێن کەك تاك لە ڕاگەیاندن و قسەکردن لەبارەیەوە ڕووگیر نابێت، چوونکە پەیوەندیی بە سیستمی بەها باوەکانی

کۆمەڵگەوە هەیە کە باوەڕی پێی هەیە و لەلای گشت خەڵکانیشەوە پەسندکراوە، بەشێوەیەك تاك لەکاتی راگەیاندنیدا دووچاری هیچ فشارێك نابێتەوە کە ببێتە هۆی زیان و رووگیری، رێك وەك وتەکانی مامۆستا لەهەمبەر فێرخوازانیدا هەر لەیەکەم چاوپێکەوتنیدا بەوەی کە حەز بە سیستم دەکات و رقی لە هەراوزەنا و بێ سەروبەریی دەبێتەوە، لەبەرئەوە هەردەبێ زۆر بەوردی پارێزگاری لە وادەکان بکرێت.

بەلاّم ئاراستە نهێنییەکان ئەو ئاراستانەن کەوا تاك لەکاتی راگەیاندن و گوزارشت لێکردنیدا هەست بە رووگیری و تەنگەتاوی دەکات و هەوڵ دەدات لە خەڵکانی بشارێتەوە و لە دڵی خۆیدا بەنهێنیی بیهێڵێتەوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو کاتێ پرسیاری لێدەکرێت رەنگە نکۆڵیش لەو ئاراستەیە بکات، چوونکە لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە سەپێندراوە و دووچاری شەرمی دەکاتەوە.

مرۆڤ لە کۆمەڵگەیەکی دینداردا ناتوانێ گوزارشت لە ئاراستە بێباوەڕییەکانی (الحاد) بکات، هەروەها لە ترسی ژیانی خۆی لەهەمبەر دەسەلاّتی سیاسی کۆمەڵگەکەی وهتد ناتوانێ گوزارشت لە ئاراستە دوژمنکارییەکەی بکات.

### ٤- ئاراستە بەهێز و لاوازەکان:

ئاراستەکان لەهەمبەر بابەتێك لەلای تاك بەهێز دەبن، ئەمەیش لەو رەفتارەیدا رەنگدانەوەی دەبێت کە لەتوانای بەدیاردەکەوێت بۆ روودانی گۆڕانکاریی پێویست لەو بابەتەدا.

بۆنموونە کاتێ کەسێ هەڵەیەك دەبینێت و دژی دەوەستێتەوە و هەڵدەچێت و هەوڵ دەدات بەو پەڕی هێز و توانای خۆی دووری بخاتەوە، ئەمەیش بەهۆی ئەو ئاراستە بەهێزەیە کە دژ بە هەڵە پێکیهێناوە، هەروەها ئەو کەسەی دژی گشت کارێکی

تێکدەرانە دەوەستێتەوە وەهای لێدەکات بەگشت هێز و توانای خۆی و بە قسە و گوفتارەوە بەهۆی پاڵنەری هەستی نیشتمانییەوە دژی بوەستێتەوە.

بەلأم ئەو کەسەی هەڵوێستێکی لاوازی لەهەمبەر بابەتێکدا هەبێت، ئەوا لەمیانی رەفتارێکەوە دەبێت کە بە کەمیی کاریگەری لە دروستکردنی گۆڕانکاری پێویست لەو بابەتەدا بەدیار دەکەوێت، ئەمەیش لەبەرئەوەیە کە هەست بە پێداویستیی ئەم جۆرە گۆڕانکارییە ناکات، لەبەرئەوە ئاراستەکەی بۆ گۆڕان و کاریگەری لاواز دەبێت.

### ٥. ئاراستە ئەرێیی و نەرێیەکان

ئاراستەکانی تاك ئەرێیی دەبن لەو کاتەی بەرەو شتێکی دیاریکراوی دەبەن، هەروەها ئەو ئاراستانە پەیوەندییان بە پشتگیریکردنی کۆی ئەو شتانەوە هەیە کە لە گشت لایەنێکەوە پەیوەندیی پێیەوە هەیە، ئەمەیش وادەکات لەسەر شێوەی بەرگریکردن و بانگهێشتکردنی خەڵك بۆ ئەو ئاراستەیە لە رەفتاری تاك رەنگ بداتەوە، وەك ئاراستەی هەمبەر پاکوخاوێنی کە خۆی لە قاڵبی بانگەشەکردن بۆ پاکیی شار و ماڵ و شوێنە گشتییەکاندا دەبینێتەوە.

بەلأم ئاراستە نەرێییەکان ئەو ئاراستانەن کە خەڵك لە بابەتێکی دیاریکراو دوور دەخەنەوە، ئەمەیش وایان لێدەکات کۆی ئەوشتانە رەتبکاتەوە کە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە، بۆیە بانگەشە بۆ بەرهەڵستیکردنی دەکرێت، وەك هەڵاواردنی رەگەزپەرستانە لە هەندێ ولأت، چوونکە ئاراستەی نەرێیی لەلای تاکەکان پێکدێت و لەسەر شێوەی تێکەڵ نەبوون و گۆشەگیری و ئەنجامنەدانی هاوسەرگیری و بەشدارینەکردن لە دەسەلأت وئاراستە و راوبۆچوونەکاندا لە رەفتاریاندا دەردەکەوێت.

وەرگــرتن و خــستنە ڕووی نێــوان ئاراســتە و ڕاوبۆچــوون پــشکێکی مــەزنی لــە بیرکردنەوەی زانایـان داگیرکـردووە و لایەنـەکانی ئـەو جیاوازیانـەی کـە روونبووەتـەوە لەیەکیان جیا دەکاتەوە ئەمانەن:

یەکـەم: ڕاوبۆچـوون گوزارشـتێکی ڕاشـکاوانەیە لـە ئاراسـتەیەکی شـاراوە، ئـەم شاراوەیەی کە Thnrstone بەهۆیەوە ئاراستە لە ڕاوبۆچـوون جیادەکاتـەوە چـەند وێنەیەکی جیاوازی لەلای زۆربەی زانایان وەرگرتووە، وەك:

١- بەتـەوەربوون: واتا ئاراستە ئەو تەوەرە دەنـوێنێ کـە زۆربـەی ڕاوبۆچـوونەکان بەدەوریدا دەخولێنەوە و ڕاوبۆچوون و باوەڕ و ئاراستەش بـەدوای یەکتریـدا دەنـوێنێ، بەم شێوە و ڕیزبەندیەشەوە نمرەکان لە تەوەربوون بەرز دەبنەوە.

٢- متبوون: بەو مانایەیە کە ڕاوبۆچوون گوزارشتێکی سەرتاپاگیرە لە ئاراستـەیەکی حەشاردراو و بوون و قەوارەکەی بەشێوەی هەڵێنجان (استنتاج) هەست پێدەکەین.

٣- شیمانەیی یان نەستی: بەو مانایەی ئاراستە قەوارەیەکی شیمانەیی یان گۆڕاوی نێوەندە (وسیط)، بەڵام ڕای گۆڕاو دیاردەیەکە و دەکرێ تێبینی بکرێت.

ئەم جیاکارییەی نێوان ڕاوبۆچوون و ئاراسـتەکان هەرهـەموویان کـۆکن لەگـەڵ ئـەو گۆشەنیگایەی کە وەهـا لـە ڕاوبۆچـوون دەنوارێـت کـە لایەنێکـە زۆر خـۆ بەدیارخـەرە، بەڵام وەها ئاراستە دەبینێت کە لایەنێکی ناسەقامگیرە و زۆر زەحمەتـە بەشـێوەیەکی ئەزموونی لێی بکۆڵدرێتەوە، چوونکە لە هەستی تایبەتی کەسەکەدا هەیە.

دووەم: جیاوازیی دووەمیش کە هەندێ کەس پێیانوایە راوبۆچوون و ئاراستەکان لەیەکتری جیادەکاتەوە ئەوەیە کە راوبۆچوون باس لە چەند پرسێکی واقیعی دەکات، بەڵام ئاراستە باس لە پرسە چێژییەکان دەکات، واتا راوبۆچوون مادە- هەواڵییەکان دەگرێتەوە، بەڵام ئاراستەکان مادەی هەڵسەنگاندنیی دەگرنەوە.

سێیەم: راوبۆچوون بیروباوەڕێکە و تاوتوێی پێشبینی و خەملاندنەکانی تاك دەکات لەهەمبەر رووداوەکاندا، بەڵام ئاراستەکان شەنوکەوی حەز و خۆزگەکانی کەسەکە دەکەن لەهەمبەر رووداوەکاندا، بۆنموونە بیروباوەڕی تاك بەوەی کە ئەگەری ئەوە هەیە یاسای لەسێدارەدان رەتبکرێتەوە راوبۆچوونێکە، بەڵام ئەگەر ئەم گریمانەیە بووە حەز و خۆزگەی رەتکردنەوەی یاساکە، ئەوا ئەو بیروباوەڕە دەبێتە ئاراستە.

چوارەم: راوبۆچوون بیروباوەڕە و واقیعەت و دینامیکیەت هاوتەریب لەگەڵیدا ناڕۆن، بەڵام ئاراستە بیروباوەڕێکە بە دینامیکیەت دەناسرێتەوە و رووکردنە ئامانج هاوتەریبی دەڕوات.

ئەوەی لەگشت ئەم جیاکاریانەی نێوان راوبۆچوون و ئاراستە لەلای ئێمەدا گرنگە سوودی کردارییە، بۆنموونە: بەشێوەیەکی کرداری ئەوە سەلمێندراوە کە ریزبەندی پیشاندانی زانیارییەکان واتا پێشکەشکردنی کەسی پشتگیریکار لەپێش پێشکەشکردنی کەسی بەرهەڵستکار لە پڕوپاگەندەی کاریگەردا لەو مادەیە جیاوازە کە راستیی (بیروڕاکان) پێشکەش دەکات لەدۆخی مادەی پرسەکانی هەڵسەنگاندندا (ئاراستەکان) دۆخی دووەمە کە کاریگەرییەکەی زۆرترە.

# سروشتی ئاراستە دەروونییەکان و ڕەهەندەکانی

ئاراستە دەروونییەکان بریتین لە ئامادەیی تاك بۆ پێشکەشکردنی هێماو بابەتێکی دیاریکراو، جا بەشێوەیەکی ئەرێیی بێت یان بەشێوەیەکی نەرێی ئەوا چەند بیروباوەڕو ویژدانیەتێکە لەهەمبەر بابەتێك یان چەندان بابەتی دەوروبەری کۆمەڵایەتی، هەروەها شتێکی وەرگیراوە و بەرەو جێگیری و پایەداری و بەردەوامی دەچێت. هەروەها چەند دۆخێکی دەروونییە و کاریگەریی بەسەر ئەو کردارانەوە دەبێت کە تاك وەك ئەرکێك بۆ هەڵوێستە جۆراوجۆرەکان ئەنجامیان دەدات.

راوبۆچوونیش تەنها گوزارشتێکی زمانەوانییە لە ئاراستە، بەڵام دەکرێ لە رەفتاری نا زمانەوانی گوزارشت لە ئاراستەکان بکرێت، ئاراستەکانیش هەردوو لایەنی ویژدانی و مەعریفی لەخۆدەگرن، لایەن و دیمەنی مەعریفی بیروباوەڕی کەسییە و ئەو رەگەزانە دەنوێنێ کە وەسفی بابەتی ئاراستەکانی دەروونی و تایبەتمەندی و پەیوەندییەکەی بە باتەکانی دیکەوە دەکات، هەر بەم پێیەش ئاراستەکان بیروباوەڕەکان لەخۆدەگرن، بەڵام گشت بیروباوەڕێك ئاراستە نین، چوونکە ئەگەر ئاراستەکان رێکخران لە بونیادی قووچەکیدا ئەوا گونجان و هەماهەنگیی بەهاکان لەخۆ دەگرێت، واتا ئاراستەکان لەچواردەوری ناوکێکدا دەخولێنەوە کە ئەوانیش ئەو بەهایانەن کە تاك پێیانەوە پابەند دەبێت.

کاتێکیش تاوتوێی توندیی ئاراستەکان دەکەین، ئەوا لە دەروازەی هێزی رەگەزی ویژدانیی دەدەین، پێوەرەکانی ئاراستەکانیش توندیی ویژدانیی تاك دەپێوێت جا ئەگەر لەگەڵیدا بێت یانیش دژی بێت. رەهەندەکانی ئاراستەکانیش: بەگشتیبوونی ئاراستە و تایبەتمەندبوون و پلەی تایبەتمەندبوونی بیروباوەڕەکانە، مەبەستیش لە تایبەتمەندبوون ژمارەی ئەو بیروباوەڕ و رەگەزانەی مەعریفەیە کە ئاراستەکە دەیگرێتە

خۆ. بەشێوەیەکی گشتیش ئاراستەی دەروونی هەرچەندە سادە بێت بەشێوەیەکی ئاسانتر دەتواندرێ بگوڕدرێت، هەروەها رەهەندێکی دیکە هەیە لە رەهەندەکانی ئاراستەکان ئەویش ژمارەی ئەو پێوەندانەیە کە سیستمێکی رێکوپێکی بەهاکان و هێزی ئەو پێوەندانەیە، بۆنموونە ئەگەر ئاراستەکە بەرەو موڵکیەتی تاکەکەسی بوو ئەوا بەشێوەیەکی زۆر بەهێز بە سیستمێکی رێکوپێکی بەهاکانی ئاینی دەبەسترێتەوە، ئەوسا زۆر بەزەحمەت دەتوانرێ بگۆڕدرێت. ئەگەر ئاراستەکەش پەیوەندیی بە سیستمێکی رێکوپێکی بەهاکانەوە هەبوو بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بە بیرۆکەی تاك لەهەمبەر خۆیدا دەبەسترێتەوە و گۆڕانەکەشی ئاڵۆزتر دەبێت.

هەروەها دیمەن و روخسارێك لە دیمەنەکانی ئاراستەکاندا هەیە ئەویش پەیوەندیەتی بە رەفتاری دیار و بەرچاوەوە، هەندێ ئاراستە هەن کە بونیادیان هەیە و وەها دەکات لەوانی دیکەدا پاڵ بە ئەنجامدانی رەفتارەوە بنێت.

هەوڵەکانیش بۆ گۆڕینی ئاراستەکان یان بەرەو رەگەزی ویژدانیە یانیش بەرەو مەعریفیە، هەندێ کەسیش پێیانوایە گۆڕانی کرۆکی لە یەکێکیاندا دەبێتە هۆی گۆڕانی رەگەزەکەی دیکە، لەبەرئەوە گرنگترین رەهەندێك کە زانایان لە شرۆڤەکردندا دەیانگرتەبەر ئاستی سەرکەوتن و هەماهەنگی و بەدوایەکداهاتنی بوو لە رەگەزەکانی ئاراستەکان و نێوان ئاراستەکان خۆیان و نێوان ئاراستە و بەهاکان و نێوان بەهاکان و بەهاکان، چوونکە تاکەکان ئاگاداررییەکی تەواویان لەهەمبەر ئاراستە دەروونییەکانی خۆیاندا نییە. رەنگە دژبوون لەنێوان ئاراستەکان و ئاراستەکان و بەهاکان و بەهاکانی دیکەدا رووبدات، تێبینیکردنی ئەم دژبوونەش رەنگە لەسەرەتادا هێدمە بە تاك بگەیەنێ بەلاّم سوودی ئەرێیانەی خۆی هەیە، چوونکە کاتێ خەڵك دەزانن دژبوون لە ئاراستەکانیاندا هەیە ئەو زانیاریە رێگە بۆ سەر لەنوێ پەروەردەکردنەوەیان و چاندنی بەهای نوێ لە دەروونیاندا خۆشدەکات.

گرنگترین ئەو هەڵوێستانەی کە دژبوونی ئەو ئاراستانەی تیادا هەڵدەقوڵێ ئەوانەن کەوا گوزارشتیان لێدەکرێت و پەیوەندییان بەو ڕۆڵانە هەیە کە تاك ناچارە لە هەلومەرجێکدا شتێك دەربڕێت و لەهەلومەرجێکی دیکەشدا شتێکی دیکە بڵێت، ئەمەیش دەبێتە هۆی تاوانبارکردنی بە فریسی (نفاق). زۆربەی کەس هەن هەندێ شت دەڵێن کە پێچەوانەی کردارەکانیانە. لە ڕوخسارێکی دیکەی ئاراستەکانیش ئەوەیە ئێمە وەهای نابینین هەڵقوڵاوی ناخمان بێت و بەشێك بێت لە ناخمان، بەڵکو وەك تایبەتمەندییەکی ئەو بابەتەی لەقەڵەم دەدەین کە لەهەمبەریدا گوزارشت لە ئاراستەکانمان دەکات، بۆنموونە ئەو ئەمریکییەی لەهەمبەر هاوولاتییە ڕەشپێستەکانی دەمارگیر و ڕەگەزپەرستە، ئەگەر پرسیار لەبارەی ڕەگەز پەرستییەکەی بکەیت دەست بە ژماردنی سیفەتە خراپەکانی ڕەشپێستەکان دەکات وەك ئەوەی ئەو تایبەتمەندیانە لە بوون و قەوارە و پێکهاتەی ڕەشپێستەکاندا شتێکی راستەقینە بێت.

## لایەنە ئەرکییەکانی ئاراستەکان (ئەرکی ئاراستەکان )

١. ئەرکی ئامرازیانەی خۆ گونجاندنی سوودخوازی (سوودخوازیی خۆگونجاندنی)؛ ئاراستەکان زۆربەی ئامانجەکانی تاك دەهێننەدی و لەو هەڵوێستە جۆراوجۆرانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە توانای خۆگونجاندنی پێدەبەخشن و یارمەتیدەری تاك دەبێت بۆ ئەوەی پەیوەندیی دروست و ئاساییانە و گونجێنەر لە کۆمەڵگەکەی بهێنێتەدی.

٢. ئەرکی بەرگریکردن لە من (ئەرکی بەرگریکارانە)؛ تاك لەوە دەپارێزێت لە جیهانی دەرەوەیدا دان بە شتە راستەقینانەکانی تایبەت بە خودی خۆی و واقیعی تاڵی ژیانی خۆی دابنێت، بۆیە تاك بۆ شکست و بێتوانایی لە وەدیهێنانی ئامانج و

پاراستنی رێز و گەورەیی و شانازی بەخۆکردن چەند ئاراستەیەك بۆ پاساوهێنانەوە پێکدەهێنێت، بۆنموونە کاتێ ئاراستەیەکی نەرێیی لەهەمبەر پرۆگرامی خوێندن و مامۆستا پێکدەهێنێت بۆ ئەوەی پاساو بۆ شکستی خۆی بهێنێتەوە.

٣. ئەرکی گوزارشتکردن لە بەهاکان (ئەرکی وەدیهێنانی خود): تاك چەند ئاراستەیەك دەگرێتەبەر کە رەفتار و ناسنامە و پێگەی لە کۆمەڵگەدا دیاریی دەکات و تیایدا بەهۆی گوزارشتکردن لەو ئاراستانەی لەگەڵ بەهاکانی دەگونجێت و پێوەی پابەندە، بیرۆکەی لەهەمبەر خۆیدا تێربوونێك دەدۆزێتەوە و بە راشکاوی گوزارشت لە پابەندبوونەکانی دەکات و دانیان پێدا دەنێت.

٤. ئەرکی مەعریفی (ئەرکی رێکخستن): واتا گونجان و هەماهەنگیی رەفتار لە هەڵوێستە جۆراجۆرەکاندا بەشێوەیەکی جێگیر و پایەدار رێچکەیەك دەگرێتەبەر و بەندە بە پێداویستیی تاك بۆ دونیابینیەکەی لەسەر شێوەی بونیادێکی رێکخراو.

دەتوانین گرنگترین ئەرکەکانی ئاراستە دەروونی کۆمەڵایەتییەکان لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

١. ئاراستە رێگەی رەفتار دیاریی دەکات و لێکیدەداتەوە.

٢. ئاراستەکان سەبارەت بە هەندێ لایەنی نێو ئەو بوارەی کە تاك تیایدا دەژیەت کردە پاڵنەری و هەڵچوونی و درککاریی و مەعریفییەکان رێکدەخات.

٣. ئاراستەکان لە کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان و ئەو کەلتوورەی تاك تیایدا دەژیەت لە رەفتار و قسە و کردار و کارلێکی تاك لەگەڵ خەڵك رەنگدانەوەی دەبێت.

٤. ئاراستەکان لە هەڵوێستە دەروونییە جۆراوجۆرەکان و لەنێو جۆرە گونجان و هەماهەنگی و یەکبوونێکدا بەبێ دوودڵی و بیرکردنەوە لە گشت هەڵوێستێك توانای

ڕەفتارکردن و بڕیاردان بۆ تاك دەڕەخسێنن و گشت جارێك بیرکردنەوەی سەربەخۆیانەی بۆ فەراهەم دەکەن.

٥. ئاراستەکان وێنەی پەیوەندیی نێوان تاك و جیهانە کۆمەڵایەتییەکەی ڕووندەکەنەوە و دەیکێشن.

٦. ئاراستەکان کاردانەوەکانی تاك لەهەمبەر کەس و شت و بابەتەکان بەشێوەیەك دەخەنە سەر ڕەوت کە نیمچە جێگیر و پایەدارە.

٧.ئاراستەکان تاك هان دەدەن بەشێوەیەکی دەستنیشانکراو درك بە بابەتەکانی ژینگەی دەرەکی بکات و هەست بکات و بیربکاتەوە.

٨. ئاراستە ڕاگەیەندراوەکان گوزارشت لە خۆگونجاندنی تاك دەکەن لەهەمبەر ئەو پێوەر و بەها و بیروباوەڕانەی کە لە کۆمەڵگەکەیاندا باوە.

## هەموارکردنەوە و دەستکاریکردنی ئاراستەکان

هەرچەندە ئاراستەکان بە جێگیری و پایەداریەکی ڕێژەیی دەناسرێنەوە بەڵام دەکرێ بگۆڕێن، ئەمانەی خوارەوە گرنگترین ڕێگەکانی گۆڕین (دەستکاریکردن و هەموارکردنەوەی) ئاراستەکانن:

**١. کاتێ تاك ئەو کۆمەڵەیە دەگۆڕێت کەوا پەیوەستیەتی(گۆڕینی کۆمەڵەی مەرجەعی)**: ئەگەر تاك ئەو کۆمەڵە مەرجەعیەی گۆڕی کەوا پەیوەستیەتی و پەیوەستبوونی خۆی بۆ کۆمەڵەیەکی دیکە ڕاگەیاند کەوا ئاراستەی جۆراوجۆری هەیە، ئەوا لەگەڵ گوزەرکردنی کاتدا حەز بە گۆڕین و هەموارکردنەوەی ئاراستە کۆنەکانی دەکات(گۆڕینی یانە و دەستگە و پیشە و هتد).

٢. **گۆڕینی هەڵوێست:** ئاراستەکانی تاك بە گۆڕانی ئەو هەڵوێستانە دەگۆڕێت کەوا گوزەریان پێدا دەکات، لەوانە گوزەرکردنی تاك بەرەو ئاستێکی بەرزتری ئابووری کۆمەڵایەتی ئەوا کاریگەریی لە ئاراستەکانی دەکات و دەیانگۆڕێت وەك ئەو فێرخوازەی کاتێ دەبێتە مامۆستا هەڵوێستی دەگۆڕێت.

٣. **گۆڕانی ناچارانەی رەفتار:** رەنگە هەندێ جار تاك بەهۆی گۆڕانی هەندێ هەلومەرجی ژیان وەك هەلومەرجی کاروپیشە و شوێنی نیشتەجێبوون، ناچار بێت ئاراستەکانی بگۆڕێت. لە لێکۆڵینەوەکاندا ئەوە بەدەرخراوە کە ئەو ئافرەتە سپیپێستانەی ناچاربوون لەگەڵ ئافرەتانی رەشپێست نیشتەجێبن هەستی دوژمنایەتیان کەمتر بووەتەوە و پتر سۆز و خۆشەویستیان لەهەمبەر رەشپێستەکاندا پیشانداوە.

٤. **پەیوەندیی راستەوخۆ بە بابەتی ئاراستەکە (شارەزایی و ئەزموونی راستەوخۆی هەمبەر بابەتەکە):** پەیوەندیی راستەوخۆ بەبابەتی ئاراستەکەوە رێگە بە تاك دەدات لەچەند لایەنێکی نوێییەوە ئاشنای بابەتەکە بێت، ئەمەیش وادەکات تاك ئاراستەکانی لەهەمبەریدا بگۆڕێت، جا ئەگەر لایەنە ئەرێییەکانی دۆزییەوە بەرەو باشتر دەچێت ، هەروەها ئەگەر ئەو لایەنانەی دەیاندۆزێتەوە نەرێیی بن بەرەو خراپتر دەچێت.

٥. **گۆڕانکاریی لە بابەتەکەدا:** ئەگەر گۆڕانکاری لە خودی بابەتەکەدا سەریهەڵدا و تاکەکە درکی پێکرد، ئەوا ئاراستەکانی لەهەمبەر بابەتەکەدا دەگۆڕێن، چوونکە هەرچەندە رۆشنبیریی جووتیار و شارەزاییەکانی پتربوون ئەوا دەبێتە هۆی گۆڕانی ئاراستەکان لەهەمبەریدا.

٦. کاریگەریی زانیارییەکان: باشترین ئامرازێك کە بەهۆیەوە گۆڕان لە ئاراستەکاندا دروستدەبێت، گەیشتنی راستی و ئەو بابەتانەن کە پەیوەندیان بە بابەتی ئاراستەکانی تاکەوە هەیە، ئەمەیش پشت بە راوبۆچوونی شارەزایان و پسپۆڕان و ئەو سەرچاوانە دەبەستێت کە لە هەڵبژاردنی زانیارییە جۆراوجۆرەکاندا پشتی پێدەبەستین، بۆنموونە ئەو سەرچاوانە بۆ منداڵ دایبابی و ئەو کەسانەن کەوا تێکەڵی منداڵ دەبن، بۆ فێرخوازانیش کتێب و مامۆستاکانیانە، بۆ کەسێکی دینداریش پیاوانی ئاینی و ئامرازەکانی راگەیاندن و فیلمەکانی سینەمایی و پیاوانی کار و سیاسەتمەداران و هتد. ئەمانە هەر هەموویان ئەو بەرچاو روونییە دەبەخشن و یارمەتیدەرن بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئاراستەکانی تاك بگۆڕن جا بەرەو لایەنی ئەرێیی بێت یانیش نەرێیی.

هەروەها رێگەیەکی دیکەی گۆڕان و هەموارکردنەوەی ئاراستەکان رێگەی گێڕانی رۆڵ و رێگەی راکێشانی مرۆڤ و کاریگەریی ئامرازەکانی راگەیاندن و رووداوە گرنگەکان و رای زۆرینە و پسپۆڕان و گفتوگۆکردن و بڕیاری بەکۆمەڵە.

### لەو هۆکارانەش کە گۆڕینی ئاراستەکان ئاسان دەکەن، ئەمانەن:

- لاوازیی ئاراستەکان و نەچەسپاوی و رەگدانەکوتاوییەکەی.
- بوونی ئاراستەی هاوتەریب و یەکسان لە هێزدا.
- دابەشبوونی راوبۆچوون لەنێوان ئاراستە جۆراوجۆرەکاندا.
- پێکنەهاتن و نا روونیی ئاراستەکانی تاك لەهەمبەر بابەتی ئاراستەکەدا.
- بوونی شارەزایی و ئەزموونی راستەوخۆ کە پەیوەندیی بە بابەتی ئاراستەکەوە هەیە.

- نەبوونی دژە کاریگەری و وروژێنەر.
- رووکەشی و پەراوێزبوونی ئاراستەکان وەك ئەو ئاراستانەی لە یانە و مەندیکایەکاندا پێکدێن.

**ئەو هۆکارانەی گۆڕانی ئاراستەکان قورس دەکەن، ئەمانەن:**

- هێز و چەسپاویی ئاراستە کۆنەکە.
- روونییەکی زۆر لە روخسار و دیمەنەکانی ئاراستەی تاك.
- تەنها هەوڵدان بۆ گۆڕانی تاکەکان نەك کۆمەڵەکان وەك هەمەکییەك.
- تەنها هەوڵدان بە وانەبێژی و سیمینار و بڵاوکراوەکان بۆ گۆڕینی ئاراستەکان.
- چەقبەستنی هزری و رەقیی راوبۆچوونی تاکەکان.

## گۆڕینی ئاراستەکان بە باوەڕپێهێنان:

ئایا دەکرێ ئاراستەکانی تاك بگۆڕدرێن؟ خەڵك چۆن کاریگەری لەسەر ئاراستەکانماندا بەجێدەهێڵن؟ چ شتێك وادەکات ملکەچی خەڵەتاندنەکان و فشارەکانی دەرەکی ببین و هەندێ جار هەندێ ئاراستە قبوڵ بکەین و هەندێکیشیان بەتەواوی رەتبکەینەوە؟

دەبێ ئێمە سێ گۆڕاو دەستنیشانبکەین کە رۆڵێکی گەورەیان لە کاریگەری دروستکردن لەسەر بڕیارەکانماندا هەیە بۆ رەتکردنەوەی ئاراستەیەك و قبوڵکردنی یەکێکی دیکە، ئەوانیش ئەمانەی خوارەوەن:

- سەرچاوەی پەیامەکە ، بەواتایەکی دیکە کێ خاوەنی پەیامەکەیە.
- ناوەڕۆکی ئاراستەکە، واتا ئاخۆ پەیامێکی دیاریکراو چی دەڵێت.
- سروشتی کەسی وەرگر لەهەمبەر ناوەڕۆکی پەیامەکە.

### یەکەم: سەرچاوەی باوەڕپێهێنان (سەرچاوەی پەیام)

خودی یەك پەیامی دیاریکراو کاریگەرییەکەی بە چۆنیەتیی گوتن و دەربڕین و ڕاگەیاندنی کەسی پەیامهێن دەگۆڕێت. زۆر ئاسانە ئەوە روونبکەینەوە کە ئەو کەسانەی کاریگەرییەکی زۆرت لێدەکەن، ئەوکەسانەن کە خۆشەویستی و دۆستایەتییەکەت لەگەڵیاندا هەیە و بە ئەزموونی خۆت دەزانیت لە قسەکانیاندا ڕاستگۆن، ئەگەر کەسەکە شارەزا و پسپۆڕ و دڵسۆز و ناوبانگێکی باشی هەبێت کاریگەرییەکەی پتر دەبێت، یانیش ئەگەر لە بابەتێکی دیاریکراو سەرنجڕاکێش بێت بەڵام شارەزاییەکی بەرزی لە بابەتەکەدا نەبێت.

ئامرازەکانی ڕاگەیاندنیش ڕۆڵیان لە ڕەواجدان بە قسەکەرەکە و دروستکردنی وێنەیەکی سەرنجڕاکێش و سەرنجڕانەکێشدا هەیە پێش ئەوەی دەست بە وتار و قسەکەی بکات.

هەروەها چەند هۆکارێك هەن کە پەیوەندییان بە کەسێتیی تاکەکەوە هەیە، وەك کارامەییە کۆمەڵایەتییەکانی بۆ بەرزەفتکردن و کۆنترۆڵکردنی گوێگرەکان و توانادارێوون بۆ بەرزەفتکردنی دۆخی میزاجی بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی هەڵچوونی گوێگرەکانی بورووژێنێ و سەرنج و گرنگیدانیان ڕابکێشێت. بۆیە کەسانی هێمن و شەرمن کاریگەرییەکی کەمتریان لەو کەسانە هەیە کە باوەڕیان بەخۆیان هەیە.

### دووەم: تایبەتمەندییەکانی پەیامەکە و ناوەڕۆك و تایبەتمەندیی ئەو شتەی دەگوترێت:

ئەو شتەی دەگوترێت هەردەبێ باوەڕپێهێنەربێت و نابێ لەگەڵ لۆژیك و ئەقڵ دژبێت، هەروەها دەبێ گوێگر بەجوانی تێبیگات و لە ئاستی هۆشیاری و درككردنی دوور نەبێت و سادەبێت لەناوەڕۆكەكەیدا چەندان بەڵگەی باوەڕپێهێنەری هەبێت، ئەگەر بابەتەكەش كەمێك ئاڵۆزبوو وەها باشترە هەڵێنجانەكان(استنتاجات) بەشێوەیەكی راستەوخۆ بخرێنەڕوو.

وشەی خوێندراوەش لە وشەی بیستراو باشترە و كاریگەریی زۆرترە، كاریگەرییەكەیشی پەیوەندیی بە رێگە و شێوازەكانی پێشكەشكردنی بیرۆكەكە و كات و شوێنی گونجاوەوە هەیە.

## سێیەم: تایبەتمەندییەكانی گوێگران" سروشتی ئەو كەسەی ناوەڕۆكی پەیامەكە وەردەگرێت"

ئەو پەیامەی كەوا ئاراستەی كۆمەڵێك سەباز كراوەتەوە هەمان ئەو كاریگەرییەی نابێت ئەگەر بێت و ئاراستەی كۆمەڵێك مامۆستا بكرێت. هەروەها گوتاری كەسێك سەبارەت بە ئازادیی ئافرەت كاریگەریی جیاوازی دەبێت لەنێو كۆمەڵێك لەو ئافرەتانەی كەوا باوەڕیان بە ئازادیی ئافرەت هەیە، بەڵام كاتێ لەشوێنێكی ئاینی دەخوێندرێتەوە رەنگە ئەم كاریگەرییەی نەبێت.

لێكۆڵینەوەكان ئەوەیان دەرخستووە كە ئەوانەی هەست بە كەموكورتی دەكەن و باوەڕیان بەخۆیان نییە و ناتوانن خۆیان بسەلمێنن، زۆربەی جار دەتوانرێ بەئاسانی ئاراستە تایبەتەكانیان بگۆڕدرێت ئەگەر هاتوو تەواو لە بیروبۆچوونەكانی پێشوویان دڵنیا نەبوون، بۆنموونە ئەو كەسانە خۆیان حەز بەوە دەكەن باوەڕ بە راوبۆچوون و

بڕیارەکانی خەڵکانی دیکە بکەن و هەندێ جاریش بەرهەڵستی و کەللەڕەقی پیشان دەدەن و ئاراستەکانیان بەئاسانی ناگۆڕێت.

هەروەها لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان روونکردووەتەوە کەسانی بەهەژموون و دەستبەسەرداگر زۆر بەئاسانی باوەڕیان پێدەهێنرێت ئەگەر پەیامەکە لەکەسێکەوە دەرچووبێت کە لە سەرچاوە و پۆستێکی بەرزدابێت، ئەو کەسانەش کە رادەی زیرەکییان نزمە زۆر دەکەونە ژێر کاریگەریی ریکلامەکان و بینینش لە وشە پتر کاریگەرییان لێدەکات، بەڵام زیرەکەکان بە بەڵگەی ئاوێتەی ئەقڵی کاریگەر دەبن، هەروەها مێینە لە نێرینە پتر دەکەوێتە بەر کاریگەری و هەندێ کەسیش حەز دەکەن کەسانی دیکە پەسند بکەن ئەگەر هاتوو ئەم پەسندکردنە راوبۆچوونی زۆرینەی خەڵك بێت.

## گونجان و نەگونجانی بیروباوەڕ و رەفتار و ئاراستەکان

لە ژیانی رۆژانەماندا تێبینیی ئەوە دەکەین کە ئاراستەکانی مرۆڤ بە گونجاو و تەبا دێتە پێشچاو لەگەڵ یەکتریدا، بەڵام بناغەی ئەم گونجان و هەماهەنگییە بەزۆری لۆژیکێکی توندوتیژ نییە، بەڵکو پتر لە لۆژیکی دەروونیی نزیکە، ئەمەیش ئەو لۆژیکەیە کە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەژێر ناونیشانی گونجانی مەعریفی Congnitive Consistency توێژینەوەی لەبارەوە دەکات، دانپێدانراو و راستیی یەکەمی گونجانی مەعریفیش ئەوەیە هەمووومان هەوڵی دروستکردنی گونجان و تەبایی نێوان بیروباوەڕ و ئاراستە و رەفتارەکانمان دەدەین، نەگونجان و ناتەبایی نێوان ئەمانەیش دۆخێکی گرژی و ورووژان دروستدەکات کە پاڵمان پێوە دەنێت ئەو پێکهاتانە

هەمواربکەینەوە و بیانگۆڕین بۆئەوەی سەر لەنوێ بگونجێنەوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو بگەنە ئاستی تەبایی و گونجانی لۆژیکی.

گونجان و تەبایی نێوان بیروباوەڕ و ئاراستەکان لەژیانی ڕۆژانەماندا شتێکی باوە، چوونکە ئەگەر باوەڕمان بەوە هێنا کە سەفەرکردن بە شەمەندەفەر لە سەفەرکردن بە ئوتومبێل سەلامەتترە، ئەوا چەند ئاراستەیەکی ئەرێیمان لەهەمبەر شەمەندەفەرەکان و وێستگەکانی هێڵی ئاسنیندا دەبێت. لەم دۆخەدا واپێدەچێت ئاراستەکانمان بەشێوەیەکی سروشتی سەرچاوەیان لەو بیروباوەڕانەوە گرتبێ کە پشتگیری لێدەکات، لەمەیشدا شتێك دروستدەبێت ئەویش ئەوەیە کە هەرچەندە تاك باوەڕی بە راستیی شتێك کرد– لەئەنجامی دروستکردنی حەز و هاندان– ئەوا پلەی باشتردانانەکەیشی دەگۆڕێت، ئەم جۆرە گونجانە کەسانی بواری دەروونناسیی پێیدەڵێن پاساو Rationalization، بۆنموونە ئێمە ئەو شتانە دەڕازێنینەوە کە باوەڕمان پێیان هەیە، بەپێچەوانەشەوە هەر راستە. کاتێ ئێمە شتێك بەباش دەزانین و حەزی لێدەکەین دەبێ باوەڕ بە راستی و جوانیەکەیشی بهێنین، واتا ئەو شتەی ئێمە حەزی پێدەکەین خۆمان ناچار دەکەین باوەڕی پێبهێنین کە راستە، ئەمەیش ئەو شتەیە کە پێی دەڵێین (ئەو بیرکردنەوەیەی کە خۆزگەکان دێنێتەدی Wiahfull Theinkin ، واتا چوونیەکبوونی هزرەکان لەگەڵ حەزەکان، بۆنموونە (ئەوەی لەشتێك بترسێت دێتەڕێی).

# بیردۆزی نەگونجان و دژبوونی مەعریفی

# Cognitive Dissonance

ئەو بیردۆزەیە کە لیۆن فستنگر ١٩٥٧ دایناوە و پێیوایە کە ئەو شتەی پاڵ بەتاکەوە دەنێت ئاراستەکانی بگۆڕێت و هەمواریان بکاتەوە، بوونی دۆخێکە لە نەگونجانی مەعریفی، واتا کاتێ تاك دوو بیرۆکەی دەبێت (دوو ئاراستە و راوبۆچوون) واتا دژبەیەکن، ناتوانێ لەرووی دەروونییەوە بیانخاتە نێو یەك قاڵبەوە و بەیەکەوە بیانگونجێنێ، جا ئەم نەگونجانە دەبێتە هۆی تەنگەتاوییەکی دەروونی و گرژییەك بۆ تاك دروستدەکات و پاڵی پێوەدەنێت کەمیبکاتەوە یان لەناوی ببات، ئەمەیش ئەو بیرۆکەیەیە کە لە بیردۆزی پاڵنەرەکانی ئەو رەفتارەوە وەرگیراوە کە پێیوایە دۆخی برسیەتی گرژییەك لە تاکدا دروستدەکات و پاڵی پێوەدەنێت بەدوای خۆراکدا بگەڕێت.

کاتێ تاك دوو بیرۆکەی دژ بەیەکی دەبێت، یان بەواتایەکی دیکە بیروڕاو ئاراستەکانی لەگەڵ رەفتارەکانیدا جیاوازن، زۆر بەسادەیی مانای ئەوە دەبێت کە ژیان بێهودە و بێمانایە. هەروەك چۆن ئەلبیر کامۆی فەیلەسووف و نووسەری فەرەنسی دەڵێت (مرۆڤ بوونەوەرێکە ژیانی لەپێناو ئەوەدا خەرج دەکات باوەڕ بەخۆی بهێنێ کە ژیانی بێهودە نییە)

جا چۆن باوەڕ بەخۆمان بهێنین کە بوونمان بێهودە نییە؟ واتا چۆن دژایەتی و نەگونجان کەمبکەینەوە و ئاراستەکانمان لەگەڵ رەفتارەکانمان بگونجێنین؟ بیردۆزی نەگونجان و دژبوونی مەعریفی تاوتوێی چەندان جۆری دژبوون دەکات، بەڵام بەرجەستەترینی ئەوانەی تاوتوێی کردوون ئەو دژبوونەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی پاڵ

بە تاکەوە بنێت رەفتارێك بکات، ئەم بیردۆزە پێیوایە هەرچەندە دژبوون و نەگونجانی رەفتار لەگەڵ ئاراستەدا پتر و روونتر بێت، ئەوا گەورەترین پلەی گۆڕانی ئاراستە روودەدات. فستنگر و کارل سمیس ئەزموونێکی زۆر بەنرخیان ئەنجام دا و تیایدا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئەو رەفتارەی دەبێتە هۆی دژبوون و نەگونجانی مەعریفی، دەبێتە هۆی گۆڕینی ئاراستە کاتێ وروژاندنی ئەم رەفتارە بەکەمترین پلەی فشار بێت جا ئەگەر فشارەکە پاداشت بێت یانیش سزا. ئەم بیردۆزە بێژیازی و لێکۆڵینەوەیەکی زۆری نایەوە، وەك گوتمان ئەم بیردۆزە پشت بە پاڵنەرایەتی دەبەستێت، چوونکە نەگونجانی نێوان رەفتار و ئاراستەکانی پێشووی تاك پاڵی پێوە دەنێت ئاراستەکەی بگۆڕێت. ئۆرۆنسۆن پێیوایە دژبوونەکە لەو هەڵوێستانەدا توند دەبێت کە هەڕەشە لە وێنەی خود بکات، چوونکە هەرهەموومان حەز دەکەین بە جوانترین وێنە دەربکەوین، ئەگەر پاساوێکی بەهێز بۆ ئەم دژایەتییە نەبێت پەنایش نابەینە بەر ساختەیی، کاتێکیش رەفتارەکان دەرەنجامی نەرێیی مەترسیداریان دەبێت، ئەوا توانا وبەرپرسیاریەتیشمان پتر دەبێت، بەمەیش رادەی دژبوونەکە پتر دەبێت. هەرچەندە دژبوونەکەش پتربێت توانامان بۆ گۆڕینی ئاراستەکان پتر دەبێت و پێچەوانەی ئەمەیش بیردۆزی درككردن بەخود Self Perception هەیە و پێیوایە ئاراستەکان هێندە گرنگ نین و هیچ گرژییەکیش روونادات کاتێ رەفتار دژی ئاراستە دەبێت، خەڵکیش ئاراستەکانیان ناگۆڕن بەڵکو تێبینیی رەفتارەکانیان دەکەن و ئاراستەکانی خۆیان لێ هەڵدەهێنجن، چوونکە ئەو شتەی دەکرێ تێبینی بکرێت رەفتاری دەرەکی و بەرچاوە، هیچ کردەیەکی پاڵنەریش نییە کە ئەمە لەخۆ بگرێت.

هەرچۆنێك بێت ئەوا هەندێ لە کەسانی بواری دەروونناسی و بەتایبەت زانستی سیاسی هەن کە پشت بە بیرۆکەی گونجان و هەماهەنگیی ئاراستە و بیروباوەڕ و رەفتار نابەستن، بەڵکو پێیانوایە کە زۆربەی بیروڕایەکانمان بەشێك نین لە سیستمێکی گونجاوی بەها و بیروباوەڕەکان، بەڵکو بیروباوەڕەکان وەك بەشۆکە و دوورگەی دابڕاو هەن و گشت راوبۆچوونێکش لە باوەڕو ئاراستە و ئەو درککردنە کۆمەڵایەتییە پێکدێت کە ئەم راوبۆچوونە بەدەستیدەهێنێت.

## پێوانی ئاراستەکان

پێوانی ئاراستەکان شتێکی بەسوودە چوونکە پێشبینیکردنی رەفتار ئاسان دەکات و تیشك دەخاتە سەر راستی و هەڵەی توێژینەوە گشتییە تیۆرییەکان، هەروەها ئەگەر بمانەوێ بەرەو بابەتێکی دیاریکراو گۆڕان و هەموارکردنەوە بۆ ئاراستەکانی کۆمەڵە بکەین سوودبەخش دەبێت. ئامانجی پێوانی ئاراستەکان بریتییە لە زانینی کۆکی و ناکۆکی و رێکەوتن و دژایەتیکردنی ئاراستەکان و زانینی توندیی ئاراستە و زانیاریی جێگیر.

لە مەرجەکانی پێوانی ئاراستەکان روونیی بابەتی ئاراستەکە و سادەیی و گرنگیەکەیەتی لەهەمبەر پشکێنراوەکانەوە.

دەتوانین ئامرازەکان و شێوازەکانی پێوانی ئاراستە دەروونییەکان پۆلێن بکەینە سەر چوار جۆری سەرەکی، کە ئەوانیش:

١. شێوازەکانی تێبینیکردنی رەفتار.

٢. شێوازەکانی لکاندن (الاسقاطی).

٣. پێوەرەکانی پێوان و خەملاندنی خودی.

٤. شێوازەکانی ناسین و ئاشنابوون بە ئاراستەکان لەمیانی گۆڕاوەکان و کاردانەوەکانی فیسیۆلۆژی.

ئێستا بەرجەستەترینی ئەو پێوەرانە دەخەینەڕوو کە لە بواری دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا بەکاردێن:

## پێوەری بوگاردس (ماوەی کۆمەڵایەتی، رەهەندی کۆمەڵایەتی) ١٩٢٨

پێوەری رەهەندی کۆمەڵایەتی ئەو یەکە و دەستەواژانە لەخۆدەگرێت کە هەندێ هەڵوێستی ژیان دەنوێنن بۆ گوزارشتکردن لە مەودای کۆمەڵایەتی بۆ پێوانی لێبوردەیی و دەمارگیری و رق و نزیکایەتی و دووریەکەی لەهەمبەر کۆمەڵەی رەگەزپەرست و گەلی دیاریکراو. پێوەری بۆگاردس لە پێوەرە کۆبووەوەکانە Commutative کە تیایدا یەکەکان لەگەڵ یەکتریدا گرێ دەدرێن. واتا ئەو کەسەی لەم پێوەرەدا وەڵامی پرسیاری (٢) بە بەڵێ و رازیبوون دەداتەوە، دەبێ وەڵامی پرسیاری (١)یش بە بەڵی و رەزامەندی بداتەوە، هەروەها ئەو کەسەی بە بەڵی و رەزامەندی وەڵامی پرسیاری ژمارە (٣) دەداتەوە، ئەوا وەڵامی ژمارە (١) و (٢) بەبەڵی دەداتەوە و بەم شێوەیە ئەو کەسەی وەڵامی پرسیارێك بە بەڵێ و رەزامەندی دەداتەوە دەبێ لە پێوەرە هەمەکییەکەدا پلەی باڵاتر لەو کەسە وەدەستبێنی کە بە نەخێر وەڵام دەداتەوە، نمرەکانی تاکیش بە زانینی ژمارەی ئەو یەکانە حسێب دەکرێن کە بە بەڵێ و رەزامەندی وەڵامی داونەتەوە.

بۆگاردس ویستوویەتی ئاستی قبوڵکردن و رقبوونەوەی ئەمریکییەکان لە هەمبەر ئەندامانی گەلانی دیکە بزانێت، بە واتایەکی دیکە لەلایەك ویستوویەتی ئاستی دوورکەوتنەوەی کۆمەڵایەتیانەی نێوان ئەمریکییەکان خۆیان و لەلایەکی دیکە

ئەمریکییەکان و رۆڵەی گەلانی دیکەی بۆ روونبێتەوە. حەوت وەڵامەکەی پێوەری بۆگاردس وەك هێڵکێشێکی پلەپلەیە بۆ نزیکی و دووری رەهەندی کۆمەڵایەتی و وەڵامی یەکەم بەرزترین نمرەی نزیکبوونەوەیە و بەرزترین نمرەی دوورکەوتنەوەیش وەڵامی حەوتەمە و پیادەکردنی زۆر ئاسانە.

ئەمەی خوارەوە نموونەی پێوەری رەهەندی کۆمەڵایەتیی بوگاردسە

| نمرە / کۆمەڵەکان | ژنیان لێ دەخوازم و شوویان پێدەکەم | هاورێیەتیان لەگەڵدا دەکەم | دەبمە دراوسێیان | لە کاردا هاوکاریان دەبم | وەك هاووڵاتییەکی وڵاتەکەم قبوڵیان دەکەم | وەك میوان و سەردانیکەری وڵاتەکەم قبووڵیان دەکەم | لە وڵاتەکەم دووریان دەخەمەوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئینگلیز | | | | | | | |
| فەرەنسیەکان | | | | | | | |
| ئەڵمانییەکان | | | | | | | |
| تورکەکان | | | | | | | |
| هندییەکان | | | | | | | |
| جوولەکەکان | | | | | | | |
| زنجییەکان | | | | | | | |

## پێوەرە یەك رەهەند یەکسانەکانی پرستۆن ١٩٣٥

پێوەرەکە لە کۆمەڵێك یەکە و دەستەواژە پێکهاتووە کە هەر یەکەیان کێشی تایبەت و بەهایەکی گوزارشتکەریان لەهەمبەر دۆخەکەیدا هەیە بەنیسبەت پێوەرەکە وەك گشتێك، بەڵام سەبارەت بە رێگە و شێوازی ئامادەکردنی پێوەرەکە و پێشکەشکردنی کێشی تایبەت بە گشت دەستەواژەیەك ئەوەیە کە توێژەر ژمارەیەکی زۆری ئەو دەستەواژانە کۆدەکاتەوە کە لەسەد پترن و ئەو ئاراستەیە دەپێوێت کە دەیەوێ بیپێوێت و روماڵی ئاستی رێکەوتن و رەتکردنەوە و پەسندکردن و رقبوونەوەو خۆ دوورگرتن دەکات، دواتر هەر دەستەواژەیەك لەسەر کاغەزێکی جیاواز دەنووسێت و دەستەواژەکان دەخاتە بەرچاوی کۆمەڵێك حوکمدەری پسپۆڕ و داوا لە هەر یەکێکیان دەکات دەستەواژەکان بخەنە نێو خانەیەك لە (١١) خانەکە، بەشێوەیەك زۆربەی دەستەواژە ئەرێییەکان لە خانەی ژمارە (١) دا دەبێت و نەرێیترینیان لە (١١) و ناوەندییەکانیش لە (٦) دادەنێت و دەستەواژە نا روون و لێڵەکان و نەگونجاوەکان و دووبارەکانیش لادەبات و گونجاوترین دەستەواژە هەڵدەبژێرێت، بەشێوەیەك یەکێك و یەکێکی دیکە بەهەمان نمرە لەیەکتری دوور دەکەونەوە و دەستەواژەکان لە پێوەرەکەدا بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و ناڕێکی بەرەوخوار و بەرەو سەرەوە دەنووسرێن و تاکیش لەرووی کاریگەریی دەستەواژەکە بەسەر خۆی و ئاستی گونجانی ناوەڕۆکەکەی لەگەڵ ئاراستەکانی خودی خۆی حوکمی لەسەر دەدات.

پێوەرەکە لە ٢٠–٥٠ دەستەواژە پێکدێت و لەسەر پشکێنراو پێویستە نیشانەی (+) لە بەرانبەر ئەو دەستەواژانە دابنێ کە پێیوایە رەزامەندە لەسەری و لەگەڵیدا دەگونجێت، جا هەرچەندە بەهای نمرەی پشکێنراو نزمبوویەوە ئاراستەکەی پتر

لایەنگری بابەتەکەیە. ئەمانەی خوارەوە نموونەیەکی روونکردنەوەی رێگەکەی پرستۆن بۆ پێوانی ئاراستەی جەنگ:

– هیچ پاساوێك بۆ جەنگ نییە.

– جەنگ کێشمەکێشێکی تاڵ و بێسوودە.

– دەستکەوتەکانی جەنگ لە خراپیەکانی زۆر کەمترە.

– جەنگ لەناوبردنێکی مرۆڤەکانە و هیچ پێویست نییە.

– بەرزترین ئەرکەکانی پیاو ئەوەیە لەپێناو وەدیهێنانی شکۆی ولاتەکەیدا بجەنگێت.

– هەندێ راوبۆچوون هەن لایەنگری جەنگن.

– لە هەلومەرجی دیاریکراودا جەنگ بۆ وەدیهێنانی دادپەروەری پێویستە.

– زۆر قورسە بڕیار لەسەر ئەوە بدەین کە ئاخۆ جەنگ سوودبەخشە یان زیانبەخش.

## شێوەی کۆتایی پێوەرەکەی (پرستۆن)

دوای ئەنجامدانی حیسابەکانی پێشوو و دانانی نمرە لەبەردەم گشت دەستەواژەیەکدا، ئەو دەستەواژانە هەڵدەبژێرین کە دەبنە شێوەی کۆتایی پێوەرەکەو زۆربەی جاریش پێوەرەکەی ناوبراو بەپێی ئەم بنەمایانەی خوارەوە لە ٢٠ دەستەواژە پێکدێت:

١– دوای لادانی دەستەواژە بێکەڵك و نەگونجاوەکان، ئەو دەستەواژانە دەمێننەوە کە ئەو مەرجانە وەدیدەهێنن کە پێشتر باسکران.

٢- تەنها بەیەکێك لەو دەستەواژانە دەستهەڵدەگرێت کە بەهای نێوەندەکەی (الوسیطی) یەکسان دەبێت.

٣- دەستەواژەکان بەدرێژایی پێوەرەکە ڕێکدەخرێن کە لە ڕەزامەندیی تەواو دەستپێدەکات و لە ڕەتکردنەوەی تەواویش کۆتایی دێت و ڕەچاوی یەکسانیی دووریی نێوان دەستەواژەکان دەکەین، واتا جیاوازیی نێوان نێوەندی نمرەی گشت دەستەواژەکان یەکسان بێت کە بەپێی توانا بەدوایدا دێت.

لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە بڕیار لەسەر هەڵبژاردنی ڕستەکانی کۆتایی پێوەرەکە دەدەین:

ا- ڕوونی واژەیی و دیاریکردنی مەبەست لە ڕستەکە (بەکارهێنانی ئاستی چاریەگی بۆ جیاکردنەوەی دەستەواژە ڕوونەکان و دیارینەکراوەکان).

ب- دابەشکردنی ڕستەکان لەنێوان مەودای پێوەرەکە لە زۆر ڕەزامەندبوونەوە بۆ ڕەتکردنەوەی توند، ڕستەکانیش لە ڕووی قبوڵکردن و ڕەتکردنەوەوە بەرجەستەبوونەکەی ڕووندەکەنەوە ، دوای ئەوەی دەخرێتە بەر دەستی داوەرەکان و بڕیار دەرەکان.

ج- ئەو ڕستانە لا دەدرێن کە بەهای نێوەندییان (الوسیطی)یان یەکە ، تەنها یەك جاری بەسە.

د- یەکسانیی دووریی نێوان یەکەکانی پێوەرەکە، واتا تا دەکرێت دەبێ جیاوازیی نێوان نێوەندی نمرەکانی هەر ڕستەیەك یەك بێت.

## پیادەكردنی پێوەرەكە

لەكاتی پیادەكردنی پێوەرەكە بەسەر ئەو پشكێنراوانەی كە مەبەست پێوان و دەستنیشانكردنی ئاراستەكانیانە، داوایان لێدەكرێت نیشانەیەك بە چوار دەوری ژمارەی ئەو دەستەواژەیەدا بكێشن كە هەست دەكەن لەگەڵیان دەگونجێت و لەسەری رەزامەندن. نمرەی پشكێنراویش نێوەند (وسیطی) نمرەی ئەو دەستەواژانەیە كە رەزامەندیی لەسەر دەر دەبڕێت، بۆنموونە: ئەمەی خوارەوە هەندێ دەستەواژەی پێوەری ئاراستەیە لەهەمبەر جەنگدا كە (لە سرستۆن وەرگیراوە).

١- شەرەفی نەتەوەیی گرنگیی خۆی هەیە و جەنگیش تاكە ئامرازی پاراستنیەتی ١,٣.

٢- كاتێ جەنگ رادەگەیەندرێ ئەرك وەهای پێویست دەكات خۆمان رادەستی بەڕێوەبەرایەتی ئامادەكردنی سەربازان (تجنید) بكەین ٢,٥.

٣- جەنگ و ئاشتی بۆ پێشكەوتن پێویستن ٥,٤.

٤- بەرزترین ئەو شتەی تەمامان پێی هەیە و ئاواتی بۆ دەخوازین وازهێنانی بەشەكییە لە جەنگ ٥,٦.

٥- پێشێلكردنی ماف و دەروونی مرۆیی لەكاتی جەنگدا هۆی تاوانە جۆراوجۆرەكانە ٨,٤.

٦- لەسەر گشت دەوڵەتێك پێویستە یەكسەر چەكەكانیان دابنێن ١٠,٦ .

ئەگەر پشكێنراو لەسەر دەستەواژەكانی ٥,٤,٣ رازیبوو ئەوا نمرەكەی یەكسانە بە ٥,٤-٢/٨,١٠ = ٢/٥,٦+٢،٥.

## پێوەری لیکرت (کۆ هەڵسەنگاندەکان) ١٩٣٢

پێوەرەکەی لیکرت لەهەمبەر چەند بابەتێك ژمارەیەك ئاراستەی بەکارهێناوە: (کۆمەڵەکان، دەستگەکان، رووداوەکان، تاکەکەسەکان.... هتد) و لە پلیکانەیەکی پەیژەیی پێنج قۆناغ و خاڵ یان حەوت یان نۆ پێکهاتووە

| | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەستەواژە | زۆر رازیم | رازیم | بێلایەنم | ناڕازیم | هەرگیز رازی نیم |

| | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دەستەواژە | تەواو رازیم | زۆر رازیم | تا ئاستێ رازیم | رایەکی دیاریکراوم نییە | تا ئاستێ دژم | زۆر دژم | تەواو دژم |

بەردەوام زۆرجار هەندێ جار کەمێك بەدەگمەن

داوا لە پشکێنراو دەکرێت نیشانەی (+) لەو شوێنە دابنێت کە لەگەڵ ئاراستەکەیدا دەگونجێت لەهەمبەر گشت دەستەواژەکاندا لە رازیبوونی تەواوەوە تا ناڕازیبوون و دژبوونی تەواو.

بەڵام بەرجەستەترینی ئەو هەنگاوانەی بونیادی ئەم پێوەرە لەخۆیدەگرێت ئەمانەن:

١. دیاریکردنی ئەو بابەتەی کە نیاز وایە بپێورێت و دابەشکردنی بۆ سەر رەگەزە سەرەکییەکانی.

٢. پێناسەکردنی بابەتەکە بەشێوەیەکی پیادەکاری (اجرائی)، بەمەبەستی گەیشتنە بە تێگەیشتن و بەرچاو روونییەکی دیاریکراوی بابەتەکە کە لەلایەن ئەوانەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن رێکەوتنی لەبارەوە کرابێت.

٣. بۆنموونە ئەگەر ویستمان لەهەمبەر پرسی دیموکراسیدا ئاراستەی فێرخوازانی زانکۆیەك بپێوین، ئەوا دەبیێ بۆ چەمکی دیموکراسیانە پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ مەبەستەکە بکرێت.

٤. پرسیاری کراوە ئاراستەی کۆمەڵەیەکی دیاریکراوی پشکێنەران دەکرێت و داوایان لێدەکرێت لایەنە گرنگەکانی چەمکەکە باسبکرێن.

٥. وەڵامەکانی کۆمەڵەکە شیدەکرێنەوە و لەسەر شێوەی برگەی مانا دیاریکراو و روون و کورت دادەرێژرێن.

٦. ئەم برگانە بەشێکیان نەرێیی و بەشێکیشیان ئەرێیی دەبن.

٧. هەندێ برگەی دیکەش بۆ ئەم برگانە زیاد دەکرێن و لە ئەدەبیاتی بابەتەکە و شارەزایی لێکۆڵەر و کەسانی پسپۆڕ و شارەزا و تایبەتمەند وەدەستدێن.

٨. ئەوسا کۆمەڵەیەکی زۆری برگەمان دەبێت کە هەرهەموویان پەیوەندییان بەو بابەتەوە دەبێت کە دەمانەوێ بیپێوین.

٩. لەکاتی پێوان و هەڵسەنگاندنی بابەتێکی دیاریکراودا برگەکان پێشکەشی کۆمەڵێك شارەزا دەکرێن کە لە بابەتە تایبەتەکەدا پسپۆڕن بەوەی کە پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ بابەتەکە دابنرێت و داوا لە گشتیان دەکرێت حوکم لەسەر برگەکە بدەن بەوەی برگەی باشن یان خراپ، یان ئاخۆ پێویستیان بە هەموارکردنەوە هەیە بۆ پێوانی ئەو شتەی کە نیازمانە بیپێوین.

١٠. ئەو بڕگانەی زۆربەی داوەران ڕەزامەندییان لەسەر داوە وەردەگیرێن، بڕگەکانی دیکەش لادەبرێن، بەو مانایەی ئێمە ئەو بڕگانە وەردەگرین کە ٨٠٪ داوەران پێیانوایە ئەو تایبەتمەندییە دەپێوێت کە بۆ پێوانی دانراوە.

١١- بەمەبەستی دڵنیابوون لە روونیی ڕێنمایی و ڕێکارەکانی پێوەرەکە و دۆزینەوەی بڕگە لێڵ و ناڕۆشنەکانی نێوی و دیاریکردنی ئەو کاتەی کە پشکێنراوان بۆ وەڵامدانەوە پێویستیان پێی هەیە، دەبێ گشت بڕگەکان بڕگەکان بە نەرێیی و ئەرێییەوە لەکاتی بەدیارخستندا بەشێوەیەکی هەڕەمەکی ڕیزبەندبکرێن، دواتر پێنج جێگرەوە یان وەڵام بۆ وەڵامدانەوەی هەر بڕگەیەك دیاری دەکرێن ئەوانیش بریتین لە (زۆر رازیم، دوودڵم، ناڕازیم، زۆر ناڕازیم). چوونکە ئەم ئاست و ماوە پێنجینەییەی جێگرەوە و وەڵامەکان لە ئاست و ماوەی سێینە پتر دەرفەت بۆ پشکێنراو دەرەخسێنی گوزارشت لە هەڵوێستی خۆی بکات. دواتر ڕێنماییەکانی وەڵامدانەوە لەسەر بڕگەی پێوەرەکە دادەندرێ و تیایدا گرنگیی وەڵام بەشێوەی بابەتی بۆ بڕگەکان و جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە پێوەرەکان بۆ مەبەستەکانی لێکۆڵینەوەی زانستییە، ڕووندەکرێتەوە. بۆیە داوایان لێدەکرێت وەڵام بدەنەوە و ناوی خۆیان نەنووسن، دەرخستەکە (استبیان) بەسەر کۆمەڵەیەکی هەڕەمەکیی فێرخوازاندا دابەش دەکرێت و وەها باشترە ژمارەیان لە (١٠٠) فێرخوازی کوڕ و کچ کەمتر نەبێت، لێکۆڵەریش ئەو کاتە دیاریی دەکات کە فێرخوازان بۆ وەڵامدانەوەی بڕگەکان بەسەریان بردووە، هەروەها ئەو بڕگە لێڵ و ناڕۆشنانەیش دیاریی دەکات کە فێرخوازان پرسیاری زۆریان لەبارەیەوە کردووە بۆ ئەوەی هەمواربکرێتەوە.

١٢. بۆ سەحدانی فۆرمەکانیش بەپێی ئەو پێنج وەڵام و جێگرەوەیەی بۆی دانراوە دەبێ کێش و بەهای گشت برگەیەکی دەرخستەکە دیاریی بکرێت، ئەم بەهایەش لەنێوان (١–٥) نمرەیە. جا لەبەرئەوەی برگەکان دابەشکراونەتە سەر برگەی ئەرێیی ونەرێیی، بۆ وەڵامی زۆر رازیم (٥) نمرە و (٤) نمرە بۆ جێگرەوەکە و (٣) نمرە بۆ جێگرەوە (دوودڵ) و (٢) نمرە بۆ رازی نیم و یەك نمرە بۆ زۆر بەتوندی ناڕازیم دادەنرێت. برگەکانیش لە دۆخی نمرەی نەرێییدا پێچەوانە دەبنەوە.

١٣. دەرهێنانی هێزی جیاکردنەوە بۆ گشت برگەیەك لە برگەکانی پێوەرەکە، ئەمەیش بۆ هەڵبژاردنی ئەو برگانەیە کە توانای جیاکردنەوەیان هەیە لەنێوان ئەو وەڵامدەرەوانەی کە لە تایبەتمەندییەکەدا بەهێزن و ئەوانەش کە بێهزن، ئەمە جگە لەوەی کە کردەی شیکردنەوەی برگەکان بۆ بونیادنانی پێوەرەکان بە مەرجێکی سەرەکیی رێبازی لیکرت دادەندرێت.

ئەوەی شایانی ئاوڕلێدانەوەیە ئەوەیە رێژەی تاکەکەسەکانی نموونە (عینە)ی جیاکردنەوەکە بۆ برگەکان نابێ لە (١٥–١) کەمتر بێت، ئەمەیش بۆ کەمکردنەوەی دەرفەتەکانی رێکەوتە لە وەڵامدانەوە. هەروەها ئەم رێژەیە دوو مەرج وەدەستدەهێنێ کە دەبێ لە نموونەی جیاکارییەکەدا هەبن، ئەو دوو مەرجەش بریتین لە قەبارە و جیاجیایی.

ئەمەیش مانای ئەوەیە ئەگەر پێوەرەکە لە بیست برگە پێکبێت، دەبێ نموونەی پێوانەکە ژمارەکەی ١٠٠ کەس بێت بۆ ئەوەی وەڵامی پێوەرەکە بدەنەوە.

١٤. سەحدانی فۆرمەکان، بۆ هەر فۆرمێك نمرەی گشتیی دەردەهێنرێت کە بریتییە لە کۆی نمرەکانی لەسەر گشت برگەیەك لە برگەکانی پێوەرەکە.

نمرەکانی وەڵامدەرەوەکان بەشێوەیەکی سەربەرەوخوار و لەبەرزترین نمرە بۆ نزمترین نمرە لەسەر گشت فۆرمێکدا ڕێکدەخرێت و ڕیزبەند دەکرێت، دواتر ڕێك وەك نمرە نزمەکان ٢٧٪ نمرە باڵاکان وەردەگرین، ئەوسا دوو کۆمەڵەمان دەبێت کە بناغەو پێکهاتەی هەریەکێکیان (٧٢) فۆرم دەبێت و کۆی فۆرمەکانیش (٤٥) فۆرم دەبن. دوای دەرهێنانی نێوەندی حیسابی و لاربوونەوەی پێوەریی گشت بڕگەیەك تاقیکردنەوەی تائی t– بۆ دوو نموونە (عینە)ی سەربەخۆ بەکاردەهێنرێت ئەمەیش بۆ بەراوردکردنی ڕێژەی مامناوەندیی نمرەی هەردوو کۆمەڵەکەیە. ئەگەر دەرەنجامەکانی تاقیکردنەوە تائیەکە ئەوەی پیشان دا کە جیاوازییەك و ئاماژەیەکی ئامارییانە لەنێوان ناوەندیەتی (متوسط)ی گشت بڕگەیەك لە کۆمەڵە باڵاکە و لەنێوان نێوەند (متوسطی) بڕگەی کۆمەڵە نزمەکەدا هەیە، ئەوا مانای وایە کە بڕگەکە توانای جیاکردنەوەی نێوان هەردوو کۆمەڵە بەرز و نزمەکەی هەیە، بۆیە ئەم بڕگەیە لە پێوەرەکەدا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەو بڕگانەی جیاوازیی ئەوتۆیان لەنێواندا نییە کە ئاماژەیەکی ئامارییانەی هەبێت، ئەوا لە پێوەرەکە لادەبرێن چوونکە توانای جیاکردنەوەی نێوان هەردوو کۆمەڵەکەیان نییە.

١٥. هەروەها دەتواندرێ هەر ڕێگەیەك لە ڕێگەکانی شیکردنەوەی بڕگەکان بەکاربهێندرێت، وەك پەیوەندیی نمرەی بڕگەکان بە نمرەی هەمەکیی پێوەرەکە، بەم ڕێگەیە دەتواندرێ ئاستی گونجانی بڕگەکان لە پێوانی دیاردەی ڕەفتاریدا دیاریی بکرێت.

## پێـــوەری ئوزجـــود بـــۆ جیاکردنـــەوەی سمـــانتیکی (توێژینـــەوەی شیکردنەوەی ماناکان) ١٩٥٠.

ئوزجـود پێیوایـە گـشت واژە و وێنانـدێك دوو مانـا و چـەمكی لـەلای تاكـدا هەیـە، یەكەمیان مانایەكی ڕێنماكارانەی مادییە (ئەو پرسانەی دەربڕینی ئەم واژە و وێناندانـە بۆ شتەكان پشتڕاستدەكەنەوە، واتا بـەكارهێنانی ئـەم واژە و وێناندانـە لەهەمبەریاندا ڕاست دەردەچێت) بۆنموونـە واژەی مـاڵ ئـەو شـوێنەیە كـە بـە دیـوار دەورە دراوە و خانـەوادە تیایـدا نیـشتەجێ دەبێـت، دووەمـیش مانـای هەڵچوونیی ویـژدانیی سـۆزیی شتێكە، واتا كەڵەكەبوونی شارەزایی هەڵچوونی و ویژدانییـە لـە چـواردەوری واژەیـەك كە ڕەنگە دڵخۆشكەرانە و نائاسایی بێت، یانیش بەهێز و بێهێز بێت و هتد.. ئەو جۆرە دەتوانێ كاردانەوەی كەسێك لەهەمبـەر بابەتەكـەدا دیـاریی بكـات، جـا لـەژێر تیـشكی ئەمـەدا پێـوەری ئوزجـود لەسـەر ئـەو بنەمایـە بونیـاد دەنرێـت كـە ئـەو وێناندانـە بـە پـــشكێنراو ببەخـــشێت كـــە ئامـــاژە بـــە كـــەس و گیانـــدار و بێگیـــان و سیـــستەمەكانی كۆمەڵایەتی و هتد بكات بۆئەوەی دەستنیـشانی پایەكـەی بكـات لـەنێوان دوو كۆمەڵـە سیفەتی دژبەیەكی وەك جوان– ناشرین– گەورە– بچووك– هێز– لاواز و بەم شێوەیە.

پێوەری هەڵسەنگاندن لەلای ئوزجود لە حەوت مەودا پێكدێت:

باش:–:–:–:–:–:–:خراپ

هێمای × ئاماژە بە بەخت و نەسیبی ئـەو كەسـە دەكـات كـە پرسـیاری لێـدەكرێت لەڕووی باشە و خراپەوە، باش:–:–:–:–:–:–×: خراپ

پشكێندراو ئاگادار دەكرێتـەوە كـە نیشانەكە بەشـێوەیەكی دیـاریكراو لەسـەر یـەك مـەودا دابنێـت نـەك لەسـەر دوو مـەودا یـان لەسـەر نـاوبڕی مـەوداكان، دەبـێ لـەوەش

دڵنیابێت کە نیشانەکەی داناوە و نابێ لەیەك نیشانە پتر دابنێت، بەپێی ئەم پێوەرە لە پەیوەندیی نێوان سیفەتە جۆراوجۆرەکان، سێ هۆکاری بەرپرس هەن ئەوانیش:

١. هۆکاری جوان و ناشرین: باش و خراپ جوان ناشرین – دلخۆشکەر– دڵتەنگکار، بەختیار – نابەختیار، دەستپاك– خائین، بەهادار.... هتد.

٢. هۆکاری هێز و بێهێزی: رەق– نەرم، قووڵ– تەنکاو، ئازا– ترسنۆك، زبر– لووس، گەورە– بچووك، بەهێز بێهێز، قورس– سووك و ....هتد

٣. هۆکاری چالاك و تەنبەڵی: خێرا– هێواش، چالاك– تەنبەڵ، گەرم– سارد، گرژ– خاو. هتد

## پێوەری بەکۆمەڵی جتمان ١٩٤٧

جتمان هەوڵیداوە پێوەرێکی بەکۆمەڵی پەیژەداری پلەبەپلە دابهێنێ و مەرجێکی گرنگیی تیادا وەدیبهێنێ ئەویش ئەوەیە ئەگەر تاك لەسەر دەستەواژەیەك رەزامەندیو بەڵێی پیشان دا سەدا سەد مەبەستی ئەوەیە کە لەسەر ئەو دەستەواژانەشدا رەزامەندی و بەڵێی پیشانداوە کە لەخوار دەستەواژەی یەکەمە و لەسەر گشت ئەو دەستەواژانە بەڵێ و رەزامەندیی پیشان نەداوە کەو کەوتوونەتە سەرەوەی دەستەواژەکەی یەکەم جارەوە.

جا نمرەی کەسەکەیش ئەو خاڵەیە کە دەستەواژەکانی سەرەوە لە دەستەواژەکانی خوارەوە جیا دەکاتەوە، بێگومان رەزامەندیی لەسەر دەستەواژەکانی سەرەوە داوە و نەخێر و ناڕەزایی لەهەمبەر دەستەواژەکانی سەرەوە نەداوە.

ئەمەی خوارەوە نموونەی پێوەرێکی جتمانە بۆ پێوانی ئاراستەی تاکەکان لەهەمبەر ئەو پشك و بەشەی کە دەبێ تاك لە رۆشنبیریدا وەدەستی بهێنێ:

١. کۆتایی ئاستی زانکۆیی بۆ رۆشنبیرکردنی تاك بەس نییە

بەڵێ: : : : نەخێر

٢. کۆتایی خوێندنی ئامادەیی بۆ رۆشنبیرکردنی تاك بەس نییە.

بەڵێ: : : : نەخێر

٣. کۆتایی خوێندنی ناوەندی بۆ رۆشنبیرکردنی تاك بەس نییە

بەڵێ: : : : نەخێر

٤.کۆتایی خوێندنی سەرەتایی بۆ رۆشنبیرکردنی تاك بەس نییە.

بەڵێ: : : : نەخێر

٥. دەبێ رۆشنبیریی تاك لەخوێندنەوە و نووسین پتر بێت.

بەڵێ: : : : نەخێر

ئەم پێوەرە تەنها بۆ پێوانی ئەو ئاراستانە دەست دەدات کە دەتواندرێ دەستەواژەی پلەبەپلەی تیادا دابندرێت.

## تاقیکردنەوەکانی دانەپاڵ (الاسقاطية)

تاقیکردنەوەکانی دانەپاڵ بە رێگەیەکی پێوانی ئاراستەکان دادەنرێت و ئاراستەکانی تاك لەهەمبەر بابەتێکی دیاریکراو دەپێوێت بەبێ ئەوەی بزانێ ئامانجی پێوانەکە چییە، چوونکە ئەو ئاراستە دەروونیانەی بەشێوەیەکی خۆکارانە لە وەڵامەکانی تاکدا بەدیاردەکەون لەهەمبەر ئەو وروژێنەرانەی تاك دەکەوێتە بەر کاریگەریانەوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان دۆخی ئەقڵیی تاك پیشان دەدەن، بەم رێگەیە رێگە بە پشکێندراو دەدرێت خۆی وەڵامەکان بداتەوە دواتر نمرە بۆ ئەم وەڵامانەی دادەندرێت و لەلایەن شارەزایانی ئەم تاقیکردنەوانە دیاری دەکرێن.

تاقیکردنەوەکانی دانەپاڵ دابەش دەکرێنە سەر دوو بەش، ئەوانیش: وروژێنەرەکانی دانەپاڵ و رەفتاری گوزارشتیە.

أ) وروژێنەرەکانی دانەپاڵ:

ئەم رێگەیە دوو شێواز لەخۆیدەگرێت ئەوانیش تاقیکردنەوەکانی وێنە لێڵەکان و گەڕاندنەوە و گێڕانەوەی سەربەستانەیە.

١. تاقیکردنەوەکانی وێنە لێڵەکان.

لێرەدا هەندێ وێنەی لێڵ و ناڕۆشن دەخرێنە بەرچاوی پشکێنراو، بۆنموونە کۆمەڵەیەکی کرێکاران و سەرۆکەکەیان، یان کۆمەڵەی سەرباز و جووتیاران و زنجی و ئافرەتان و هتد تیادایە، داوا لە پشکێنراو دەکرێت باسی ئەو شتانە بکات کە وێنەکە گوزارشتیان لێدەکات، یانیش داوای لێدەکرێت گوزارشتی وێنەکان بنووسێت.

٢. رێگەی گەڕاندنەوە و گێڕانەوەی سەربەستانە (التداعی الحر): لەم رێگەیەدا کەسەکە هەندێ لەنێو کۆمەڵەیەکی دیکەی وشەکاندا لەو وشانە پێشکەش دەکات کە پەیوەندییان بە بابەتی ئەو ئاراستەیەوە هەیە کە مەبەست شرۆڤەکردنیەتی و داوای لێدەکرێت یەکەمین وشە و بیرۆکە باس بکات کە لەکاتی بیستنیدا بەرگوێی دەکەوێت. هەروەها شێوازی تەواوکردنی رستەش هەیە کە تیایدا هەندێ رستەی ناتەواو پێشکەش بە پشکێنراو دەکرێت و داوای لێدەکرێت بە یەکەمین ئەو وشانەی بە زەینیدا دێت تەواوی بکات ، رەنگە رستەکەش لەبارەی پرس و گەل و پیشە و کۆمەڵە و تاکەکەسێك و هتد بێت.

هەروەها شێوازی تەواوکردنی رستەش هەیە و تیایدا لەبارەی مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراودا چیرۆکێکی ناتەواو پێشکەش بە پشکێندراو دەکرێت و دواتر داوای لێدەکرێت تەواوی بکات.

دواتریش شێوازی پرسیاری دانەپاڵ هەیە، رەنگە توێژەر چەندان پرسیار لە پشکێنراو بکات وەك (ئەگەر بوویتە سەرکردە و ملیۆنێرێك چیدەکەیت)، لەکاتی شیکردنەوەی وەڵامی پشکێنراوان توێژەر ئەوەی بۆ روونەبێتەوە کە گوزارشت لەو وەڵامدانەوە نەستیانە دەکات کە بەبێ مەبەست داویانەتە پاڵ ئەو بابەتانەی کە توێژەرەکە مەبەستی بووە ئاراستەکەیان لەهەمبەریدا بزانێت.

ب- رەفتاری گوزارشتی:

بۆ شرۆڤەکردنی ئاراستەکانی منداڵان لەهەمبەر بابەتەکانی کۆمەڵایەتی وەك ئاراستەیان لەهەمبەر دایبابان و مامۆستایان و هاوڕێیان و هتد گەمە و بووکۆڵە و کەرەستەکانی دیکەی گەمەکردن بەکاردەهێندرێن، منداڵیش لەکاتی گەمەکردن لەهەمبەر ئەو کەسێتیانەدا لە هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتیدا گوزارشت لە ئاراستەی خۆی دەکات.

هەروەها شێوازی گێڕانی رۆڵی کۆمەڵایەتیش بەکاردەهێندرێت(سایکۆ دراما و سۆسیۆدراما) ئەم شێوازەش مۆرینۆ دایناوە کە تیایدا تاك بە بەشداریکردن لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی دەنوێنێ.

# بەهاکان Values

## پێشەکی

بەهاکان بە دیاریکەرێکی گرنگی رەفتاری کۆمەڵایەتی دادەندرێن و دەرەنجامی گرنگیدانەکان و چالاکییەکانی تاك و کۆمەڵەیە.

بەهاکان لەلایەن زانایانی دەروونناسەوە گرنگییەکی زۆر گەورەیان پێدراوە و پێیانوایە پەیوەندیی پتەوی بە کەسێتیەوە هەیە، پێشیانوایە بە زانینی بەهاکانی کەسێك دەتواندرێ ئاشنای کەسێتییەکەی بین و بیناسین.

## چەمکی بەهاکان

* بەهاکان بریتین لەو پێوەرە ویژدانی و هزرییانەی کە تاك باوەڕی پێیان هەیە، هەروەها بەهۆیەوە بە قبوڵکردن و رەتکردنەوە مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا دەکەن.

* سمیس پێیوایە بەها بەهەموو ئەو شتانە دەگوترێت کە شایانی گرنگیپێدانی تاکن لەهەمبەر رەچاوکراوە مادی و مەعنەوی و کۆمەڵایەتی و ئاکاری و ئاینی و ستاتیکییەکانەوە.

* لبیت وەها پێناسەی بەها دەکات بەوەی کە پێوەرێکی حوکمدانە و تاك و کۆمەڵەکان لەنێوان کۆمەڵێك جێگرەوە لەو هەڵوێستانەدا بەکاریدەهێنن کە پێویستیان بە بڕیار و رەفتارێکی دیاریکراو هەیە.

* بەها کۆمەڵێك بنەما و رێورەسمی پێوەریی هەیە و پەیوەندیی بە ناوەڕۆکەکانی واقیعییەوە هەیە کە تاك لەمیانی کارلێککردنی لەگەڵ هەڵوێست و ئەزموونە

جۆراوجۆرەکانەوە وەك مەرجێکی دادەنێ، ئەو مەرجەش دادەنێت کە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پەسندبکرێت.

* بەهاکان ئەو دۆخەی پاڵنەرایەتین کە ئامـاژە بـە پێـوەرە کەسـییە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، یان ئاراستەگرتنێکی سەربەستانە و هەڵبژێردراوانەیە بەرەو ئەزموونێك و پابەندبوونێکی پتەو و ئەو رەتکردنەوەیەش لەخۆدەگرێت کە لە سەرەتای کرداردا کاریگەریی لە سیستمی هەڵبژاردن دەکات.

* بەهاکان بریتین لە چەند رێکخراوەیەکی ئاڵۆزی بنەما و رەوتە ئەقڵیە هەڵچوونییە گشتێندراوەکانی هەمبەر کەس و شت و ماناکان، جا ئەگەر بەباشتردانانەکە لەو خەملاندنە جۆراجۆر و جیاوازانەدا راشکاوانە بێت یانیش شارەوە و ناوەخنی بێت.

ئەم بەباشـتر دانانە لەنێوان پەسندکردنەکانەوە درێـژ دەبێتـەوە و دەڕوات و دەوەستێت و بە رەتکردنەوەش کۆتایی دێت.

* بەهاکان بریتین لە کۆمەڵێك ئەو بنەما و پێوەرانەی کەوا کۆمەڵگەیەك لەژێر تیشکی ئەو ئەزموونانە دایاندەنێت کە بەسەریدا کەڵەکەبوون و لەئەنجامی کردەکانی بژاری کۆمەڵایەتیدا پێکدێت و تاکەکانی کۆمەڵگە بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوانیان لەسەری رێککەوتوون.

* بەهاکان چەند وێناندنێکی دینامیکیی راشکاو و پەنهانن کەوا تاك و کۆمەڵەیەك جیادەکاتەوە و ئەوەیش دیاریی دەکات کە چ شتێك لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پەسندە، هەروەها کاریگەریی لە هەڵبژاردنی رێگە و شێواز و ئامراز و ئامانجە تایبەتەکاندا دەبێت و رووخسار و دیمەنەکانیشی لە ئاراستەی تاکەکان و کۆمەڵەکانی

چەشنەکانی رەفتار و بیروباوەڕ و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانیاندا بەرجەستە دەبێت و پەیوەندیی لەگەڵ پێکهاتەکانی بونیادەکەش دەکات.

* هەروەها (ببر) پێیوایە کە شتێکی باش یان خراپە.

* هەروەها (برى) پێیوایە کە بەها گرنگیدانە، واتا گرنگیدان بەهەر شتێك، ئەگەر هەر شتێك گرنگیی پێبدرێت، بەهای خۆی وەدەستدەهێنێ.

* هەروەها ثورندایك وەها پێناسەی بەها دەکات کە چەند بەباشتر دانانێکن و خۆی لە چێژ و ئازاری مرۆڤدا حەشار داوە.

* هەروەها بارسۆنز وەها پێناسەی بەها دەکات کە رەگەزێکی لە پێکهێنانی هەر یەکە لە سیستمی کەسێتی و بونیادی کۆمەڵایەتیدا هاوبەشە. لەهەمان کاتدا پێیوایە بەها رەگەزێکە لە سیستمی هێماییانەی پەسندکراوی کۆمەڵگە و ئەرکی خۆیشی وەك پێوەر و بنکەی هەڵبژاردنی نێوان شتە دژەکان و ئاراستەکردنی رێکخراو و فەراهەم بووی تاك لە هەڵوێستدا ئەنجام دەدات.

# لێکدانەوەی بەهاکان

**یەکەم: لێکدانەوەی خودیی بۆ بەهاکان:**

**بەناوبانگترینی ئەو زانایانەی کە لە لێکدانەوەی بەهاکاندا لایەنگری ئاراستەی خودین:**

**ئەمیل دۆرکهایم**

ناوبراو بە تێڕوانینێکی خودیانە دەڕوانێتە بەهاکان کە راوبۆچوون رەتدەکاتەوە و پێیوایە کە بەهاکان حوکمێکی دابڕاون لەوکەسەی کە پەیوەندیی بە بابەتەکەوە هەیە، واتا پەیوەندیی بە تایبەتمەندیی ئەو شتە هەیە کە پێی وەسفدەکرێت، بەو مانایەی بەهاکان لە ساتی حوکمداندا بە سیفەتێکی سەربەخۆ و دابڕاو لە چۆنیەتیی هەستپێکردنیدا وەسف دەکرێت. دۆرکهایم پاساوی بۆ ئەم رەتکردنەوەیە بەو باوەڕە هێناوەتەوە کە پێیوایە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان تایبەتمەندیی بابەتیی شتەکان و بەهاکاندا نییە، جەختیشی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە بەهاکان خەملاندنێکن و بەندن بە شتەکانەوە، کەواتە بەها لەلای دۆرکهایمدا لەو پەیوەندیەدا سەرهەڵدەدات کە شتەکان بە دیمەن و روخسارە جۆراوجۆرەکانی نموونە باڵاکان گرێ دەدات و دیمەن و روخسارێکی ئەم نموونەیەش ئاشکرا دەکات. لەلای دۆرکهایم بەهای شتێك تەنها بەهۆی هەندێ هێزی میسالی و نموونەی باڵا و وێناندنی بەکۆمەڵی راستەقینە و پەسندەوە هەڵدەسەنگێندرێ و بەو شتانە دەبەسترێتەوە کە خەڵك دەتوانن درکی پێبکەن و پەیوەندییەکی زۆر پتەویشی بە ژیانی کرداریی خەڵکانەوە هەیە و لە ژیان دابڕاو نییە، بەڕای دۆرکهایم بەبێ سەرهەڵدانی نموونە باڵاکان کۆمەڵگە ناتوانێ پێکبێت و بەردەوام بێت. هەروەها بەهاکانیش جۆراوجۆر دەبن و دەگۆڕێن، چوونکە لە

سروشتی خودی شتەکانی جیهانی دەرەکی سەرهەڵدەدات و بەشێوەیەکی یەکسان و بەرجەستەش کاریگەریی لە کۆمەڵگە ناکات.

دۆرکهایم حوکمی و بنەمایەکانی بەهای دابەش کردووەتە سەر دوو جۆر:

أ- بنەما و حوکمەکانی هەڵسەنگاندن(بابەتی) گوزارشت لە پەیوەندیی نێوان دوو لایەن دەکات و مانای ئەو شتانەیە کە تاک وەک بەهای شتەکان دەیبینێت.

ب- بنەما و حوکمە واقیعییەکان راڤەی شتەکان و بوونەوەرەکان دەکەن و گوزارشت لەو چۆنیەتییە دەکەن کە بەهۆیەوە هەندێ شت و بابەت دەبینین، بەو مانایەی ئێمە حەزمان لە هەندێ شتە و رقمان لە هەندێ شت دەبێتەوە، هەردوو جۆریشیان نموونەی باڵا وەک پێوەرێکی حوکمدان بەکار دەهێنن، بۆ نموونە لە دۆخی یەکەمدا نموونەی باڵا وەک هێمای ئەو شتە بەکاردێت کە وادەکات ئەو شتە پرسێك بێت و ئەقڵ درکی پێبکات، بەڵام دۆخی دووەم ئەو شتە دەبێتە هێما و سومبوڵی نموونەی باڵا لەسەر ئەو شێوەیەی کە وادەکات وێناندنی ئەو شتە ببێتە شتێکی کردەیی بۆ خەڵك.

پوختەی راوبۆچوونی دۆرکهایم لە هەمبەر مانای بەها بریتییە لەوەی کە : بەهای شتێك لە خودی هەمان بابەتدا بەدیار ناکەوێ، بەڵکو ئەو کاریگەری و شوێنەوارانەیە کە بەپێی خەملاندنی خود لێی هەڵدەقوڵێ. ئەمەیش خودێکی تاکەکەسی نییە بەڵکو خودێکی دەستەجەمعییە.

دووەم: لێکدانەوەی بابەتیی بۆ بەهاکان:

ئەمەیش پێیوایە کە بەهای شتەکان لەخودی شتەکەدایە و گوزارشت لە سروشتەکەی دەکات، بەمانایەکی دیکە ئەو کەسانە پێیانوایە بەهای شتەکان بابەتییەو

لە خود و هەستوسۆزی مرۆڤەکان دابڕاوە، هەروەها بەشێوەیەکی دابڕاو لە ئەزموونی ژیانی واقیعی دیاری دەکرێت، لەبەرئەوە بەهاکان جێگیرن و ناگۆڕێن.

ئەفلاتون لە لایەنگرانی بابەتیبوونی بەهاکانە، هەروەها باسی سێ نموونەی باڵای کردووە، راستی و خێر و جوانی، چوونکە ئەمانە بەڕای ناوبراو بەرزترین مانا و باڵاترین بەها و شکۆمەندترین پێگەن و هیچ شتێکیش لەمانە دەرناچێت. بۆیە ئەفلاتون هەق و راستی لە لایەنی مەعریفە و زانست داناوە، خێریشی داوەتە پاڵ ئاکار و رەفتار، جوانیشی خستووەتە پاڵ هونەر و گونجان و هارمۆنی. ئەفلاتوون ئەم هزرە بەرزانە دەگەڕێنێتەوە جیهانێکی دیکە کە ئەم جیهانە واقیعییە نییە، جیهانێکە و فەنا نابێت و شتەکانی نێوی وەك ئەوەی پێویستە کامڵ و تەواو عەیارن، واتا جیهانی ئایدیایی یان جیهانی راستی و هەق و خێر و جوانییە.

**سێیەم: لێکدانەوەی گشتییانەی بەهاکان:**

**بیردۆزی گشتیی بەهاکان (General Theory of Value)**

خاوەنی ئەم بیردۆزە فەیلەسووفی کۆمەڵایەتی رالف بارتۆن پیرییە. ئەم بیردۆزە چەمکی (گرنگیپێدان) وەك تەوەر و پایەی لێکدانەوەی بەهاکان هەڵدەبژێرێت، ناوەڕۆکی ئەم بیردۆزەیش ئەوەیە کە گرنگیدان بە هەر شتێك وادەکات شتەکە بەهادار بێت بەپێی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە:

س بەهادار= کەواتە گرنگیدانێك بە س هەیە.

واتا بەهاکان و نرخەکان لە گرنگیدان و حەزەوە هەڵدەقوڵێن و گرنگیدان و حەز لە بەهاوە هەڵناقوڵێن.

بیردۆزی گرنگیدان جەخت لەسەر گشت بەهایەكی خودی تاك دەكاتەوە و چڕیی دەكاتەوە ، واژەی (بەها) بۆ ئاماژەكردن بەو كردەیە بەكاردەهێنێت كەوا مرۆڤ ئەنجامی دەدات، ئەم كردەیەش بە دەركردنی بڕیار و حوكمێك لەسەر شت و بابەت و هەڵوێستێك كۆتایی دێت. چوونكە بەها لە راستیدا كردەكانی هەڵسەنگاندنە و هەڵسەنگاندیش كردەیەكی كۆمەلآیەتی رۆشنبیرییە.

| بناغە | پۆلینكردن | مانا | نموونە |
|---|---|---|---|
| ئاوەڕۆك | بیردۆز | حەز ومەیلی تاك بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت | فەیلەسووف و زانایان |
| | ئابووری | حەز و گرنگیدانی تاك لەهەمبەر ئەو شتانەی سوودبەخشن، لەرێگەی بەرهەمهێنان و بازاڕ دۆزی ژینگەش بۆ وەدەستهێنانی سامان بەكاردێنیّ. | پیاوانی كار و ئابووری |
| | ستاتیكی | گرنگیدانی تاك بە شتی جوان و هارمۆنیدار و هەماهەنگ | هونەرمەندان |
| | كۆمەلآیەتی | گرنگیدان و یارمەتیدانی خەڵكان | ریفۆرمیستانی كۆمەلآیەتی |
| | رامیاری | گرنگیدانی تاك بە بزاڤ و كاری رامیاری | سەركردەكان |
| | ئاینی | حەز و گرنگیدانی تاك بۆ زانینی ئەودیوی جیهان و زانینی چارەنووس و رەچەڵەكی مرۆڤ. | پیاوانی ئاینی |
| مەبەست | ئامرازی و مەبەستی | بە ئامرازی مەبەستیی دوورتر دادەندرێت لە خودی خۆیدا بە مەبەست دادەنرێت | بەرزبوونەوە حەزی مانەوە |
| توندی | پابەندانە | ئەوەی پێویستە هەبیّ | رێكخستنی پەیوەندیی نێوان دوو رەگەز. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | بەباشتردانان | ئەوەی باشە هەبێت | رێزگرتن لە میوان |
| | میسالیانە | ئەوە دیاری دەکات هیوا بۆ چی دەخوازرێ هەبێت | کارکردن بۆ دونیا وەك ئــەوەی هەتاهەتایــە تیایدا بژیەت. |
| گشتیانە | گشتی | بڵاوبوونــەوە و باوەیەتەکــەی لــە گــشت کۆمەڵگەدا هەیە. | گرنگیـــی ئـــاین، هاوسەرگیری |
| روونی | تایبەت | پەیوەنـــدیی بـــە چـــەند هەڵوێـــستێکی دیـــاریکراوی تایبـــەت یـــان کۆمەڵەیـــەکی تایبەتەوە هەیە | جەژنەکان |
| | دیار | ئـەوەی رادەگەیەنـدرێ بـە قـسە گوزارشـتی لێدەکرێت | راژەی کۆمەڵایەتی |
| | نادیار | لـــە تێبینیکردنـــی حـــەز و ئاراســـتەکان بوونەکەی هەستی پێدەکرێت | رەفتاری سێکسی |
| دەوام | بەردەوام | ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە | دابونەریتەکان |
| | تیژ تێپەڕ | کاتی و تیژتێپەڕ و کورتە و زوو نامێنێت | مۆدە |

# پۆلینکردنی بەهاکان

## گرنگیی بەهاکان

بەهاکان ڕۆڵێکی گرنگیان لە ئاراستەکردنی ڕەفتاری تاکەکەس و کۆمەڵەکاندا هەیە، چوونکە لەهەمبەر ئەو مومارەسە کردارییانەی کە ئەنجامی دەدات بەرەو دەرکردنی حوکم و بڕیاردانیان دەبات، هەروەها بنەمای ساغ و دروستی بونیادی تایبەتمەندانەی پەروەردەییەو بەشداری لە پێکهێنانی قەوارە و بوونی دەروونیی تاکدا دەکات چوونکە:

١. هەستی مەبەستداری بە تاک دەبەخشێت لەهەمبەر گشت ئەو شتانەی ئەنجامی دەدات و لە گەیشتن بەو مەبەستە یارمەتیدەری ئاراستەکردنی دەبێت.

٢. هەروەها زەمینە و بناغەی یەکگرتوویی کاری تاکەکەسی و بەکۆمەڵ فەراهەم دەکات.

٣. وەك بنەمایەك بۆ حوکمدان لەسەر ڕەفتاری خەڵکانی دیکە وەردەگیرێت.

٤. توانای ئەوە بە تاك دەبەخشێت کە بزانێ چاوەڕوانیی چی لە خەڵکانی دیکە هەیە و کاردانەوەکانیان چییە.

٥. توانای هەستکردن بە هەڵە و ڕاستی بەتاك دەبەخشێت.

٦. یارمەتیدەری تاك دەبێت بۆ بەرگەگرتنی بەرپرسیاریەتی لەهەمبەر ژیانی خۆی بۆ ئەوەی بتوانێ لە بوونی کەسیانەی خۆی تێبگات و لەو پرسانەی ژیان ورد بێتەوە کە بەلایەوە گرنگە و دەبێتە هۆی هەستکردن بە ڕەزامەندی.

# تایبەتمەندییەکانی چەمکی بەها

١. بە مۆرکێکی کۆمەڵایەتی مۆر دەکرێت: لە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی سەرگەی خۆی وەردەگرێت.

٢. بە خودیبوون دەناسرێتەوە:گشت کەسێك لە ئێمە بەشێوەی تایبەتی خۆی هەست بە بەهاکان دەکات.

٣. بە رێژەییبون دەناسرێتەوە: لەرووی کات و شوێنەوە بە رێژەییبوون دەناسرێتەوە، چوونکە ئەوەی لەم شوێنەدا گونجاوە رەنگە بۆ شوێنێکی دیکە نەگونجاو بێت.

٤. هەروەها بە قووچەکی دەناسرێتەوە: لەلای گشت کەسێك ریزبەندییەکی پلەبەپلە هەیە لە گرنگیداندا.

٥. بەوە دەناسرێتەوە کە توانای گۆڕانی هەیە: توانای گۆڕانی هەیە بە گۆڕانی هەلومەرجەکانی کۆمەڵایەتی.

٦. بە بەگشتیبوون دەناسرێتەوە: مۆرکێکی گشتیی نەتەوەیی و هاوبەش لەنێوان گشت چینەکاندا پێکدێنێت.

٧. بەهاکان جۆرێك راوبۆچوون و حوکمدان لەسەر کەس و شت و مانا دیاریکراوەکان دەردەکات.

٨. میسالیانەیە.

٩. بەهاکان ئەزموونن، چوونکە بوونیان تەنها بە کەسەکە بەندە و بۆ کەسەکە دەبێت.

١٠. بەهاکان دوو جەمسەرن: چوونکە یان ئەم بوونەن یانیش ئەو بوونە، هەق یان ناهەقن، باشن یان خراپن.

# ئاراستە و بەهاکان و پەیوەندیی نێوانیان

ئاراستە و بەهاکان دۆخی وەرگیراون (پاڵنەری وەرگیراون)، هەرچەندە دەتواندرێ وەها لە ئاراستە و بەهاکان بڕواندرێ کە دۆخێکن لە دۆخەکانی پاڵنەری و تایبەتمەندیی دیاریکردنی پێشبینیکراو و پەسندکراوەکانن، بەڵام وەك باوە توێژینەوە بۆ هەریەکێکیان وەها ئەنجام دەدرێت کە هەردووکیان جیاوازین، ڕەنگە گرنگترین جیاوازییەکانی نێوانیشیان ئەمانەی خوارەوە بێت:

١. تاکەکان هێندەیان ئاراستە هەیە کە زۆر لە بەهاکانیان زۆرترە.

٢.بەهاکان لە رووی پەیوەندییان بە رۆشنبیرییەوە لە ئاراستەکان جیاوازن، چوونکە رۆشنبیری بەزۆری بەهای دیاریکراوی هەیە و ناگوترێ ئاراستەی دەروونی هەیە.

٣. لەبەرئەوەی ئاراستەکان لەسەر شێوەی یەکە و بەشی پارچەپارچە کۆدەبنەوە، ئەوا بەهاکان ئەو ناوکەن کە ئاراستەکان بۆ ئاراستەکردنی رەفتار بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەدەوریدا کۆدەبنەوە، ئەمەیش بۆ گەیشتنە بەو ئامانجەی کە هێزی کێشکردنی هەیە.

٤. ئاراستەکان پتر دەکەونە بەر ئەگەری گۆڕانەوە، بەڵام بەها سەرەکییەکان پتر پایەدارتر و سەقامگیرتر و بەردەوامترن.

٥. هەرچەندە رەگەزی هاوبەش لەنێوان ئاراستەکان و بەهاکاندا هەیە، بەڵام پێویست نییە گونجانیان لەنێواندا هەبێت، بۆنموونە ئەو ئاراستەیەی کە تاك پێی وابەستە و پابەند دەبێت رەنگە چەند بەهایەکی لەلا دروست بکات تەواو لەو بەهایە جیاواز بێت کە لە کەسێکی دیکەدا دروستیدەکات، چوونکە رەنگە کەسێك وەك پابەندبوونێکی کۆمەڵایەتیانە باوەڕی بە زەرورەتی یارمەتیدانی هەژاران هەبێت، بەڵام رەنگە کەسێکی دیکە لەپێناو ئەوەی هەست بە بەرزی و سەرکردەیی بکات باوەڕی بە زەرورەتی یارمەتیدانیان هەبێت.

٧. ئەگەر هەر کۆمەڵە ئاراستەیەك لەهەمبەر بەها یان چەند بەهایەك کۆبوونەوە کە بە ناوك دابنرێن و بچنە ئەو دۆخەی کە پێی دەگوترێت گونجان و وێکچوونی بەهاکان، ئەوا تاك چەند بەهایەکی هەیە کە بە گونجاوترین و وێکچووترین بەها دادەندرێن و رەنگە لەگەڵ یەکتریشدا دژبن، بۆنموونە: ئەو دۆخەی رێککەوتووەکان و خوێندەوارانی ولآتانی تازە پێگەیشتوو پێیدا گوزەر دەکەن وەك بیروباوەڕێکی سیاسی بانگەشەی دیموکراسی و یەکسانی دەکەن و لەرێگەی هەڵبژاردنەکانەوە داوای نوێنەرایەتی سیاسی دەکەن و دەچنە نێو هەڵبژاردنەکان و سەرکەوتن وەدەستدەهێنن لەرێگەی دەستوور و یاساکانەوە پابەندی کاری سیاسی دەبن، بەلآم بەشێوەیەك رەفتار لەگەڵ ژن و کچەکانیاندا دەکەن کە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ رەفتاری باوك و باپیرانیاندا نییە.

چەندان نموونە هەن ئاماژە بەو نموونانە دەکەن و گوزارشتێکی روونن لەسەر هەبوونی دژایەتی و فریسی (نفاق)ی تاکەکەس لەنێوان ئەو شتانەی کە وەك ئاراستەیەك گوزارشتیان لێدەکات و رەفتارەکانی لە هەڵوێستە کردارییەکان و جیاوازیی ئاراستەکانی لە هەڵوێستێك بۆ هەڵوێستێکی دیکەدا.

٨. پێوانی بەهاکان بەزۆری لەسەر ژمارەیەکی دیاریکراوی ئەو بەهایانەدا بونیاد دەندرێن کە رەنگە وەك ناوکێك بن و ئاراستە جۆراوجۆرەکان لە دەوریدا بخولێنەوە، ئەم بەهایانەش ئەمانەن:

* بەهای تێوری: خاوەنەکەی بەلایەوە گرنگە بەهۆی ئەزموون و رەخنەگرتن و ئەقڵەوە بەدوای راستیدا بگەڕێت، ئەمانەیش بەزۆری بیرمەند و فەیلەسووفەکانن.

⋆ بەهای ئابووری(کرداری): گرنگیدانەکە بەرژەوەندخوازانەیە(بەرهەم، بازاڕدۆزی، بەکاربردن) ئەمانە پیاوانی کار دەگرێتەوە.

⋆ بەهاکانی ستاتیکی: تیایدا گرنگی بەشێوە و گونجان و هارمۆنیا دەدرێت، ئەمەیش هونەرمەندەکان دەگرێتەوە.

★ بەهاکانی سیاسی: (دەسەڵات): گرنگیی بە کاری سیاسی و چارەسەرکردنی گرفتەکانی جەماوەر دەدات. ئەمە پیاوانی سیاسی دەگرێتەوە.

★ بەهاکانی ئاینی:گرنگیدانەکەی لەسەر زانینی رەچەڵەك و ئەسڵ و فەسڵ و چارەنووسی مرۆڤدا چڕبووەتەوە و باوەڕی وایە هێزێك هەیە و کۆنترۆڵی جیهانی کردووە. هەروەها پابەندبوونە بە رێوڕەسمەکانی ئاینی(پیاوانی ئاینی).

## وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئاراستە و بەهاکان

ئاراستە و بەهاکان بەم رێگەیانەی خوارەوە وەدەستدەهێندرێن و وەردەگیرێن:

–بە کەوتنە بەر بابەتی ئاراستەکە.

– بە کارلێککردن لەگەڵ ئەو کەسانەی پابەندی ئاراستەکەن.

– یان بەهۆی بوونی ئامادەیی پتەو و قووڵ لە کەسێتیی تاکدا، ئەمەیش بەهۆی ئەو بەهایانەوە دەبێت کە لەرێگەی پەروەردەکردنی خانەوادەییەوە وەدەستهاتووە.

بۆ روونکردنەوەی چۆنیەتیی وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئاراستە و بەهاکان (لەو کاتەی تاك دەکەوێتە بەر بابەتی ئاراستەکە)، دەتوانین هەندێ ئاراستەی نەرێیی خۆمان لەهەمبەر هەندێ کەس و بابەت وەها لێکبدەینەوە بەوەی کە بە ئەزموونی ناخۆش و خراپەوە بە ئێمەوە وابەستەن و لەم سۆنگەیەوە پەیوەندییان لەگەڵماندا کردووە، چوونکە رەنگە بەپێی ئەزموونی کرداریمان لەگەڵ کەسەکانەوە هەندێ کەسمان خۆشبوێت و رقمان لەهەندێ کەسیش بێتەوە. هەروەها وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئاراستە و بەهاکان لەکاتی کارلێککردن لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا بەدیاردەکەوێت کە پابەندی ئاراستەکەن، ئەمەیش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆربەی ئەو ئاراستە و بەهایانەی کە لە ئەنجامی کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتیدا وەرمانگرتوون،

چوونکە خانەوادە بەرپرسی ئامادەکردنی منداڵە بۆ ژیان لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژیەت و وێنەیەکی بچووککراوەی کۆمەڵگەیەکی گەورەترە. هەروەها بۆماوەیش رۆڵێکی لە وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئاراستە و بەهاکاندا هەیە، چوونکە زۆربەی جار وەها روودەدات کە تێکڕای چالاکیی منداڵێك بەهۆی چالاکیی رژێنەکانیەوە زۆر بەرز بێت، بۆیە ئەو منداڵە چالاکە بەپێی چالاکییەکەی خۆی ناچار دەبێت رووبەڕووی ئەو تەگەرانە ببێتەوە کە ژینگەکەی بەسەریدا سەپاندووە، ئەمەیش پێچەوانەی ئەو منداڵەیە کە مۆرکی خاوی و چەچەبڤەیی بە بەسەریدا زاڵە، ئەمەیش کاریگەریی لە پێکهاتنی کەسێتیی هەردووکیاندا دەکات.

هەروەها منداڵ هەیە پێکهاتە جەستەییەکەی باشە و هەندێکی دیکەشیان لاوازن،لەبەرئەوە پێکهاتەی جەستەیی هەریەکێکیان کاریگەریی لە جۆری ئەو کارلێکە دەکات کە لەنێوان خۆی و دەوروبەرەکەیدا دێتەدی. هەر ئەوەندەش بەس نییە کە تاك بکەوێتە بەر ئاراستە و بەهاکانەوە بۆئەوەی وەریانبگرێت و وەدەستیان بهێنێت، چوونکە هەردەبێ پاڵنەرێك هەبێت و کردەی وەرگرتنەکە ئاسانبکات، لەو هۆکارە رێخۆشکەرانەش چوونە نێو دەوری کەسێتیی باوکە بەهۆی کارلێکەوە، هەروەها هۆکارێکی دیکەش هەیە کەوا کاریگەریی لەسەر ئەم مەسەلەیەدا هەیە ئەویش پێکهاتەی خانەوادەیە، چوونکە منداڵی یەکەمی خانەوادە کەسێتییەکی هەیە کە لە کەسێتیی منداڵی ناوەنجی و پاشەبەرەدا جیاوازە، گرنگترین هۆکاریش دەسەڵاتی باوکان و پێکهاتە و بونیادی خانەوادە و چۆنیەتیی پێڕەوکردنی ئەو دەسەڵاتەیە لەلایەن دایبابەوە. جا ئەگەر دایباب لە دەسەڵاتەکەیاندا داپڵۆسێنەر و ستەمکار بوون، ئەوا دەبێتە هۆی پێکهێنانی ئاراستەیەك لەهەمبەر جیهانێکدا کە تەوەرەکەی رقوکینەو داپڵۆسین و دیکتاتۆریەتە.

## بنەماکانی فێربوون و وەرگرتنی بەها و ئاراستەکان.

١. مادام ئاراستە و بەهاکان فێری تاك دەکرێن و وەدەستدێن، ئەوا چەندان بنەمای فێربوون لە وەرگرتن و فێربوونیدا پیادە دەبێت، لە جۆرەکانی فێربوون و زانیاریشدا فێربوونی کلاسیکیانەی مەرجی و فێربوونی مەرجیی ئامرازییە بە گشت شتەکانی وەك بەیەکتربەستنەوە و وروژێنەرەکان و کاردانەوە و پتەوکردن (سزا و پاداشت) و پاڵپشتیکردن و گشتاندنی وروژێنەرەکانی وێکچوو، بەم شێوەیە دایك پێداویستییەکانی منداڵ وەدیدەهێنێت و رەمەکەکانی تێردەکات و ئەگەر برسیبوو خۆراکی پێدەدات. بۆیە دایك لەلای منداڵ بە کردەکانی تێرکردن دەبەسترێتەوە، لەوکاتەش کە منداڵەکە برسی نییە دایك دەبێتە وروژێنەرێك و حەسانەوە و دڵنیایی پێدەبەخشێت، بۆیە پاڵنەرێك لە دەروونی منداڵەکە لەهەمبەر دایکی پێکدێت، ئەمەیش ئەو ناوکەیە کە پێویستیی بۆ خۆشەویستی و پەسندبوونی کۆمەڵایەتی لێ سەوز دەبێت و دواتریش دەبێتە هۆی وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئاراستە و بەهاکان. منداڵ بۆ رازیکردنی دایکی رێگەی فێربوون و پاکوخاوێنی دەگرێتەبەر، بۆیە کاتێ دەچێتە نێو کۆمەڵگەوە، خانەوادە چەندان تۆوی بەها و ئاراستەی لە دەروونی منداڵدا چاندووە، ئەم کردەیەش جگە لەوەی کردەی فێربوونە کردەی ئاڵوێرکردنی کۆمەڵایەتیشە، چوونکە دایبابان وەك منداڵان دانوستانیان دەبێت واتا وەردەگرن و دەبەخشن و هەر یەکێکیشیان (لە رێگەی پاداشتەوە) رەفتاری ئەوی دیکە پتەو دەکات.

٢. منداڵ لە رێگەی لاساییکردنەوەوە فێری ئاراستە و بەهاکان دەبێت، فێربوونەکەش بەبێ بوونی پاداشت و پاڵپشتیکردنی رەفتاریی بەشێوەیەکی زەق و بەبێ مەبەستی فێربوون دێتەدی، چوونکە زۆربەی جار دەبینین منداڵانمان زۆربەی ئەو

ڕەفتار و قسانە لە ئێمە فێربوون کە هیوامان دەخواست لێمان فێرنەبوویان، بەڵام بەبێ مەبەست و ویستی ئێمە و بەبێ ئاگایی خۆیانەوە فێربوون، هەروەها منداڵان لە هاوڕێیانی فێرگەدا بە ڕێگەیەکی سەرپێیی فێری واژە و ڕەفتار دەبن.

٣. هەروەها لەو هۆکارانەی لەگەڵ نەبوونی کردەی پاداشتکردنیشدا دەبنە هۆی وەدەستهێنان و وەرگرتنی ئەو بەها و ئاراستانەی کە لاساییکردنەوەی پێ لێکدەدرێتەوە، چوونە نێو ڕۆڵی کەسێتییەکی نموونەیی و وەرگرتنی پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانیەتی، بەم هۆیەوە دەزانی چ شتێ هەڵەیە و چ شتێکیش ڕاستە، هەروەها هەر لەم پێودانگەشەوە ویژدان پێکدێت، چوونکە پەیوەندییە سۆزییەکان بەو کەسەی منداڵ دەچێتە نێو دەورییەوە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەیە کە فێربوونی بەهاکانی ئاکاری سەرچاوەی لێوە دەگرن. ئەوەی زۆربەی زانایانی دەروونیش لەسەری کۆکن ئەوەیە کە ڕەهەندەکانی کردەی چوونە نێودەور بەشێوەیەکە منداڵ ڕێچکەی ئەو نموونەیە دەگرێتە بەر کە چووەتە نێو ڕۆڵەکەی و لاسایی گشت ڕەفتار و پاڵنەر و ئاراستە و بیرۆکەکانی دەکاتەوە.

## جیاکردنەوەی نێوان بەها و ئاراستەکان

دەتوانین دەستنیشانی سروشتی تێکچڕژانی نێوان بەها و ئاراستەکان بەم خاڵانەی خوارەوە دیاریی بکەین:

- هەردووکیان ئاراستەکاری ڕەفتارن.
- هەردووکیان چەمکی وەرگیراون.
- دەکرێ هەردووکیان هەموار بکرێن و بپێورێن.
- هەردووکیان لە سێ ڕەهەندی مەعریفی و ویژدانی و ڕەفتاری پێکدێن.

– هەردووکیان لە پێکهێنانی بیروباوەڕەکاندا بەشدارن.

بەڵام جیاوازییەکانی نێوانیان ئەمانەن:

- بەها لە ئاراستە بەردەوامتر و پایەدارتر و جێگیرترە.

– بەها بە بناغەی ئاراستە دادەندرێت.

– بەها لە ئاراستە زۆر داخراوترە.

– بەها لە ئاراستەکان پتر ڕەفتار ئاراستە دەکات.

– زۆربەی جار بەهاکان مۆرکێکی کۆمەڵایەتیان هەیە ئەم مۆرکەشیان لە ئاراستە زۆرترە.

# ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی

کۆمەڵگـە سیـستمێکی ئاوێتەیـە و لـە کۆمـەڵێك یاسـا و سیـستم پێکهـاتووە، یـەك سیستمیش لە کۆمەڵێك ڕەگەز (کەسـەکان) پێکهـاتووە و پەیوەندییـەکی کۆمەڵایـەتیی دیاریکراو بەیەکیان دەبەستێتەوە، بەو کارلێکە کۆمەڵایەتییانەش کاریگـەر دەبێـت کـە لە هەڵوێستە جۆراوجۆرەکـانی کۆمەڵایەتیـدا لەنێوانیانـدا بەڕێوەدەچـێت و لەنێوەنـدی کۆمەڵایەتیـدا کـۆی ڕەفتارەکـانی تـاك و دەوەرەکـەی یـان کۆمـەڵێك لـەو دەورانـەی پێکدەهێنێت کە لە خەڵکانی دیکەی جیا دەکاتەوە.

## چەمکی ڕۆڵ

*سینفۆرد وەها پێناسەی ڕۆڵ دەکات بەوەی کە وێناندنی ڕەفتارە و پەیوەندیی بە کەسـێکی دیـاریکراو و سـیفەتە کەسـییەکانییەوە هەیـە، چـوونکە گوزارشـتێکە لـە پێداویستییەکانی کەسێك.

* ڕۆڵ دەرەنجامی هەلومەرجی دەروونی و کۆمەڵایەتییە، واتا بـە ڕەچاوکردنەکەی ئاماژە بەو کردارانە دەکات کە تاکەکان بەشێوەیەك ئـەنجامی دەدەن لەگـەڵ بونیـادی کۆمەڵایەتیدا بگونجێت.

* ڕۆڵ ڕەفتاری تاکـە لـە هەڵوێـستێکی دیـاریکراو کـە پەیوەندییـە دیاریکراوەکـانی کۆمەڵایەتی دیارییان دەکەن.

* ڕۆڵ شێواز و کۆمـەڵێك سـتایلە کـە بەهۆیـەوە تـاك لـە هەڵوێـستێکی دیـاریکراودا بەپێی پێوەرە دانراوەکان ڕەفتارێکی پێویست و چاوەڕوانلێکراو ئەنجام دەدات.

* لیمان وەها پێناسەی رۆڵ دەکات بەوەی کە رێکخستنی ئاراستەکان و ئەو تاکانەیە کە لە سیستمی پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتیدا سەر بە دۆخێکی دیاریکراون.

* کۆتریل وەها پێناسەی رۆڵ دەکات: کۆمەڵێك کاردانەوەی مەرجییە کە لە هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتیدا بەشێوەیەکی ناوەکی لەلای کەسەکەدا بەیەکتری وابەستەن و گوزارشت لە شێوازێکی وروژێنەر دەکات بۆ وروژاندنی کۆمەڵەیەکی یەکسانی کاردانەوە مەرجییە پتەو و یەککگرتووەکانی نێو هەمان هەڵوێست.

چەمکی لینتۆن بۆ رۆڵ: کۆمەڵێك لەو کردارانەیە کەوا کەسێك ئەنجامی دەدات و جەخت لەسەر داگیرکردنی شوێن و پێگەیەك دەکاتەوە. لینتۆن رۆڵی بە پێگە و پێگەشی بە کەسەکان بەستاوەتەوە.

بەڵام سەبارەت بە چەمکی میرتۆن لەهەمبەر رۆڵدا، پێیوایە کە گشت پێگە و مەڵبەندێکی کۆمەڵایەتی چەندان رۆڵ دەکاتە پێویستی نەك تەنها رۆڵێك.

ناوبراو دەستەیەك شێوازی کۆمەڵایەتی دیارییکردووە کە کۆمەڵێك رۆڵ بەشێوەیەکی یەکسان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و بۆ سووککردنەوەی گرژیی و کێشمەکێشی نێوان رۆڵەکان لە کاتی کارکرد و پیادەکاریدا زۆرترین رێژەی سیستم دیاریی دەکات.

١.گرنگیدانی پتر بە رۆڵەکان نەك شتەکانی دیکە.

٢.دابەشکردنی رۆڵەکان لەنێوان ئەو کەسانەی کۆمەڵێك رۆڵیان هەیە.

٣. رەچاوکردنی کۆمەڵێك رۆڵ لەهەمبەر داواکاری و پێداویستییە دژبەیەکەکان.

٤. هاوکاریی ئالۆێرکراو لەنێوان ئەو کەسانەی یەك پێگە و پۆستیان هەیە.

٥. کەمکردنەوەی ئەو رۆڵانەی کە پێگەکە دەیسەپێنێ.

٦. دیاریکردنی ئەو چالاکییەی پەیوەندیی بە رۆڵەکەوە هەیە بۆ ئەوەی لەکێشمەکێش خۆ ببوێرن.

بەڵام پێناسەکەی پارسۆنز پێیوایە رۆڵ: (رەگەزێکی هاوبەشی نێوان بونیادی کۆمەڵایەتی و کەسییە).

## سیستمی رۆڵەکان لەلای پارسۆنز:

پارسۆنز باوەڕی وەهایە دابەشکردنی کار لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا بووەتە هۆی فرەبوون و جیاوازیی رۆڵەکان، هەر کۆمەڵەیەك لەو رۆڵە تایبەتمەندە بەیەکتر بەستراوانەش سیستمێکی دیاریکراوی بونیادی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، بۆنموونە سیستمی خانەوادە بە کۆمەڵێك رۆڵی جیاجیا دەناسرێتەوە: باوك کۆمەڵێك رۆڵ ئەنجام دەدات و دایك و کوڕیش کۆمەڵەیەکی دیکەی رۆڵەکان ئەنجام دەدەن، بەڵام لەگەڵیدا دەبنە تەواوکەر. سیستمی پیشەیش کۆمەڵێك رۆڵی جیاواز دەگرێتە خۆ کە لەنێوان یەکتریدا بۆ وەدیهێنانی مەبەست و ئامانجەکانی سیستمی پیشە یەکتر تەواو دەکەن (پیشەی فێربوون و بازرگانی و پارێزەری)، سیستمی پیشە جۆراوجۆرەکانیش بە گۆڕانی پێداویستی و بەرپرسیاریەتییەکانی پیشەکە دەگۆڕێت.

هەرچەندە تەمەنی کەسێتییەکەش زۆرتربێت ژمارەی ئەو رۆڵانە زیاد دەبن، هەروەها پلەی گونجان لە جێبەجێکردنی رۆڵە جۆراوجۆرەکان بە گەیشتنی کەسێتی بە قۆناغێکی پێشکەوتووانەی پێگەیشتنی دەروونی و جیاکردنەوە و درککردن و یەکبوون لەگەڵ کۆمەڵ و بەها و پێوەرەکانی باو دێتەدی. گشت تاکێك لە تاکە کارلێککەرەکان لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا کۆمەڵێك رۆڵی جیاوازیان هەیە، هەر رۆڵێکیش رۆڵێکی دیکە

تەواو دەکات و کاریگەریی لەگەڵدا ئاڵوێر دەکات، بەڵام هەر هەموویان وەك دەرەنجامێکی بزاڤی هاوبەش (هاوکارانەی تەواوکار بۆ وەدیهێنانی ئامانجی هاوبەشی کۆمەڵایەتی لەسەر رەوتی گونجانن).

رەفتار و ناوەڕۆکی رۆڵ لە کەسێك بۆ کەسێکی دیکە و لە سیستمێك بۆ سیستمێکی دیکە و لە رۆشنبیرییەك بۆ رۆشنبیرییەکی دیکە دەگۆڕێت، واتا لە کۆمەڵگەیەك بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە رۆشنبیرییەکە دەگۆڕێت، پەیوەندیی نێوان (سیستم) و (رۆڵەکانیش) ئەوەیە کە سیستم کۆمەڵێك رۆڵە.

### تایبەتمەندی و شەقڵە جیاکەرەوەکانی رۆڵەکان وەك سیستم:

چەندان تایبەتمەندی و شەقڵی جۆراوجۆر هەن گرنگترینیان:

- جۆراوجۆریی ئەو رۆڵانەی کە سیستم پێکدەهێنن.
- رۆڵەکان جۆراوجۆر و جیاوازن بەڵام وابەستەی یەکترین و یەکتری تەواو دەکەن.
- رۆڵەکان لە سیستمدا تایبەتمەند و پسپۆڕانەن.
- گشت رۆڵێك بەرەو وەدیهێنانی مەبەست و ئامانجی دیاریکراو ئاراستەی خۆیان وەردەگرن.
- رەفتار و ناوەڕۆکی رۆڵ لە کەسێك و کەسێکی دیکە و لە سیستمێك بۆ سیستمێکی دیکە و لە رۆشنبیرییەك بۆ رۆشنبیرییەکی دیکە دەگۆڕێت.

## سروشتی رۆڵی کۆمەڵایەتی:

رۆڵی کۆمەڵایەتی بەوە دەناسرێتەوە کە سروشتێکی پێشبینیکارانەی هەیەو رێگە خۆشدەکات بۆئەوەی لە چوارچێوەی رۆڵەکانی کۆمەڵایەتیدا پێشبینیی جۆر و چەشنەکانی رەفتاری پێشبینیکراو بکرێت، وەك نیگەرانیی کاتی یەکەم رووبەڕووبوونەوە، گرژیی کاتی یەکەم دەستبەکاربوون لە کارێك و دوورکەوتنەوە لە مەترسی و پێکەنین لەکاتی بیستنی نوکتە. ئەم تایبەتمەندییە گرنگترین سیفەتە پێویستەکانی ئاراستەکردنی رەفتارە، چوونکە مرۆڤ پێشبینیی رەفتاری پێشبینیکراو دەکات بۆ ئەوەی بە رەفتارێکی گونجاو رووبەڕووی ببێتەوە.

هەروەها رۆڵ بەوە دەناسرێتەوە کە سروشتێکی پێوەریانە (ناچاریانە)ی هەیە، ئەم تایبەتمەندیەش لەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەدا بەدیاردەکەوێت کە پێشتر مرۆڤ تاقی کردووەتەوە و پێشبینیی جۆراوجۆری لەبارەیانەوە پێکهێناوە و بووەتە شتێکی پێوەری، بۆیە دژبوون لەگەڵ ئەم پێشبینیانە دەبێتە هۆی تووڕەیی و قێزهاتنەوە و ناڕەزایی و سەرسوڕمان، بۆنموونە: نوکتەیەك دەڵێم ...... پێدەکەنێ، باس لە غەمەکانی خۆم دەکەم..... لەگەڵمدا هاوسۆز دەبێت، نهێنییەکی لە لا باس دەکەم ...... دەیپارێزێ، کچ گەمەی کچانە دەکات: وەك دووریـن و کاری ناوماڵ، کوڕیش گەمەی کوڕانە دەکات، ئەگەر مەسەلەکەیش بەم شێوەیە نەبوو، دەبێتە هۆی سەرسوڕمان و نامۆبوون.

لێرەوە دەبینین کە رۆڵی کۆمەڵایەتی بەم شتانەی خوارەوە وەسفدەکرێت و دەناسرێتەوە:

- رۆڵی کۆمەڵایەتی ئاماژە بە پێگەی کۆمەڵایەتی دەکات و پێیوە پابەند دەبێت.

– سروشتی رۆڵ بە جۆری رەفتارە پێشبینیکراوەکە دەبەسترێتەوە.

– رۆڵ سروشتی پێشبینییەکانی هەیە، دژبوون لەگەڵ ئەم پێشبینیانەش دەبێتە هۆی تووڕەبوون و قێزهاتنەوە و ناڕەزایی و سەرسوڕمان.

## ناوەڕۆکی رۆڵ:

پارسۆنز پێیوایە کە رۆڵ بە گۆڕانی ئەو ناواخن و ناوەڕۆکە دەگۆڕێت کە پەیوەندیی بە هەلومەرجی بونیادی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و بۆماوەییەوە هەیە، هەروەها ناوەڕۆکی رۆڵ بە پنتی بەیەکگەیشتنی نێوان کۆی ئەو هەلومەرجانە دادەندرێت و ناوەڕۆکی رۆڵەکەش بەپێی گۆڕان و وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگە دەگۆڕێت و گۆڕانی پێگەی کۆمەڵایەتیش بەپێی جیاوازیی تەمەن و رەگەز و پێگەی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت. هەروەها ئەوەشی روونکردووەتەوە کە رۆڵی دایک (واتا ئەو ئەرك و کردانەی کە رۆڵ پێکدەهێنن) بە ژمارە و تەمەنی منداڵان دەگۆڕێت، کۆی ئەمانەش کاریگەریی لە چۆنیەتیی ئەنجامدانی رۆڵ و ئەرکی دایکانە دەکات، هەروەها ناوەڕۆکی رۆڵی پیشەیی بە گۆڕانی پێگە و شوێنی تاك لە سیستمی پیشەیی دەگۆڕێت، چوونکە پێکهاتەکانی رۆڵی پیشەیی لە ترۆپکی پەیژەی پیشەییدا جیاوازە لە پێکهاتەی یەکەمین پلیکانەکانی ئەم پەیژەیە.

کەواتە رۆڵ بە گۆڕانی ناوەڕۆکەکەی دەگۆڕێت و ناوەڕۆکیش بە گۆڕانی هەلومەرجی دەوروبەرەوە دەگۆڕێت.

مەبەستیش لە هەلومەرجی دەوروبەر، ئەمانەی خوارەوەن:

– گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکانی کۆمەڵایەتی.

- پێگە و شوێنی کۆمەڵایەتیانەی تاك لە سیستمەکەدا.

- پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی تاك.

- تواناکانی تاك.

بەڵام ناوەڕۆك و رەگەزەکانی رۆڵ ئەمانەن:

ا- بەها و پێوەرە باوەکانی کۆمەڵگە.

ب) ئەو پابەندبوونە ئاکاریانەی کە داواکارییەکانی رۆڵەکان و رەفتاری پەیوەست بە هەردووکیان دیاریی دەکات، ئەم پابەندبوونانەش لەچەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆرەوە هەڵدەقوڵێن، لەوانە: ئەو ئایدۆلۆژیا باوانەی کە گوزارشت لە رۆشنبیریی کۆمەڵگە و سروشتی پەیوەندییە باوەکانی نێوان رەگەزەکانی کۆمەڵگە دەکات لەنێو بونیادەکەدا و هەروەها رەگەزەکانی بایۆلۆژیش.

بارسۆنز بەشێوەیەکی دیکە ئەو رەگەزانەی پۆلینکردنەوە کە رۆڵ پێکدەهێنن، ئەوەیشی بەدیارخستووە کە رۆڵەکان لە چوار رەگەزی سەرەکی پێکدێت ئەوانیش:

ا) رەگەزەکانی ئەقڵی (مەعریفی): گوزارشت لە پێوەرەکانی ئایدۆلۆژی دەکات و ئەقڵ بەسەر سۆزدا زاڵدەکات.

ب) رەگەزەکانی ویژدانی (سۆزی) گوزارشت لە رەگەزەکانی دەروونی دەکات و هاندەر و پاڵنەر بە مرۆڤ دەبەخشێت.

ج) رەگەزەکانی ئاکاری (هەڵسەنگاندن و راستکردنەوە) تێبینیی پەیوەندییەکان و هاوسەنگیی نێو سیستمی کۆمەڵایەتی دەکەین.

## گێڕانی رۆڵ:

مەبەست لە گێڕانی رۆڵ: ئەنجامدانی رەفتار و ئەو چالاکییە دیاریکراوەیە کە چاوەڕوان دەکرێت تاك لە هەڵوێستێکدا ئەنجامی بدات.

(بۆرت) پێیوایە کە کارکرد " اداء" کردارێکی دەروونیی(کەسییە) دواتریش بە گۆڕانی توانا و تایبەتمەندییە کەسییەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت ، بەڵام (کۆبر و یوە) کە ئاراستەی کۆمەڵایەتی لە لێکدانەوەی کارکرد بەکاردێنن، پێیانوایە کە گێڕانی رۆڵ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و ئەمە بە پێگە دەبەستنەوە، چوونکە گێڕانی رۆڵ واتا رەفتاری کرداریی تاك لەهەمبەر ئەو پێگە و پۆستەی هەیەتی.

هەروەها بارسۆنز گێڕانی رۆڵی لە چوارچێوەی هەڵوێستی کۆمەڵایەتیدا بەدیارخستووە بەوەی کە وەڵامدانەوە و کاردانەوەیە بۆ پێشبینییەکانی خەڵکانی دیکە و وەدیهێنانی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی، بەڵام جیاوازیی لە کارکرد دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی لە فێربووندا.

بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین کە گێڕانی رۆڵەکان تەنها داواکارییە بونیادەییەکانی کۆمەڵایەتی حوکمی بەسەردا ناکات، بەڵکو بەو سیفەتە دەروونییە کەسییانە کاریگەر دەبێت کە پاڵ بە تاکەوە دەنێن رووبکەنە رۆڵێك و لە رۆڵی دیکە بەباشتری دابنێن. هەروەها ئەم سیفەت و تایبەتمەندی و شەقڵە کەسی و دەروونیانە کار لە چۆنیەتی کارکردەکە دەکەن(جیاوازییەکانی تاکەکەسی).

جیاوازیی لە کارکرد تەنانەت لە چوارچێوەی یەك ڕۆڵ یان ڕۆڵە وێکچووەکان دیاردەیەکی ئاسایی و دروستی کۆمەڵایەتییە.

* گێڕانی ڕۆڵ بە رای ئەلبۆرت پەیوەندیی بەکەسەوە هەیە لە ڕووی توانا و تایبەتمەندییە کەسییەکانی، بەڵام گێڕانی ڕۆڵ بەڕای کۆبر و یوە پەیوەندیی بە پێگەی کۆمەڵایەتیەوە هەیە. بارسۆز گێڕان و ئەنجامدانی ڕۆڵ بە پێشبینی و چاوەڕوانییەکانی خەڵکانی دیکە دەبەستێتەوە.

* ئەلبۆرت جیاوازیی خەڵك بۆ گێڕانی ڕۆڵ بە توانای تاك و تایبەتمەندییە کەسییەکانیان دەبەستێتەوە. بەڵام کۆبر و یوە جیاوازیی خەڵك لە گێڕانی ڕۆڵ بە جیاوازیی پێگە دەبەستنەوە. بەڵام بارسۆنز جیاوازییەکە بە جیاوازیی لە فێربووندا دەبەستێتەوە.

## گرنگیی گێڕانی ڕۆڵەکان

- گێڕانی ڕۆڵ بەشێوەیەکی گونجاو گەورەترین کاریگەری بەسەر بەردەوامی وەزیفیانەی سیستمی کۆمەڵایەتیدا هەیە.

نیوکمب گرنگیی بە باسکردنی پەیوەندیی نێوان پاڵنەری رەفتاری ڕۆڵ و خودی ڕۆڵەکە داوە، بەو واتایەی ڕۆڵت لە کۆمەڵەدا کۆمەڵێك ئەرکت دەخاتە سەرشان، چەندان مافیشت بۆ دەستەبەر دەکات. ئەم ئەرك و مافانەیش لەژێر سایەی پێوەر و ڕۆشنبیریی تاکەکانی کۆمەڵەدا دیاریی دەکرێت.

بارسۆنز پێیوایە پێشبییەکانی ڕۆڵەکان پەیوەندیی بە سیستمی کۆمەڵایەتییەوە هەیە و لەگەڵ ڕێنمایی و ڕێوشوێنەکانی بەهای کۆمەڵەدا تەواو دەبێت و تاکەکەسیش

لەگەڵیدا دەتوێتەوە و ئاوێتەی دەبێت، واتا بەشێوەیەکی دەروونی پێیەوە گرێ دەدرێت(لەڕووی بۆچوونی کەسی) و کۆمەڵایەتییەوە(لەرووی بۆچوونی پێوەرە باوەکانی کۆمەڵایەتیەوە): کەواتە پێشبینییەکان بەم واتایە دەبنە بەشێك لە سیستمی کەسی، لەهەمان کاتیشدا بەشێکی رۆشنبیریی گشتیی باو لە بونیادی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێ. هەروەها رۆڵێکی سەرەکیش لە کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا دەگێڕێت.

## رەفتاری رۆڵ:

- رەفتاری رۆڵ واتا رەفتاری تاك لە چوارچێوەی ئەو رۆڵەی بۆی دیاریکراوە و لە چوارچێوەی گروپێکی دیاریکراو و چەشنە رۆڵێکدا چاوەڕوانیی لێدەکرێت، رەنگە ئەم رەفتارەش لەگەڵ رۆڵەکەدا بگونجێت یانیش نەگونجێت، واتا رەنگە رەفتاری رۆڵەکە لەگەڵ رۆڵەکە بگونجێت یانیش نەگونجێت، وەك ئەوەی مامۆستا وانەکە بەشێوەیەکی باش یان خراپ راڤە بکات، یانیش لە پۆلدا جگەرە بکێشێت یان نەکێشێت، چوونکە راڤەکە لەگەڵ رۆڵی مامۆستادا دەگونجێت بەڵام جگەرەکێشانەکە وەها نییە. نیوکمب رۆڵ و رەفتار لەیەکتری جیا دەکاتەوە و دەڵێت: رۆڵ چەمکێکی کۆمەڵایەتییە و لە گشت ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەی پێگەیەکی دیاریکراو داگیر دەکەن، ئاماژە بە چەشنە کارێکی پێشبینیکراو دەکات، بەبێ ئەوەی رەچاوکردنی کەسێتیان، بەڵام نیوکمب وەها وەسفی رەفتاری رۆڵ دەکات بەوەی ئەو کردارانەن کە تاك لەکاتی گێڕانی رۆڵدا ئەنجامی دەدات. رەفتاری رۆڵیش ئەو رێگەیەیە کە تاك بەپێی درککاریی خۆی لەهەمبەریدا بەشێوەیەکی ناوەکی رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان دەنوێنێ کە لەگەڵ پێشبینییەکانی خەڵکانی دیکەی نێو کۆمەڵە و کۆمەڵگەکەیدا دەگونجێت.

* ڕەفتاری تاك لەیەك كاتدا گشتی و تایبەتە، چوونكە ژیانی تایبەتمان بە ژیانی گشتیمان كاریگەردەبێت و ژیانی گشتیشمان بەبەردەوامی بەژیانی تایبەتمان كاریگەر دەبێت.

* ڕەفتاری دیاریكراو لە چوارچێوەی پێوەرەكانی كۆمەڵایەتیدا دیاریكەری ڕۆڵی كۆمەڵایەتییە ئەو كەسەش تا ئاستێكی زۆر پابەند دەكات كە ئەم ڕۆڵە دەبینێت.

* نابێ ڕەفتاری ئەو ڕۆڵە جۆراوجۆرانەی كەوا تاك ئەنجامیان دەدات دژبەیەك بن، چوونكە ئەمە دەبێتە هۆی داڕووخانی كەسێتییەكەی.

* كۆمەڵ ڕەفتاری ئەو ڕۆڵە دیاریی دەكات كەوا خەڵكانی دیكە لەهەر تاكێكی داوا دەكەن كاتێ ئەم ڕۆڵانە ئەنجام دەدەن، ئەو تاكەی كە لە ڕۆڵێكەوە دەچێتە سەر ڕۆڵێكی دیكەوە لەسەری پێویستە ڕەفتاری ڕۆڵە نوێیەكە فێرببێت" وەك ئەو فێرخوازەی خوێندنی تەواوكردووە و دەبێتە مامۆستا.

* ڕەفتاری (فعلی) ڕۆڵ جیاوازیەكی كەمی لەنێوان ئەو دووكەسدا هەیە كە هەمان ڕۆڵ دەگێڕن، بەڵام جیاوازیی پێكهاتەی ئەقڵی هەردووكیان یان ئەو بوارە ووروژێنەرە كۆمەڵایەتیانەی دەیگرنەبەر جیاوازە و هەروەها بۆ یەك كەسی دیاریكراویش لە كاتێك بۆ كاتێكی دیكە دەگۆڕێت و جیاوازە.

* ڕۆڵی كۆمەڵایەتی ئەو ڕەفتاری تاك دیاریی دەكات كە خەڵكانی دیكە چاوەڕوانن ئەنجامی بدات، هەروەها ئەو ڕەفتارەی خەڵكانی دیكەش دیاریی دەكات كەوا تاكەكە لەكاتی ئەنجامدانی ڕۆڵەكەیدا چاوەڕوانیی لێیان هەیە " فێرخوازان چاوەڕوانیی چیان لە مامۆستا هەیە و مامۆستاش چاوەڕوانیی چی لە فێرخوازان هەیە".

نیوکمب ئاماژەی بە کۆمەڵێك هۆکار داوە کە یارمەتیدەری یەکیەتیی گێڕانـی ڕۆڵـن، ئەوانیش:

ا) تایبەتمەندی و شەقڵە زگماکییە بایۆلۆژییەکانی تاك.

ب) ئەو هەلومەرجە تایبەتمەندانەی کە تاك تیایاندا فێری گێڕانی ڕۆڵ دەبێت.

ج) یەکبوونی درککردنی خود.

د) ئەو کۆمەڵەیەی تایبەتمەندیی دەبەخشێتە ئاراستەکانی خەڵك.

نیوکمب ئەو هۆکارە کاریگەرانە لە گێڕانی ڕۆڵ پۆلیندەکاتە سەر ئەو هۆکارانەی کـە پەیوەندییان بە کەسێتیی تاکەوە هەیە، هەروەها ئەو هۆکارانەش کە پەیوەنـدییان بـە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییـەوە هەیـە، چـوونکە هۆکارەکـانی أ و ب و ج پەیوەنـدییان بـە کەسێتییەوە هەیـە و (د) پەیوەنـدیی بـە ڕێکخـستنی کۆمەڵایەتییـەوە هەیـە. نیوکمـب پاڵنەرەکانی گێڕانی ڕۆڵی بە کەسێتی بەستاوەتەوە.

## دیاریکەرەکانی ڕۆڵەکان:

أ) درککردنـی هاوبـەش بـەو پێگـە و شـوێنەی کـە تـاك لـە بونیـادی کۆمەڵایەتیـدا داگیریدەکات: ئەمـەیش واتـای ئـەوە دەگەیـەنێ کـە درککردنـی تاکـەکانی کۆمەڵەیـەك بـەوەی کـە بـەهێزەکان پێگـەکانی دەسـەڵات داگـیر دەکـەن و بیروبۆچـوونیان لـە دیـاریکردنی کەسـانی بێدەسـەڵات و سـەرکردە و شـوێنکەوتووان لـەنێو تاکـەکانی کۆمەڵگەدا یەکدەگرێتەوە و کۆك دەبێت.

ب) ئەو پێشبینیانەی تاکەکانی کۆمەڵە لەهەمبەر ڕەفتاری ئەو کەسـانە هەیانـە کـە پێگـەی دیـاریکراو لـە بونیـاد و سیـستمی کۆمەڵایەتیـدا داگیر دەکـەن، چـوونکە ئـەو

کەسەی پێگەیەکی بەرز و بەهێز داگیردەکات، زۆر بەئاسانی و کاراییەوە کار لە خەڵکانی دیکە دەکات، سەرکردەش پێشنیاری بونیادنەر و سوودبەخش پێشکەش دەکات و شوێنکەوتووش خۆی لە پێشکەشکردنی پێشنیار بەدوور دەگرێت و لەسەری پێویستە لەهەمبەر بیروبۆچوونەکانی سەرکردەدا رەزامەندی پیشان بدات.

ج) پێوەر و بەهاکانی کۆمەڵایەتی: بریتین لەچەند پێشبینییەکی هاوبەش کە گشت تاکەکانی یەك سیستمی کۆمەڵایەتی تیایدا هاوبەشن، ئەم پێشبینیانەش جۆرەکانی رەفتاری گونجاو دیاریی دەکات کە لەهەمبەر هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتیدا پەسندن و لەهەمبەر گشت کەسێکیش شتێکی ناچارانەیە و دەبێ پێوەی پابەند بن و دەتوانین بە ئەرك و مافەکانی رۆڵ ناوی ببەین.

## جیاوازیی رۆڵەکانی کۆمەڵایەتی

رۆڵەکانی کۆمەڵایەتی لەژێر تیشکی ئەم پێوەرانەی خوارەوەدا جیاواز دەبن:

* ناچاری و هەڵبژاردن (الجبر والاختیار): هەندێکیان بەسەر تاکدا سەپاون هەندێکیشیان شتی خۆویستانەن و تاك خۆی دەتوانێ هەڵیانبژێرێت، بۆنموونە رۆڵی تەمەن (منداڵ و پێگەیشتوو) مرۆڤ هیچ بژاردێکی تیادا نییە، بەڵام رۆڵ لە کاردا (ئەندازیار، پارێزەر، مامۆستا، پزیشك و هتد) تاك خۆی هەڵیاندەبژێرێت.

* سەرتاپاگیری: رۆڵەکان لە سەرتاپاگیریی خۆیاندا جیاوازن، رەنگە گەنجێك لە کۆمەڵەیەکدا سەرکردە بێت و لە کۆمەڵەیەکی دیکە شوێنکەوتوو بێت.

* دیاریکردنی رەفتار: بۆنموونە رۆڵەکانی سەربازی بەشێوەیەکی زۆر چەقبەستوو دیاریی کراون، بەڵام هەندێ رۆڵی دیکە هەن بۆ گۆڕان و جیاوازی بوارێکی فراوانتریان تیادایە (ئاستی دیاریکردنی رەفتار).

★ بەردەوامی: ڕۆڵی ژن و پیاو و پیشەیی لەنێو کۆمەڵگەدا بەردەوامە هەروەها هەندێ ڕۆڵ هەن بۆ ماوەیەکی کەم بەردەوام دەبن وەك: پاڵێوراوێك یان ڕێگەپێدراو بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو یان ئەو کەسەی بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەیەك ئەرکێکی خراوەتە سەرشان.

★ گرنگی و بەناوبانگی: ڕۆڵی هاوولاتییەکی ئاسایی وەك ڕۆڵی زانا و دکتۆرێکی نەشتەگەر نییە لە رووی ئاسانی و قورسییەوە.

## هەمەجۆریی ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی

تاك تەنها یەك ڕۆڵی کۆمەڵایەتیی نییە، بەڵکو بەپێی ئەو کۆمەڵە جۆراوجۆرانەی تاك بەشدارییان تیادا دەکات ڕۆڵەکەی دەگۆڕێت و هەمەچەشن دەبێت، بۆنموونە: سەرکردە ڕۆڵی خۆی وەك سەرکردەیەك دەگێرێت و لەهەمان کاتیشدا هاوسەر و باوکە لە خانەوادەکەی و ئەندامە لە یانەیەکی وەرزشی و کۆمەڵەیەکی سیاسی، رەنگە تاکێك لە بەیانیاندا مامۆستا بێت و لە شەوانیشدا فێرخوازی خوێندنی باڵا بێت. لەسەر تاك پێویستە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ڕۆڵە هەمەچەشنەکانی لە رەوتێکی ڕێکوپێك و بەیەکتر وابەستە و تەواوکەردا دابنێت. تاك لەسەردەمی منداڵیەوە و لە میانی شیاندنی کۆمەڵایەتییەوە چەندان ڕۆڵی هەمەچەشنی بەدوایەکداهاتوو فێردەبێت و ڕۆڵی خۆی وەك کوڕ یان کچێك و دواتریش وەك برا و خوشك و دواتریش وەك فێرخواز و دواتریش وەك گەنج و دواتریش وەك ژن یان پیاو و دواتریش وەك فەرمانبەر و دواتریش وەك هاوسەر و دواتریش وەك دایك یان باوك و دواتریش وەك هاوولاتییەك وهتد فێر دەبێت.

# فێربوونی ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی

تاك ئەو ڕۆڵە کۆمەڵایەتیانەی کە لە کۆمەڵە جۆراوجۆرەکاندا ئەنجامیان دەدات واتا لەمیانی پێڕەوکردنی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتیدا و بەهۆی کردەی شیاندنی کۆمەڵایەتییەوە وەریاندەگرێت، فێربوونی ڕۆڵەکانیش بە کردەیەکی کۆمەڵایەتیانە دادەندرێت کە مانەوە و بەردەوامی بۆ کۆمەڵگە دەستەبەر دەکات.

کردەی فێربوونی ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی و بنەما و ڕێسایە زاندراوەکانی بیردۆزی فێربوون، وەك پاڵپشتیکردن لەخۆیدەگرێت و تاکیش کردەی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی فێربوونی مەبەستدار و فێربوونی رووکەشانەی خۆکارانەوە فێردەبێت، کردەی چوونە نێو دەور و یەکبوونیش ڕۆڵێکی گرنگ لەم بوارەدا دەگێڕن و تیایدا تاك ئەو جۆر و چەشنە ڕەفتارانە فێردەبێت کە تایبەتە بە خەڵکانی دیکە و قبوڵکردنی هەروەك ئەوەی تایبەت بێت بە تاکەکەسەکە، دواتریش ئەو ئامانج و بەهایانەی کەسانی دیکە و کۆمەڵەی دیکە پەسند دەکات و لەگەڵ ئامانج و بەهاکانی خۆی ئاوێتەیان دەکات.

# دابەشکردنی ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی

دابەشکردنی ڕۆڵەکان لەنێوان ئەندامەکانی کۆمەڵەدا ئەرکی کۆمەڵایەتی دەهێنێتەدی و دەبێتە پێویستییەکی دەروونیی تاك و هەستی زەرورەتی ڕێزگرتن لەلایەن خەڵك و وەدیهێنان و ئەنجامدان و کارلێکی کۆمەڵایەتی سەرگەکەیەتی. هەروەها دابەشکردنی ڕۆڵەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی یارمەتیدەر دەبێت کاتێ هەر کەسە و ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت.

ڕۆڵەکانیش بە رەوتێکی دانپێدانراوی ئەندامانی کۆمەڵەکە دابەش دەکرێت، تێبینیی ئەوەش دەکرێت رەنگە ڕۆڵەکە تەنها بە ئاماژەکردن بە ڕۆڵی دیکە وەسفبکرێت کە

پەیوەندییان پێیەوە هەیە و لە کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا تەواوی دەکات، چوونکە ڕۆڵی مامۆستا لەژێر تیشکی پەیوەندییەکانی بە ڕۆڵی فێرخواز و هاوکاران و بەڕێوەبەرەوە لێی دەنواڕدرێ، ئەم کردەیەش لەلایەن مەسەلەیەکەوە حوکمی بەسەردا دەکرێت کە پێی دەگوترێت (پێشبینییەکانی ڕۆڵ) واتا ئەرك و مافە ئاڵوێرکراوەکانی نێوان ئەو تاکانەی کە ئەو ڕۆڵانە دەگێڕن و تەواوکەری ڕۆڵی تاکەکەسەکەیە و تاکەکانی دیکەش – ئەوانەی کارلێکی لەگەڵدا دەکەن– لەمیانی ئەنجامدانی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکانیان هەوڵی وەدیهێنانی ئەم پێشبینیانە دەدەن. یەکێك لە نموونەکانی دابەشکردنی ڕۆڵەکانیش ڕۆڵی هەر ئەندامێکی تیپی تۆپی پێیە، ڕەنگە ئەو تاکەی ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی ئەنجام دەدات لەو سنوورانە دەربچێت کە بۆی دەستنیشانکراوە، بەڵام بەبەردەوامی پێوەی پابەند دەبێت.

## کێشمەکێشی نێوان ڕۆڵەکان

لەکاتی ئەنجامدان و گێڕانی ڕۆڵەکاندا ڕەنگە هەندێ ناکۆکی و تێکچڕژان و کێشمەکێشی تیادا بێت، کێشمەکێشیش لەو کاتەدا سەرهەڵدەدات کاتێ گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی لە ژیانی تاکدا دروستدەبێت، بۆنموونە: کاتێ لە چینێکی کۆمەڵایەتییەوە بەهۆی نزمبوونەوەی ئاستی ئابووری دادەبەزێتە چینێکی دیکەی نزمتر و هتد.

یەکێك لە هۆیەکانی کێشمەکێشی ڕۆڵەکان درککردنی تاکە بە خودی خۆی بەوەی کە دوو ڕۆڵ یان پتر ئەنجام دەدات و هەردووکیشیان لەگەڵ هەندێ هەڵوێستی دیاریکراو دەگونجێن و لەگەڵ هەڵوێستی دیکەش ناگونجێن، بۆنموونە: وەك ئەو پۆلیسەی لەسەری پێویستە برایە تاوانکارەکەی دەستگیر بکات. کێشمەکێشی نێوان

ڕۆڵەکان دیاردەیەکە و گرفتی پچڕان و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی بونیادی کۆمەڵایەتی یان نەگونجانی نێوان کەسێتی و بونیاد پیشان دەدات. کێشمەکێشی ڕۆڵەکان کاریگەرییەکی نەرێیان بەسەر کەسێتیدا دەبێت و چەندان گرفت دەهێنێتە ئاراوە.

– ئەو پێشبینیانەی لە چوارچێوەی سیستمی کۆمەڵایەتیدا پەیوەندییان بە ڕۆڵەکانەوە هەیە لە رووی روونی و پلەی گونجان و کۆبەندی و ڕێکەوتنی نێوان کەسەکانەوە دەگۆڕێت. گرژیش لەو کاتەدا دێتەپێشێ کە روونی لە پێشبینییەکاندا نەبن، ئەم گرژیەش لە دڵنیا نەبوون لە پێشبینیکردنی ڕەفتاری ڕۆڵدا سەر هەڵدەدات، ئەمەیش وەها لە ئەنجامدەرانی ئەو ڕۆڵانە دەکات ناچارین روونکردنەوەی پتر بکەن بۆ ئەوەی گێڕانی ڕۆڵ و کارلێککردن بەردەوام بێت.

دوو ڕەهەند و ڕوخساری نەگونجان لەهەمبەر پێشبینیکردنی ڕۆڵەکانەوە هەیە کە یەکێکیان پەیوەندیی بە نەگونجان و ناکۆکیی ئەنجامدەرانی ڕۆڵەوە هەیە، ئەوی دیکەش بەهەر ئەنجامدەرێك کە ڕێککەوتن ڕەتبکاتەوە، هەروەها گرژی و نیگەرانی و ئیفلیجبوون لەوکاتەدا ڕوودەدات کاتێ ئەرك و مافی گشت لایەك ڕووندەبێتەوە. ڕەنگە نەگونجان و ناکۆکیی نێوان ئەنجامدەرانی ڕۆڵەکان لە چوارچێوەی سیستمی ڕۆڵەکاندا لەهەمبەر پێشبینییەکان یەکێك لەم پێنج شێوەیە بگرێتەخۆ:

أ) نەگونجان و ناکۆکی لەسەر دیاریکردنی پێشبینیەکانی ڕۆڵ.

ب) نەگونجان و ناکۆکی لەسەر ئاست و قووڵیی ئەو ڕەفتارەی کە ڕێگەی پێدراوە و ئەوەش کە لە چوارچێوەی ڕۆڵەکەدا ڕێی پێنەدراوە.

ج) نەگونجان و ناکۆکی لەسەر ئەو هەڵوێستانەی کە پێشبینییەکانیان بەسەردا پیادە دەبێت.

د) نەگونجان و ناکۆکی لەسەر ئەوەی کە ئاخۆ رەفتارە پێشبینیکراوەکە ناچاریانەیە یانیش خۆویستانەیە.

ه) نەگونجان و ناکۆکی لەسەر ئەوەی کە ئاخۆ چ پێشبینییەك لەکاتی روودانی کێشمەکێش لەنێوان رۆڵەکاندا بەباشتر دادەندرێت.

رەنگە نەگونجان لەبارەی رۆڵی ژن لە کۆمەڵگەکەماندا نموونەیەکی باش بێت کە کۆی ئەم ناکۆکیانەی تیادا دەبیندرێت بەنیسبەت ئەو مێردانەی کە باوەڕیان بە یەکسانی نییە، لێرەدا نەگونجانەکە لەمانەی خوارەوەدا بەدیاردەکەوێت:

- وازهێنانی ژن لە کار و پیشە بەو باوەڕەی کە تەنها ژنی ماڵەوەیە.

- ئەو باوەڕەی کە پێیوایە کاری بەشەکی رێگەی پێدراوە، بەڵام کاری هەمەکی رێگەی پێنەدراوە.

- ئەو باوەڕەی کە پێیوایە کاری ژن تەنها لەکاتی پێویستبوون بەلایەنی مادی رێگەی پێدەدرێت.

- باوەڕی مێرد بەوەی کە هەرگیز نابێ ژن کاربکات، هەروەها ئەو هەستەش کە وەهای پێباشترە ژن کارنەکات.

- باوەڕی مێرد بەوەی کە ئەرکە خانەوادەییەکانی ژنەکە سەرلیستی گرنگایەتییە و باوەڕی ژنیش بەپێچەوانەی ئەم رایە.

ئەمەیش دەبێتە هۆی کێشمەکێشی نێوان لایەنەکان و کێشمەکێشی خودی کاتێ تاك بیروبۆچوونی دژبەیەکی دەبێت. گونجانیش لە گێڕانی رۆڵەکاندا بە بناغەی سەرکەوتن دادەندرێت.

– بارسۆنز پێیوایە تاك لەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەی تیایدا دەژیەت چەندان رۆڵی کۆمەڵایەتی دەگێڕێت کە رەنگە لەنێوانیاندا هەندێ جیاوازی و تێکچڕژان و دژبوونیان تیادا هەبێت، کێشمەکێشیش لەکاتی دژبوون و جیاوازییەکانی رۆڵەکاندا دێتەکایەوە، لەلای بارسۆنز کۆمەڵگە خاڵی نییە لە ئێشوئازاری تاکەکانی بەدەست کێشمەکێشی رۆڵەکان، گرژی و کێشمەکێشی نێوان رۆڵەکان لەو کۆمەڵگەیانەدا باوە کە رێکخستنێکی گەورە و ئاڵۆزی بونیادی هەیە و زۆر زۆرترە لە هی کۆمەڵگە سادە و بچووکەکان. ناوبراو پێیوایە کێشمەکێشی نێوان رۆڵەکان زۆر بەروونی لەسەر شێوەی کێشمەکێشی ناوەکی بێئومێدکردنە دەرەکییەکان یانیش هەردووکیانەوە بەدیاردەکەوێت. هەروەها رەنگە لەسەر شێوەی رووبەرووبوونەوەی تاکبێت لەهەمبەر ئەو رۆڵانەی کە پێشبینییەکانی نێوی دژیەیەك دەوەستنەوە و ناگونجێن، ئەمەیش دەبێتە هۆی بەدیارکەوتنی چەند هەڵوێستێك کە زۆر زەحمەتە گونجان و هەماهەنگی و کامڵبوونی نێوان کەسێتی و سیستمی کارلێکی کۆمەڵایەتی روویدات.

کێشمەکێشی نێوان رۆڵەکان دیاردەیەکە و گرفتی کامڵبوونی سیستمی کەسێتی و لەیەکترازانی بونیادی کۆمەڵایەتی و نەگونجانی نێوان کەسێتی و بونیادەکە پیشان دەدات و رەنگە دەرەنجامی کارلێکی نێوانیان بێت.

هەروەها کێشمەکێش زۆر بەتوندی لە کێشمەکێشی نێوان رۆڵەکانی خانەوادەیی و رۆڵەکانی پیشەییدا بەدیاردەکەوێت (دایکایەتی – جەختکردنەوە لەسەر تایبەتمەندی و پەیوەندییەکانی ویژدانی)(کارکردن–جەختکردنەوە لەسەر گشتیەتی و بەرچاوروونی لەهەمبەر پەیوەندییەکان).

زانایانی دەروونناس و کۆمەڵناس چەندان هەوڵیان داوە بۆئەوەی کێشمەکێشی ڕۆڵەکان لێکبدەنەوە:

١. لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی: پێیوایە کێشمەکێش دژبوونی داواکارییە کۆمەڵایەتییەکانە لە کاتی جێبەجێکردنی ڕۆڵەکان لەهەڵوێستێکدا، هەروەها دەستەپاچەیی خەڵکە لەهەمبەر ڕێکەوتن لەسەر چەندان ڕاوبۆچوونی پەسند.

٢. لێکدانەوەی تاکەکەسی: پێیوایە کێشمەکێشی نێوان ڕۆڵەکان دەبێتە هۆی گرفتاربوونی تاک بەدەست نیگەرانی و گرژی لەکاتی جێبەجێکردنی داواکارییەکانی ڕۆڵەکان.

## پەیوەندییەکان لە کۆمەڵەدا لەمیانی ئەو ڕۆڵە جۆراوجۆرانەی کە تاک لەکاتی کاری بەکۆمەڵدا ئەنجامیان دەدات

لەم بەشەدا باس لەهەندێ ڕۆڵی گرنگ و بەسوود دەکەین کە ڕەنگە تاک لە کۆمەڵەکاندا بیانگێڕێت، ئەمەی خوارەوە پۆلینکردنێکی ئەو ڕۆڵە وەزیفیانەیە کە ئەندامانی کۆمەڵەیەکی دیاریکراو دەیگێڕن، ئەم پۆلینکردنەش لەسەر بنەمای گفتوگۆی نێوان (بێن) و (شیتش) بۆ ئەم ڕۆڵانە بونیاد نراوە.

ئەم دوو زانایە باسی سێ جۆرە ڕۆڵ دەکەن، ئەوانیش: ئەو ڕۆڵانەی پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە هەیە، ئەو ڕۆڵانەی یارمەتیی بونیاد و نۆژەنکردنەوەی کۆمەڵە دەدەن، هەروەها ڕۆڵی تاکەکەسیی خودی. ئەم دوو زانایە لە ژێر هەرجۆرە ڕۆڵێکدا کۆمەڵێك ڕۆڵیان پۆلینکردووە کە ئەندامانی کۆمەڵە بۆ پێشخستنی جۆر و شێوازی کاری بەکۆمەڵ ئەنجامی دەدەن.

## یەکەم: ئەو رۆڵانەی پەیوەندییان بە ئەرکی کۆمەڵەوە هەیە ( Group Task Roles)

دەوروخولی ئەو ئەرکانە دەدات کەوا خراونەتە سەر شانی کۆمەڵەوە، چوونکە ئەندامێکی کۆمەڵە دەست بە ئاسانکردنەوە و هەماهەنگیی هەوڵ و کۆششی کۆمەڵە دەکات لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە بەشێوەیەکی پەسند، بریتین لەو رۆڵانەی خوارەوە:

١- دەستپێشخەری (Initiator-Contributor) کە لەهەمبەر ئەرکی بەکۆمەڵ و چۆنیەتیی ئەنجامدانی پێشنیاری بیر و شێوازی جۆراوجۆر دەکات.

ب) داواکاری زانیارییەکان (Information Seeker) کە پێشنیارەکان روونده‌کاتەوە و داوای هەندێ لەو راستی و زانیارییە فەرمیانە دەکات کە پەیوەندییان بەبابەتی توێژینەوەکە هەیە.

ج) داواکردنی راوبۆچوون(opinion Seeker) (ئەوەی بیربۆچوونێك یان شیمانەیەك روونده‌کاتەوە کە پەیوەندیی بە گرفتەکەوە هەیە.

د) بەخشەری زانیارییەکان (Information Giver) ئەوەی کە لەمیانی شارەزایی و ئەزموونەکانیەوە راستییەکان دەخاتە روو و گرفتەکان روونده‌کاتەوە.

ه) بەخشەری رایەکان (Opinion Giver) ئەوەی گوزارشت لەو بیروبۆچوونانە دەکات کە وەهای دادەنێت پەیوەندیی بە ئەرکەکەوە هەیە، بەتایبەتیش رای خۆی لەوەی کە دەبێ بەهای کۆمەڵەکە لەسەری بێت.

و) روونکەرەوە (Elaborator) ئەوەیە کە راڤەی هزرەکان دەکات یان نموونە و نواندێکی لەبارەوە دەدات و پێشنیارەکانی ئەندامەکانی کۆمەڵە هەموار دەکاتەوە، هەروەها هەوڵ دەدات پێشبینیی کاردانەوەی پێشنیارەکان و چارەسەرەکە بکات.

ن) ڕێکخەر (Co – Ordinator) ئەوەی کە پەیوەندیی نێوان هزرەکان ڕووندەکاتەوە و هەوڵ دەدات بەیەکیان ببەستێتەوە، یانیش هەوڵی ڕێکخستنی بزاڤە تاکەکەسیەکانی نێو هەوڵ و کۆششی کارایانەی بەکۆمەڵ دەدات.

ح) ڕێخۆشکەر (Orientor) ئەوەی کە چالاکی و گفتوگۆیەکانی ئەندامان پوخت دەکاتەوە لەپێناو ئەوەی توانایان پێببەخشێت لە ئامانجی گشتیی کۆمەڵەکە پێگەی خۆیان ببینن، یانیش چەند پرسیارێك دەوروژێنێ و پەیوەندیی بەو ئاراستەیەوە هەیە کە بێژبازی و گفتوگۆی کۆمەڵە لەسەری دەڕوات.

گ) هەڵسەنگێنەری ڕەخنەگر (Evaluatir – Critice)ئەوەی هەوڵ دەدات بە ئاماژەکردن بە ئەرکی سەرشانی کۆمەڵە، شتە وەدەستهاتووەکانی کۆمەڵە هەڵسەنگێنێ.

ی) چالاکیبەخش (Energizor) ئەوەی کە نەك تەنها هانی کۆمەڵە دەدات بۆ وەدەستهێنان و ئەنجامدان، بەڵکو هانیان دەدات بە ئاستێکی جۆریی باشتر ئەنجام بدەن و وەدەستبهێنن.

ك) کەسی هونەریی ڕێکار و ڕێوشوێنەکان (procedural Technician) ئەوەی بە ئەنجامدانی ئەرکە یەك ریتمی و بێزارکارەکانی وەك دابەشکردنی مادەکان و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کورسییەکان و هتد کاری کۆمەڵە ئاسان دەکات.

ل) تۆمارکار (Recorder) ئەوەی بە پاراستنی دۆسیە و پێشنیار و بڕیار و دەرەنجامی گفتوگۆیەکانی کۆمەڵە ڕۆڵی "یادگەی کۆمەڵە" دەگێڕێت.

## دووەم: ئـەو ڕۆڵانـەی یارمەتیـدەری دامەزرانـدن و نۆژەنکردنـەوەی کۆمەڵەیە Group Building and Maintenance Roles

ئـەم ڕۆڵانـە پەیوەنـدیی بـە کـاری کۆمەڵـەوە هەیـە وەك کۆمەڵـە، ئامانجیـشی پتەوکردنی ئەو هەڵوێست و کارامەییانەیە کە پەیوەندیی بە کاری بەکۆمەڵەوە هەیـە و بۆ مانەوە و یەکیەتیی کۆمەڵە پێویستە.

ا) هانـدەر (Encourafer) ئەوەیـە کـە بەگـشت گورپوتـاو و دەستخۆشـیکردنەوە بەشدارییەکانی ئەندامان پەسند دەکات و لەمیانی ئەمەیشەوە بـۆ وەرگرتنـی بـیروڕای خەڵکان و تێگەیشتنیان هەستێکی گشتی دەخولقێنێ. هەروەها بەهۆی پێـشنیارکردنی دیـاریکردنی ئاسـتی بەشـداریکردنی هــەر تاکێـك بـۆ ڕێگـە خۆشــکردن لـەپێناو بەشداریکردنی زۆرترین ژمارەی ئەندامان هاندەرە لەپێناو مانەوە و بـەردەوامی، کـاتێ هاندەر ئـەم ڕۆڵـەی دوایـی دەگێڕێـت پێـی دەڵـێن پاسـەوان (Grate-keeper) و ڕێخۆشکەر (Expedediter).

ب) گونجێنەر (Harmonizer) ئـەوەی لـە کێشمەکێش و ناکۆکییـەکانی نێـوان ئەنداماندا نێوەندکاریی دەکات، ئەو نەك تەنها یارمەتیدەری لابردنی گرژییەکانە، بەڵکو لەمەیش گرنگتر ئەنجام دەدات، ئەویش پاراستنی یەکگرتوویی کۆمەڵەیە.

ج) (Compromiser) ئـەوەی کـە لـە بێژبازییـەکی دیـاریکراودا و لـەمیانی وازهێنـانی لـە هەڵوێـستی خـۆی، پێـشکەوتنی کۆمەڵـە بـەرەو ئامانجـە گـشتییەکانی ئاساندەکات.

د) دانەری پێوەر (Standard- Setter) ئەوەی ئەو مەبەستە دیاریی دەکات کە کۆمەڵە هەوڵی وەدیهێنانی دەدەن و پێوەرێک بۆ هەڵسەنگاندنی جۆری وەدەستهاتوو و ئەنجامدانەکانی کۆمەڵە دادەنێت.

هـ) چاودێری کۆمەڵە (Group Observer) هەروەها بە چاودێری کردەش دەناسرێت، هەر ئەویشە تۆماری لایەنە جۆراوجۆرەکانی چالاکیی کۆمەڵە دەپارێزێت و تێبینی و لێکدانەوەکانی بۆ کۆمەڵە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی لە هەڵسەنگاندنی ئەنجامدان و وەدەستهاتووەکاندا یارمەتیی کۆمەڵە بدات.

و) شوێنکەوتە (Follower) ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی و لەوانەیە زۆرتاییەت، لەکاتی بڕیاردانێکدا ڕۆڵی گوێگر بگێڕێت. لەوانەشە لە بڕیارێکدا لەگەڵ کۆمەڵەدا ڕێبکات. جا لەبەرئەوەی لەگەڵ کۆمەڵەدا ڕێدەکات نابێتە کۆسپی ڕێگە و ڕەفتارێکی دوژمنکارانە ناکات بۆیە دەتوانین ڕۆڵەکەی بە یارمەتیدەری نۆژەنکردنەوە (صیانە) ی کۆمەڵە دابنێین.

## سێیەم: ڕۆڵە تاکەکەسییە بەکۆمەڵەکان

**(Lndividual Self- Serving Roles):**

ئەو ڕۆڵانەن پەیوەندییان بەو کردارانەوە هەیە کە هەندێ ئەندام بۆ وەدیهێنانی پێداویستییە تاکەکەسیەکان ئەنجامی دەدەن و تەگەرە دەخەنە بەردەم کۆمەڵە لە وەدیهێنانی ئامانجەکانی، لەو ڕۆڵانەش:

ا) دوژمنکارانە **(The Aggressor)**

لێرەدا هەندێ تاک چەند چەشنە ڕەفتارێک دەکەن کە ڕەنگە بچنە قالبی کەمکردنەوەی ڕێز و شکۆ و بیروبۆچوون و بەها و باوەڕەکانیان، یان گرتنەبەری

ڕەوتی سەرزەنشتکردنی هەندێ ئەندام و کۆمەڵە و زێدەڕۆییکردن لە گاڵتەی ئازاربەخش.

ب) پەکخەر (The Blocker):

لێرەدا ئەندام هەڵوێستی بێزیازێکی کەللەڕەق و بەرپەرچدەرەوەی گشت پێشنیارێك دەبینێ، دژی راوبۆچوونی خەڵکانی دیکە دەوەستێتەوە بەشێوەیەك کە لە سنووری ئەقڵ بچێتە دەرێ، هەروەها رەنگە هەوڵ بدات بگەڕێتەوە بۆ پێشنیار و بابەتێك کە پێشتر کۆمەڵە گفتوگۆی لەبارەوە کردووە یان رەتیکردووەتەوە.

ج) ئەو کەسەی بەدوای پێگە و شکۆدا دەگەڕێت ( The Recorgnition-Seeker)

لێرەدا ئەندام لەمیانی شانازیکردن بە پاڵەوانیەتی و دەستکەوتە کەسییەکانی هەوڵ دەدات سەرنجی خەڵك بۆ خۆی رابکێشێت و بەردەوام دژی ئەوە دەوەستێتەوە بچێتە هەڵوێستی شوێنکەوتە و ژێردەست.

د) دانپێدانەر (The Self- Confessor)

لێرەدا ئەندام چاوپێکەوتنی کۆمەڵە بەکاردەهێنێت بۆئەوەی باس لەو بیروبۆچوونە تایبەت و بیروباوەڕ و ئاراستە هزرییانەی بکات کە بەهیچ شێوەیەك پەیوەندیی بە ئەرکی کۆمەڵە نییە.

هـ) گەمەکار(The Play Boy)

لێرەدا ئەندام بە گاڵتە و لاقرتێ و گۆڕینی بابەتەکانی گفتوگۆ و دەرچوون لە هۆڵی کۆبوونەوەکان، گوزارشت لە گرنگینەدانی خۆی دەکاتەوە.

و) بەرزەفتکاری زاڵ (The Dominator)

لێرەدا ئەندامەکە بۆ زاڵبوون و بەکارهێنانی کۆمەڵەکە و هەندێ ئەندام هەوڵ دەدات دەسەڵاتی خۆی دووپاتبکاتەوە. ڕەنگە ئەم ڕەفتارە دەستبەسەرداگرە شێوەی ستایشکردن و جەختکردنەوە لەسەر شکۆی خۆی و بەخشینی فەرمان و پەیوەندیی پچڕاندن لەگەڵ خەڵکان بەخۆیەوە بگرێت. ڕەنگە هەندێ قسە بکات کە ئاماژە بە لووتبڵندی و متمانەبەخۆکردنی زیاد لەپێویست بکات.

ز) ئەو کەسەی بەدوای سۆزدا دەگەڕێت (The Help – Seeker)

لێرەدا ئەندامەکە دەیەوێ لە ڕێگەی دەرخستنی هەستنەکردن بە ئاسایش و شڵەژان و بێزراندنی خودی خۆی سۆزی هەندێ ئەندام و کۆمەڵە بەشێوەکی زۆر ناماقوڵ بۆخۆی رابکێشێت.

ح) پاشەکشە کار: (The Withdrawer):

لێرەدا ئەندامەکە هیچ گرنگییەك بە گفتوگۆیەکانی کۆمەڵە نادات و لە چالاکییەکانیشیان بەشدار نابێت، ڕەنگە ئەم دەستەواژانەش بڵێتەوە" ئەم کۆمەڵەیە لە کارەکانیدا پێشنەکەوتووە، جا بۆچی هەریەکە و لە ئێمە بەتەنها هەوڵی چارسەرکردنی گرفتەکە نادات؟.

ك) وتاربێژ (Speech –giver)

لێرەدا کۆی گرنگیدانەکانی کەسەکە پێشکەشکردنی وتارێکە بە چەند واژەیەکی کرچوکاڵ کە تیایدا باس لە میسالیەتەکان دەکات، هەروەها تیشك دەخاتە سەر ئەوشتانەی کە دەکرێ بکرێ و ئەم وتەیەشی بەسەردا پیادە دەبێت: (کەڵکەڵەی حەیرانێکی کەوتووەتە سەر و دەیەوێ بیەژێ)".

ل) ئەو کەسەی دەڵێت: راستە..... بەڵام" : (yes.... But)

لێرەدا رۆڵی خۆی وەها دەگێڕێت و دەڵێت: ئەوەی هێژا گوتی راستە و من لەگەڵیدام، بەڵام راوبۆچوونەکەی زۆر لۆژیکی نییە" یانیش رەنگە ئەم دەستەواژەیە کۆبکات:" فلانە کەس زۆر سیفەتی جوانی هەیە، بەڵام مرۆڤێکی خۆپەرستە و تەنها بەرژەوەندیی خۆی مەبەستە".

م) کەسی خۆ مەڵاسدەر و راوچی (The Hunter)

لێرەدا ئەندامەکە زۆربەی جار رۆڵی کەسێکی بێدەنگ دەگێڕێت، بەڵام خۆی مەڵاس داوە و بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت دووکەس تێکبەربدات یان دژیوونی قسە و گوفتارەکانی کەسێك بەدیاربخات. ئەو کەسە زۆربەی جار کارەکان ئاسان دەکاتەوە بە گەڕاندنەوەیان بۆ یەك هۆ، یانیش گرنگییەکی زۆر دەداتە بابەتێکی کرچوکاڵی لاوەکی.

ن) کەسی بارێنەری ناوەکان:(Name Dropper)

لێرەدا ئەندامەکە کۆمەڵەکە بە کۆمەڵێك ناوی نووسەر دەڕشێنێ، یانیش هەندێ ناوی کەسانی بەرزی نێو دەستگە و دەسترۆیشتووان دەئاخنێتە نێو قسەکانی بۆ ئەوەی گرنگییەکی تایبەت بە قسەکانی بدات و ترشوخوێی پێدا بکات.

– هەردوو زانا گیب و گیب پۆلینکارییەکی کردارییان بۆ زۆربەی ئەو رۆڵانە پێشنیارکردووە کە لەبنەڕەتەوە پێشنیاری (بن و شیتس) بوو، ئەوان پێشنیاری پێنج جۆری گشتیی سەرکردەییان کردووە، ئەوانیش:

ا) دەستپێشخەری: (Initating) واتاکەیشی ئەوەیە کاری بەکۆمەڵ بکرێتە شتێکی جوڵاوە یان هەوڵی جووڵاندنی بدرێت، وەك پێشنیاری هەنگاوی کار و دیاریکردنی مەبەستێك، یان پێشنیارکردنی شێوازێك، یانیش روونکردنەوەی پرسێك.

ب) ڕێکخستن:ماناکەیشی ئەوەیە کاریگەری لەسەر کاری کۆمەڵە و پلەی خێراییەکەی دروستبکرێت، وەك پوختکردنەوە و ئامادەکردن بە کاتی دیاریکراو یان گەڕاندنەوەی مەبەست بۆ زەین و ئەندێشەکان.

ج) ڕاگەیاندن: (Informing)؛ واتا بەخشینی زانیاری و ڕاوبۆچوون بە کۆمەڵە.

د) پاڵپشتیکردن: (Supporting) واتا دروستکردنی کەشێکی سۆزی کە ئەندامانی کۆمەڵە لەیەکتری نزیك بکاتەوە لەپێناو ئەو ئەرکەی خراوەتە سەرشانی کۆمەڵە و لادانی گرژی کردەی بەشداریکردن لە کار ئاسانتر بکات ، یانیش گوزارشت لە هەستوسۆزی کۆمەڵە دەکات و هانیان دەدات.

ﻫ) هەڵسەنگاندن: (Evaluating) واتا یارمەتیدانی کۆمەڵە بۆ هەڵسەنگاندنی بڕیار و مەبەست و شێوازەکانی کار، وەك هەڵبژاردنی ئاستی گەیشتن بە کۆڕایی و تێبینیکردنی شێوازی کاری بەکۆمەڵ.

# ڕای گشتی

# Public opinion

چەمکی ڕای گشتی بەندە بە چەمکی ئاراستەکانەوە، ڕای گشتیش بۆ زۆر کەس بابەتێکی گرنگە.

## چەمکی ڕای گشتی :

ڕای گشتی وەها پێناسە دەکرێت کە تەنها گوزارشتێکی واژەیی قسەییە سەبارەت بە ئاراستە و ڕای گشتی. ڕای گشتی گوزارشتی کۆمەڵە و کۆمەڵگە و جەماوەری گشتییە لەهەمبەر ڕاوبۆچوون و هزر و بیروباوەڕ و ئاراستەکانی لەکاتێکی دیاریکراودا لەهەمبەر بابەت و پرس و گرفتێکی بێزارکەر کەوا زۆری ئازار دەدات.

هەندێك کەس ڕایان وەهایە کە ڕا ئاراستەیە، هەندێکی دیکەیش پێیانوایە کە جیاوازییەکیان لەنێواندا هەیە، جیاوازییەکانیش بریتین لە:

١. ڕاوبۆچوون گوزارشتێکی واژەیی قسەییە لە ئاراستە و ئەو بەهایەش کە تاك باوەڕی پێی هەیە ڕووپۆشە مەعریفییەکەی ئاراستەیە.

٢. ڕاوبۆچوون لە چینێکی سایکۆلۆژییە کە جیاوازە لە چینی ئاراستە.

٣. ڕا جیاوازە لە ئاراستە لەڕووی پەیوەندیی ئەرکیانەی بەرەفتارەوە.

٤. ئەو کاتە ڕا بوونی دەبێت کە ئاراستەکان نەتوانن توانا بە تاك و کۆمەڵە ببەخشن بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی هەڵوێستەکان ببنەوە.

## جۆرەکانی را




رای کەسی: ئەو رایەیە کە تاك دوای بیرکردنەوە لە بابەتێکی دیاریکراو لەهەمبەر خۆیدا پێکیدەهێنێ.

رای تایبەت: ئەو رایەیە کە تاك دەیپارێزێت و نایدرکێنێ تەنها بۆ کەسە زۆر نزیکەکان و جێ متمانەکان نەبێت.

رای ئیئتلافی: گونجان و رێککەوتنی هەندێ راوبۆچوونە لە کاتێکی دیاریکراو و لەژێر هەلومەرجی دیاریکراوی ئیئتلافەکەدا.

رای زۆرینە: نوێنەرایەتیی رای پتر لە ٥٠٪ دەنگی کۆمەڵەیەکی کارا دەکات.

رای کەمینە: نوێنەرایەتیی رای کەمتر لە ٥٠٪ دەنگی ئەندامانی کۆمەڵە دەکات.

رای گشتی: لە کۆمەڵەی رای گشتیدا دەرەنجامی ئەو رایەیە کە لە چەندان را پێکدێت.

## جۆرەکانی رای گشتی:

دابەشبوونەکانی رای گشتی فرەن و دابەشبوونی توند و دابڕنین، مەبەستیش لە دابەشکارییەکە ڕێکخستنە، بەشێوەیەك ئەو راوبۆچوونانە لەیەکتری جیابکرێنەوە، جا بۆ روونکردنەوەی گشت رایەکە بە رایەکانی دیکە، دەتوانین رای گشتی دابەش بکەینە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

**١. رای نیشتیمانیانەی گشتی:**

مەبەست ئەو رایە گشتییەیە کە پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە هەیە و دەسەلآت پشتی پێدەبەستێت و بە گونجان و ئەگەری پێشبینیکردن دەناسرێتەوە، زۆربەی جار نێوەرۆك و ناواخنەکەی پرسەکانی نیشتمانی و نەتەوەیی لەخۆ دەگرێت.

**٢. رای گشتیی هەرێمی:**

پێشکەوتنی کۆمەڵگەکانی هاوچەرخ و گەلانی هاوسێ یارمەتیدەری بەدیارکەوتنی ئەم جۆرە رایە گشتییە بوون، ئەم جۆرەیان جەخت لەسەر نزیکبوونەوەی ئەو دەوڵەتانە دەکات کە سەر بە یەك هەرێمن (هەرچەندە لە رووی بونیادەوە لەیەکتری دابڕاون)، ئەم جۆرە لەنێوان دەوڵەتانی یەك هەرێمدا باوە، رەنگە نێوەندکارێکی نێوان رای گشتیی نیشتمانی و رای گشتیی نێونەتەوەیی بێت، بۆنموونە: ئەو بڕیارانەی لە یەکیەتیی ئەورووپی و کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبیدا دەردەچن، لەو جۆرەن.

**٣. رای گشتیی جیهانی:**

ئەو رایەیە کە نوێنەرایەتیی سەرجەم گەلانی جیهان دەکات لەهەمبەر پرسێکی دیاریکراوی وەك هەڵاواردنی رەگەزی، چوونکە زۆربەی گەلانی جیهان ئەگەر نەڵێین هەر هەموویشیان سیاسەتی هەڵاواردن رەتدەکەنەوە، بەڵام ئەمە بوونی کەمینەیەکی نێو ئەو گەلانە رەتناکاتەوە کە ئەم سیاسەتە دەگرنەبەر. هەروەها رای گشتیی جیهانیی دژ بە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی و چەکی کیمیایی و هتد.

٤. رای گشتیی جۆری:

ئەم جۆرەیان رەنگە لەسەر ئاستی نیشتمان و هەرێم و جیهاندا بێت و گوزارشتێکە لە رای چین و کەرتێکی دیاریکراو لەهەمبەر پرسێکی دیاریکراو، وەك: راوبۆچوون لەهەمبەر شیاندنی کۆمەڵایەتی و سیستمی پەروەردەیی و پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی.

جۆرەکانی رای گشتی:

* خۆمەڵاسدەر یان متبوو: زۆر بەروونی و راشکاوی بەدیار ناکەوێت.

* کرداری/ واقیعی: لەلای کۆمەڵە دەبێتە رەفتارێکی کرداری (پارتەکان، خۆپیشاندانەکان).

* شاراوە/ ناوەکی: بەهۆی ترسی کۆمەڵە لە دەرەنجامەکانی گوزارشت لێکردنی ناتوانرێ دەرببڕدرێت.

* راشکاو/ دیار: بەبێ ترس گوزارشت لە را و ئاراستەکانی خەڵك دەکات.

* جێگیر (بە رێژە): لە خوو و نەریتەکان سەرچاوە دەگرێت.

* گۆڕاو (کاتی): بەهۆی کاریگەربوون بە ریکلام و ئاگادارییەکانەوە دروستدەبێت.




* هەمەکی: (سەرتاپاگیر): کۆکەرەوە، بەردەوام، نەریت، بەهاکانی ئاین، سیستمەکانی شیاندن

*هەڵوێستی: لەهەمبەر گرفتێکی کاتی لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا بەدیاردەکەوێ.

★ ڕۆژانە: بە ڕووداوەکانی ڕۆژانە کاریگەر دەبێت.

★ ڕێبەر: کار لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن دەکات و پێی کاریگەر نابێت و ڕۆڵی لە گۆڕینی ڕاوبۆچوون و ئاراستەکانی خەڵکاندا هەیە.

★ سەرکردە: ڕاوبۆچوونی سەرکردەکان و پێشەنگەکان و بیرمەندان.

★ ڕۆشنبیر: ڕاوبۆچوونی کۆمەڵەی ڕۆشنبیران.

★ هاژووراو: ڕاوبۆچوونی زۆرینەی خەڵکی ڕەشۆکی.

★ دیموکراسی: لەسەر سەربەستی و گفتوگۆ بونیاد نراوە.

★ دەستبەسەرداگر: سەرگەی خۆی لە چوارچێوەیەکی دەستەبەسەرداگردا وەردەگرێت.

★ سەرلێتێکدەر: لە چوارچێوەی پڕوپاگەندە و دەنگۆیەکاندا خۆی دەبینێتەوە.

## تایبەتمەندییەکانی رای گشتی

تایبەتمەندییەکانی رای گشتی جۆراوجۆرن و دەکرێ بەم شێوەیە دیاریی بکرێن:

١. رای گشتی وەدەستدەهێنێت و رەگوریشەکەی لە ژینگەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی کۆمەڵگەوەیە.

٢. پەیوەندی و وابەستەیی لەگەڵ جەماوەردا پەیدا دەکات، لەگەڵ ئەوەی گوزارشتێك نییە لە ویست و خواستی، بەو واتایەی لەگەڵ راوبۆچوونی زۆرینە ناگونجێت.

٣. لەلایەن دەسەڵاتێکی دیاریکراو و ناسەپێندرێ و وەك سرووشی دەسەڵات نییە.

٤. پشت بە زانیاری و داتا و چەمك و ئەزموون دەبەستێت.

٥. ئەقڵ و سۆز حوکمی بەسەردا دەکەن.

٦. دەتواندرێ بپێورێ و شرۆڤە بکرێت.

٧. لە چەند ئاستێکەوەیە: ناوەخۆیی تەنگەبەر، نیشتمانی، نەتەوەیی، جیهانی.

٨. بە سرەوتن و متبوون دەمێنێتەوە و لەو کاتەدا خۆی بەدیار دەخات کە پێویستیان پێی بێت.

٩. لە دۆخەکانی توندوتیژی و جەنگدا ئەقڵی خۆی لەدەست دەدات.

١٠. لە دۆخەکانی خاوبوونەوە و پشتگوێخستندا دەخەوێت.

١١. بەو نەهامەتی و کارەساتانە کاریگەر دەبێت کە دووچاری گەل و نەتەوەیەك دەبنەوە.

# پێکهاتنی رای گشتی

رای گشتی لەسەر بنەمای کارلێکی کۆمەڵایەتی و دانوستان (بەخشین و وەرگرتن)ی نێوان هاووڵاتیانی پێگەیشتووی نێو کەشێکی کۆمەڵایەتیانەی دیموکراسی و بەهۆی ئەو گفتوگۆیە بەکۆمەڵ و ئامانجدارە پێکدێت کە لەپێناو بەرژەوەندیی گشتی ئەنجام دەدرێت.

چەند هۆکارێك هەن کەوا رۆڵێکیان لە پێکهێنانی رای گشتیدا دەبێت:

١. رۆشنبیری و ئاستی خوێندنی تاکەکان.

٢. ئاین و بیروباوەڕ و بەهاکان.

٣. شیاندنی کۆمەڵایەتیانەی تاکەکان.

٤. ئاستی رووداوەکانی ناوخۆیی و نەتەوەیی و جیهانی.

٥. رێبەرایەتی/ سەرکردایەتی.

٦. نێوەند و ئامرازەکانی راگەیاندن و پەیوەندیی جەماوەری.

٧. گفتوگۆی گشتی و میهرەجانەکان.

٨. دەنگۆ و پڕوپاگەندەکان.

٩. دۆخی گشتیی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

## بەڵام مەرج و پێویستییەکانی پێکهاتنی رای گشتی ئەمانەن:

١. بوونی زمانێکی هاوبەش و توانای رێککەوتن لەسەر مانا سەرەکییەکان.

٢. ئامادەیی کۆمەڵەکان بۆ گونجاندنی راوبۆچوونەکانیان.

٣. کیفایەتی گفتوگۆی گشتی.

**پێکهاتنی رای گشتی بەچەند قۆناغێکدا گوزەر دەکات کە دەتوانین لەمانەی خوارەوەدا پوختیان بکەینەوە:**

١. سەرهەڵدانی گرفت و بابەتێك جا ئەگەر مەرگەساتێك بێت یان تاوانێك.

٢. درککردن بە گرفتەکە کاتێ درك بە رەهەندەکانی دەکرێت.

٣. گفتوگۆکردن لەسەر گرفتەکە بۆ تاوتوێکردن و بینینی لایەن و مەترسییەکان و ئەو هۆکارانەی کاری تیادا دەکەن.

٤. بەدیارکەوتنی پێشنیارەکان بۆ چارەسەکردنی گرفتەکە.

٥. کێشمەکێشی نێوان راوبۆچوونەکان و روانگەکان.

٦. هەوێنبوونی راوبۆچوونەکان بە مانای پێکهاتنی ئاراستە باوەکان.

٧. رێککەوتنی بەکۆمەڵ، لێرەدا کۆمەڵەکە لەسەر چارەسەری مامناوەندی رێکدەکەون.

٨. رەفتاری بەکۆمەڵ کە تیایدا رای گشتی وەردەچەرخێندرێتە رەفتارێکی بەکۆمەڵی وەك خۆپیشاندان و بروسکە و هتد.

## ئەرکەکانی رای گشتی

١. دیاریکردن و نوێکردنەوە و گۆڕینی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی.

٢. پشتگیریکردنی دەستگەکانی حکومی و کۆمەڵایەتی.

٣. رەچاوکردنی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و بەهاکانی ئاکاری.

٤. بەرەودان بە رووحی مەعنەویی گشتی و پاڵپێوەنان و بەگۆڕوتاوکردنی بەرەو پرسە گرنگە گشتییەکان.

## کاریگەریی رای گشتی لەسەر رەفتاری تاك و کۆمەڵ

رای گشتی بەم شێوەیەی لای خوارەوە کاریگەریی لە رەفتاری تاك و کۆمەڵە دەکات:

* رای گشتی ئەو بزاڤ و رەفتارانەی تاك و کۆمەڵ دیاری دەکات کە پەیوەندییان بە پرسەکانی گشتییەوە هەیە، هەروەها لەخۆگری بەشداریی خەڵکە لەنێو خۆیاندا سەبارەت بە هەندێ بیروباوەڕ کە لە رەفتاری کۆمەڵایەتیدا یەکیاندەخات.

* رەفتاری سەرکردەکان لە کۆمەڵە.و کۆمەڵگەی دیموکراسیدا بە ئاراستەکانی رای گشتی کاریگەر دەبێت(ویستی گەل)، دواتر سەرکردەکان بەشێوەیەکی کرداری گرنگیی بە زانینی رای گشتی دەدەن. رەزامەندیی رای گشتی لە سەرکردە و دەسەڵاتدا بەردی بناغەی ئاساییکردنەوە و پتەوکردنی سیستمی دەسەلاَت و سەقامگیری و بە جەماوەریبوونەوە.

*رای گشتی رووخسارەکانی ئاراستەکانی سیاسی و دەسەلاَت لە نێو دەوڵەت و لەنێوان دەوڵەتێك و دەوڵەتێکی دیکەدا دیاری دەکات. زانینی رای ئازادانەی گشتیی گەل بە هەنگاوی یەکەم دادەندرێت بەرەو یەکەمین دیموکراسی لە کێشانی نەخشەی سیاسەتی حوکم و دەرکردنی ئەو بڕیارانەی کە گوزارشت لە ویستی گەل دەکەن و لەگەڵ پێداویستی و هەلومەرجی مادی و مەعنەوی بەرژەوەندیەکانی دادەنرێت لە ئێستە و ئایندەدا.

* رای گشتی بۆ ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵگە لەهەمبەر پرسی نەخۆشی و مەترسی بە هێزێك دادەندرێ.

*پارمەتیدەری کۆکردنەوە و چڕکردنەوەی رای گشتییە بۆ یەکخستنی کۆمەڵ بەرەو ئامانجێکی گشتی.

* رای گشتی لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و هتد کاریگەری لە ژیانی گشتی دەکات.

* زانینی رای گشتی یارمەتیی کردەی پلانی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و ئابووری و سیاسی دەدات، هەروەها یارمەتیی چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەیی و سیاسیی کۆمەڵە دەدات.

* زانینی ئاراستەی رای گشتی لە ژیانی رۆژانەدا یارمەتیی پێشبینیکردنی رەفتاری تاکەکان و کۆمەڵەکان دەدات.

* رای گشتی سنووری حەرامکراوەکان و سزادانەکان و بەرپرسیاریەتی تاك و کۆمەڵ دیاری دەکات. شەرع لە رای گشتیدا بنەمای یاسا و بنەماکانی رێکخستن و شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵ وەردەگرێ. لەهەمبەر هەر یاسایەکیش رایەکی گشتی پێکدێت کە هەم لایەنگر و هەمیش دژیەتی، نوێنەرانی گەل لە ئەنجوومەنی گەلدا گوزارشت لە رای گشتی و دانانی یاساکاندا دەکەن.

* رای گشتی لە پێکهێنانی شارەزاییە تاکەکەسی و بەکۆمەڵەکان و دەوڵەمەندکردن و پتەوکردن و گونجاندنی لەگەڵ کۆمەڵگە و رەگەزەکانی رۆشنبیرییەکەی رۆڵێکی گرنگی هەیە.

* رای گشتی کار لە پتەوکردن و پاڵپشتیکردنی رەفتاری ئاساییانەی بەکۆمەڵ و بەرهەڵستی رەفتاری لادەرانەی بەکۆمەڵ دەکات.

* رای گشتی رۆڵێکی گرنگ لە کردەی گۆڕان و گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا دەگێڕێت و پاڵپشتیی دەستە و دامەزراوەکانی کۆمەڵایەتی دەکات دەستی لە گۆڕینی ئاراستەکاندا دەبێت. جا ئەگەر پێش ئەوەی رای گشتی لەسەر شێوە روون و راشکاوەکەیدا بە دیاریکەوێت، تواندرا ئاشنای رای گشتیی شاراوە و متبوو ببین و ئاشکرای بکەین ئەوا دەتوانین گۆڕانی پێویست ئەنجام بدەین.

* رای گشتی رەچاوی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و دابونەریت و ئاکار و بەها و نموونە باڵاکان دەکات.

* رای گشتی گیانی مەعنەویی کۆمەڵە دەپارێزێت و بەرزی دەکاتەوە ئەگەر هاتوو بەهێز و پتەو بوو، گوزارشت لە رێککەوتنی بەکۆمەڵی نێو کۆمەڵە دەکات.

* رای گشتی پێگەی کەسەکان و سیستم و دەستە و کاڵاکان بەرزدەکاتەوە و دایدەبەزێنێ.

## توێژینەوە و پێوانی رای گشتی

(کرتش و کرچفیڵد)ی زانا چەندان هەنگاویان بۆ شرۆڤەکردنی رای گشتی دەستنیشانکردووە، ئەم هەنگاوانەیش بریتین لە:

١. دیاریکردنی گرفت و شیمانەکان و کۆمەڵگەی شرۆڤەکراو.

٢. دانانی پلانی توێژینەوە و هەڵبژاردنی نموونە (العینە).

٣. ئامادەکردنی کەرەستەکانی پێوان و تەیارکردنیان.

٤. توێژینەوەی شتزانی (استطلاعی).

٥. کاری مەیدانی.

بەڵام ڕێگەکانی پێوانی ڕای گشتی ئەمانەن:

١. تێبینییەکی ڕاستەوخۆ لە پانتاییەکی فراواندا.

٢. چاوپێکەوتنەکانی کەسی.

٣. گفتوگۆیەکانی بەکۆمەڵ و پێشنیارکردنی پرسەکانی جەماوەر.

٤. شیکردنەوەی دەنگۆ بەشێوەیەکی سایکۆلۆژی و لۆژیکی و جێبەجێکردنی بەشێوازێکی زانستی.

٥. ڕێگەکانی لکاندن (الاسقاطية).

## گۆڕین و هەموارکردنەوەی ڕای گشتی

دەتواندرێ ڕای گشتی بگۆڕدرێت و هەمواربکرێتەوە، ئەمەیش بەهۆی ئەو ڕێگەیانە دەبێت کە بەهۆیەوە ئاراستەکان دەگۆڕدرێن، بەڵام دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوەی بۆ زیاد بکرێت:

١. ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندیی جەماوەری و ڕووداوە گرنگەکان و سەرکردە و ڕێبەرەکان ڕۆڵێکی گرنگ لە گۆڕین و هەموارکردنەوەی ڕای گشتیدا دەگێڕن.

٢. هەندێ جار گۆڕینی ڕای گشتی پێویستییەکی نەتەوەیی و نیشتمانی و ئابوورییە بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندیی کۆمەڵە.

٣. بەرژەوەندیی کۆمەڵگە دەبێ گرنگترین پێودانگی گۆڕینی ڕای گشتی بێت.

٤. ئەو ڕایە گشتیانەی کە پەیوەندییان بە ڕێوڕەسمەکانی ئاینی و بیروباوەڕەکانەوە هەیە، زۆر بەتوندی بەرهەڵستیی گۆڕان دەکەن.

٥. کردەی گۆڕینی رای گشتی لەهەمبەر ئەو پرسانەی لە ئەندێشە و هزری خەڵك نەچەسپیون کارێکی ئاسان دەبێت.

٦.گۆڕینی رای گشتی بەشێوەیەکی لەخۆوەیی (تلقائی) دەبێت لەژێر تیشکی ئەو گۆڕانکارییانەی کاریگەرییان لە ژیانی خەڵك و کۆمەڵگدا هەیە.

# دەمارگیری و رەگەزپەرستی:

## چەمکی رەگەزپەرستی

★ رەگەزپەرستی ئاراستەیەکی نەرێییە واتا ئاراستەیەکە و پاڵ بە تاکەوە دەنێت رەفتارێکی دوژمنکارانە بکات دژی تاك و کۆمەڵەی ئەو تاکانەی سەر بە کۆمەڵەیەکی دیاریکراون.

* رەگەزپەرستی ئاراستەیەکی دوژمنکارانەیە دژی کەسێك کە سەر بەکۆمەڵێکی دیکەیە، هیچ هۆیەکیش بۆ ئەو رەگەزپەرستی نواندنە نییە لەهەمبەر ئەو کەسە تەنها ئەوە نەبێت کە سەر بە کۆمەڵەیەکی دیکەیە، واتا بەچەند سیفەتێك دەناسرێتەوە کە وەسفکردنێکی ئەو کۆمەڵەیەیە و ناڕەزایی خاوەن ئاراستە رەگەزپەرستییەکە دەورووژێنێ.

* دەمارگیری ئاراستە و هەڵوێستێکی بێ پاساوە کە تاك تیایدا ئامادەیە لەهەمبەر کۆمەڵە و تاکێکدا بە رێگەیەکی پشتگیریکار یان دژ باوەڕ بهێنێت و رەفتار بکات و هەست بکات.

* کۆمەڵەی رەگەزپەرست/ کۆمەڵێك کەسن خۆیان بەوە هەژمار دەکەن یان خەڵك وەهایان لەقەڵەم دەدات کە لە سیفەتێك یان پتر لەگەڵ خەڵك هاوبەشن یانیش دژن، وەك سیفەتەکانی:

ئاین و رەگەز و زمان و هتد.

* ئاراستەی رەگەزپەرستی: ئاراستەی کەسێکە لەهەمبەر تاکێکی کۆمەڵەکانی رەگەزپەرست کە سەر بەوان نین، یانیش لەهەمبەر گروپێکی کۆمەڵەیەکی دیاریکراوە یانیش لەهەمبەر هەرهەموویانە.

# سەرهەڵدانی ڕەگەزپەرستی

هەرچەندە شتێك هەیە کە پێیدەگوترێت ئامادەیی بۆ ڕەگەزپەرستی، وەلێ ڕەگەزپەرستی شتێکە کە تاك لە دەوروبەرەکەی وەریدەگرێت و فێری دەبێت و شتێکی بۆماوەیی نییە. ڕەگەزپەرستی لەئەنجامی ئەو هەڵوێست و ئەزموونانەوە دەبێت کە تاك وەك دەرەنجامی زنجیرەیەکی کارلێکە کۆمەڵایەتییکان گوزەریان پیادا دەکات، هەروەها دەرەنجامی زنجیرەیەك لەو کارلێکە کۆمەڵایەتیانەیە کە بەنێو تاکەکان و کەسانی دەوروبەریانەوە گوزەر دەکات. توێژینەوەکان ئەوەیان ڕوونکردووەتەوە کە دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی لەلای هەندێ منداڵدا لەتەمەنی سێ چوارساڵیدا سەر هەڵدەدات، چوونکە کاتێ منداڵ دەگاتە تەمەنی سێ ساڵی، دەتوانێ تاکەکانی کۆمەڵەکەی خۆی و تاکەکانی کۆمەڵەکانی دیکە لەیەکتری جیابکاتەوە. هارتلی لە توێژینەوەکەی خۆیدا سێ قۆناغی خستووەتەڕوو کە ڕەگەزپەرستی گوزەری پیادا دەکات:

١. قۆناغی جیاکردنەوە: مەبەست توانای منداڵە بۆ جیاکردنەوەی تاکە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵە ڕەگەزپەرستییەکان.

٢. قۆناغی چوونە نێو دەور: مەبەست لێی ئاوێتەبوون و توانەوەی خودی تاکە لەو کۆمەڵەیەی کە تیایدا دەژیەت و لەگەڵیدا دەبێتە یەك.

٣. قۆناغی هەڵسەنگاندن: لەم قۆناغەدا ئەو کاردانەوانە بەدیاردەکەون کە ئاماژە بە جۆرێك خۆ بەگەورەترزانین یان جۆرێك هەستکردن بە کەموکورتی دەکەن، ئەمەیش

بەپێی ئەو حوکمدانە دەبێت کە منداڵ هەست دەکات کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵەکەی داویەتی.

* لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی رەگەزپەرستی چەند هۆکارێکن پەیوەندییان بە تاك و ئەو هۆکارانەوە هەیە کە لە چوار دەوریدان:

١. **ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە تاکەوە هەیە:** رەگەزپەرستی دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەکی رۆشنبیری و کەلتووری و رۆڵێکی سەرەکی لەسەر بنەمای ئەو پاڵنەرانەدا دەگێڕن کە تاك هەست بە پاڵنەرەکانی تێربوونیان دەکات، لەوانە ئەو دابونەریتانەی کە رەگوریشەیەکی مێژوویی و هۆکاری ئابوورییان هەیە و تاك هەوڵ دەدات پاساو بۆ رەفتارە دوژمنکارەکانی بهێنێتەوە و بیگەڕێنێتەوە سەر ئەو رەگوریشانە.

هەندێك هۆی دیکە هەن وەك هەوڵدانی تاك بۆ وەدیهێنانی پێداویستییەکانی وەك هەستکردن بەوەی کە پێگەیەکی بەرزتری لە خەڵکانی دیکە هەیە یانیش هەستکردن بەوەی لە خەڵکانی دیکە باشترە. هەروەها رەنگە چەند پێداویستییەکی ئابووریش تاك بەرەو رەگەزپەرستی پاڵبدەن، چوونکە رەگەزپەرستی و لێکەوتە رەفتارییەکانی بە تاکی هەندێ کۆمەڵەوە دەنووسێن و دەبنە چەند سیفەتێك کە وایان لێدەکات هاووڵاتیانی پلە نزم بن ئەگەر پلە هەبێت.

هەروەها لکاندنیش رۆڵێکی لەو رەفتارەدا هەیە، رەنگە تاك بۆ خۆ دەربازکردن لەهەستکردن بەو کەموکورتیانەی لە رەفتار و کەسێتییەکەیدا هەستی پێدەکات هانی بدات ئەم کەموکورتیانە بە خەڵکانی دیکەوە بلکێنێت.

**٢. ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە شتەکانی دەوروبەری تاکەوە هەیە:** ڕەنگە تاك بە ژیانکردن لەگەڵ دابونەریت و پێوەرەکان و گشت ئەو کێشمەکێش و بێهیواییانەی تیایدا هەیە ڕۆڵێکی گرنگ لە گەشەپێدان و بڵاوکردنەوەی ڕەگەزپەرستیو دەمارگیریدا ببینێت.

خانەوادە ڕۆڵی لە گەشەپێدانی ئەم ئاراستەیەدا دەبێت، ڕۆڵەکەیشی یان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆیە وەك سرووشبەخشین(تلقین)، یانیش نا ڕاستەوخۆیەو بەهۆی درککردنی ڕەفتار و قسەی دایبابەنەوە دێتەکایەوە کاتێ باس لە تاکەکانی کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان دەکەن، هەروەها هاوسێیەتی و هاوڕێیەتی ڕۆڵی لە گەشەپێدانی ئەم ئاراستەیەدا هەیە، چوونکە منداڵ ئاراستە و بەها و ڕەفتارەکانیان لێ وەردەگرێت و پێیان کاریگەر دەبێت. هەروەها ڕەنگە ئەو هۆکارە ڕامیاریانەی کەوا کۆمەڵگە گوزەریان پیادا دەکات یارمەتیدەری بڵاوبوونەوەی چەند سیفەتێکی دیاریکراو بن و خەڵکی نێو ئەو کۆمەڵگەیە هەوڵ بدەن بە کۆمەڵەیەکی دیاریکراوی بلکێنن، هەندێ هەلومەرجیش هەن کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگە دەبنەوە و تاکەکان تیایدا دەژیەن و دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی، لەوانە:

* هەرچەندە جیاوازی و ناکۆکی لەنێوان ئەو کۆمەڵانەدا هەبێت کەوا کۆمەڵگەیان لێ پێکهاتووە، ئەوا دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی پتر سەرهەڵدەدات و بڵاو دەبێتەوە، چوونکە بوونی چەند کۆمەڵەیەك کە سەر بە نەژاد و ئاین و کەلتووری جۆراوجۆر بن، زەوییەکی بەپیتی گەشەکردنی ڕەگەزپەرستی و دەمارگیرییە.

* توێژینەوەکان ئاماژەیان بەوە کردووە هەرچەندە گۆڕانی کۆمەڵایەتی خێراتربێت ئەوا ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری پتر دەبێت، چوونکە تێکچوونی سیستم و

دەستگەکانی کۆمەڵایەتی و ئەو بەهایانە بەدوای خۆیدا دەهێنێت کە تاك باوەڕی پێیان هەیە، ئەمەیش دەبێتە هۆی دروستکردنی جۆرە نیگەرانی و ناهاوسەنگییەك، لەبەرئەوە تاکەکان وەك هۆکارێکی داپۆشینی نیگەرانییەکەیان و تێکچوونی بەهاکان پەنا دەبەنە بەر دەمارگیری و رەگەزپەرستی.

* نەزانی و نەبوونی دەرفەتەکانی پەیوەندیکردنی نێوان کۆمەڵە جۆراوجۆرەکانی نێو کۆمەڵگە.

* کێبڕکێکردن لە بوارەکانی کار و ترسان لەو شکستەی کە هاوتەریب لەگەڵ کێبڕکێدا دێت، رەنگە ئەو تاکەی لە کێبڕکێ دەترسێت ئەو کەسانە بچەوسێنێتەوە کە رکابەری و کێبڕکێی لەگەڵدا دەکەن، بۆ ئەوەی لە خراپەی کێبڕکێیەکانیان بەدوور بێت.

* سوودوەرگرتنی خراپ (استغلال) دەبێتە هۆی رەگەزپەرستی و دەمارگیری، رەنگە کۆمەڵەیەك دژی کۆمەڵەیەکی دیکە رەگەزپەرستی و دەمارگیری بنوێنن و چەند سیفەتێکیان بخەنە پاڵ کە دەبنە پاساوێك بۆ سوود وەرگرتنی خراپ لەو کۆمەڵەیە، رەنگە خراپ سوود وەرگرتنەکەش ئابووری یان سیاسی و کۆمەڵایەتی بێت.

* رەنگە تاکەکانی نێو زۆرینەیەك بەمەبەستی یەکخستن و بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی زۆرینەکە لەهەمبەر کەمینەکان پەنا ببەنە بەر رەگەزپەرستی و دەمارگیری.

* زیادبوونی قەوارەی کەمینە، هەرچەندە قەوارەی کەمینە پتربێت کێشمەکێشی نێوان زۆرینە و کەمینە پتر دەبێت.

* ئەوە روونبووەتەوە کە ئەو کۆمەڵگەیانەی رێگە بەتاکەکانی دەدات لە چینێکی کۆمەڵایەتیی بچنە چینێکی دیکەوە، دەبێتە هۆی دروستکردنی جۆرە ترسێك لە رکابەری و کێبڕکێ لەهەمبەر ئەو گوزەرکردن و گواسترانەوەیە، رەنگە ئەو تاکەی سەر بە چینێکی کەمترە لەوە بترسێت کەسەکانی دیکە پێی بگەن یانیش شوێن و پێگەکەی داگیر بکەن.

* پێکهێنەرەکانی دەمارگیری و رەگەزپەرستی

١. لایەنی مەعریفی: درککپێکراوەکان و ئەو بیروڕایانەی کە تاك لەهەمبەر کۆمەڵەی دیکە پێکیهێناوە.

٢. لایەنی ویژدانی: هەستوسۆز و هەڵچوونەکانی تاك لەهەمبەر ئەو کۆمەڵانە.

٣. لایەنی ئاراستەگری و خولیایی: بەرەو گرتنەبەری سیاسەتێکی دیاریکراو دەچێت وەك ئەو رێگە و رێبازەی کە دەبێ بەهۆیەوە مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵەکانی دیکە بکات.

## لێکدانەوەی دەمارگیری و رەگەزپەرستی

**یەکەم: بیردۆزی خراپ سوود وەرگرتن (استغلال).**

دەمارگیری و رەگەزپەرستی ئاراستەیەکە چینێکی خراپ سوود وەرگر بە مەبەستی وەسفکردنی گروپێك خەڵك بە کەموکورتی لەنێو کۆمەڵگەدا بڵاویدەکەنەوە، بۆ ئەوەی ئەم چینە بتوانێ بەخراپ سوود لە گروپەکە بگرن. کەسانی سەر بەم بیردۆزە پێیانوایە دەمارگیری و رەگەزپەرستی وەك هۆکارێکی سپیپێستەکان بووە بۆ چەوساندنەوە و خراپ سوود وەرگرتن لە زنجییەکان.

ئەم بیردۆزە پشت بە کۆمەڵێك شیمانە دەبەستێت کە پێیانوایە پەیوەندیی لەنێوان کارلێکی نێوان کەسەکان و ئاستی بەرهەمە پێشبینیکراوەکان هەیە کە دەرەنجامی ئەم کارلێکەیە و ئاقیبەتی ئەم دەرەنجامانە و کاریگەریان لەسەر هێشتنەوە و نۆژەنکردنەوەی ئەو کارلێك و گۆڕانەدا دیاری دەکات، جا بۆ ئەوەی ئەمە روونبکەینەوە، شیمانەی ئەمە دەکەین:

دوو جۆرە کۆمەڵەی دیاریکراو هەن و هەر یەکێکیان باوەڕیان وەهایە کە بەرژەوەندییەکەی پەیوەندییەکی پێچەوانەیی بە بەرژەوەندیی ئەوی دیکەوە هەیە و پەیوەندیی بە هیچ کۆمەڵەیەکی دیکە نییە، جا لەم دۆخەدا تاکەکانی هەر دوو کۆمەڵە دژ بە بەرژەوەندیی و دەستکەوتەکانی کۆمەڵەکەی دیکە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەپارێزن و دەستەبەری دەکەن و دەرفەتەکانی وەدیهێنانی پتر دەکەن. بە واتایەکی دیکە هەر کۆمەڵەیە و هەوڵی کەمکردنەوەی دەرفەتەکانی کۆمەڵەکەی دیکە دەدات بۆ ئەوەی لەسەر حیسابی یەکتری دەستکەوت وەدەستبهێنن، واتا هەر کۆمەڵەیەك ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ پترکردنی دەرفەتەکانی وەدەستهێنانی قازانج لەسەر حسێبی ئەوی دیکە، ئەمەیش بە بناغەیەکی پتەوی ئەو دەمارگیری و رەگەزپەرستییە توندە دادەندرێت کە لە هەر کۆمەڵەیەکدا دژی ئەوی دیکە سەر هەڵدەدات. جا گروپ و کۆمەڵەکەی دیکە هەوڵ دەدات لەسەر حیسابی کۆمەڵە و گروپەکەی دیکە هێزی خۆی بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی بەکاربێنێت ، ئەگەر بێت و هیچ دابونەریت و یاسا و پێوەرێك نەبوو کە رێگە لە سوود وەرگرتنە خراپەکەی بگرێت. توندیی هێزی دەمارگیری و رەگەزپەرستی لەنێوانیدا بەندە بە بەراوردکردنی هەر یەکێکیان، ئاستی بەراوردکاریەکەش وەها پێناسە دەکرێت: ئەو دەرەنجامەیە کە تاك پێیوایە مافی خۆیەتی وەدەستیبهێنێت، جا ئەگەر ئاستی بەراوردکاریی هەردوو

کۆمەڵەکە یەکسان بوو، ئەوا توندیی کێشمەکێش و دوژمنایەتی و ڕەگەزپەرستی و دەمارگیرییەکە پتر دەبێت، ئەگەر جیاوازیەکەش لەنێوانیاندا زۆر بوو، کێشمەکێش و دوژمنایەتی و ڕەگەزپەرستی و دەمارگیرییەکە کەمتر دەبێتەوە. ڕەنگە هەر ئەمەیش بێت کە لێکدانەوە بۆ لاوازیی هێزی ڕەگەزپەرستیی نێوان ئەمریکییە ڕەشپێستەکان و سپیپێستەکان دەکات کاتێ داواکارییەکانی ڕەشپێستەکان نزم بوو، داواکاریی سپی پێستەکانیش زۆر بەرز بوو، جیاوازیی نێوانیشیان گەورە و بۆشایی نێوانیشیان فراوان بوو، بەڵام کاتێ ئاستی بەراوردکارییەکە لەلای ڕەشپێستەکان زۆر بوو، بووە هۆیی توندتربوونی ئاستی ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری و دوژمنایەتی، ڕەنگە ئەم بیردۆزە یارمەتیدەری شیکردنەوەی زۆرێك لە جۆرەکانی ڕەگەزپەرستی و دەمارگیریی سروشتی و نەژادپەرستی بێت.

بەپوختی، ئەم بیردۆزە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی لە ئەنجامی پەیوەندیی نێوان کارلێکی کەسەکان و ئاستی دەرەنجامە پێشبینیکراوەکانی ئەم کارلێکە دەبێت، ئەمەیش واتاکەی ئەوەیە کە هەردوو کۆمەڵەی دژبەیەك و کێشمەکێشدار بۆ پتر کردنی دەرفەتەکانی وەدیهێنانی دەستکەوتەکانی لەسەر حسێبی لایەنەکەی دیکە ئەوپەڕی هێز و هەوڵی خۆیان دەخەنە گەڕ.

### دووەم: بیردۆزی شارستانیەتی (بە شارستانیبوون)

ئەم بیردۆزە بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەنگاونانی خەڵك لە ژیانی گوندییەوە بۆ ژیانی شار، جۆرەها ترس و نیگەرانی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، چوونکە ژیانی شارستانی لە ژیانی گوندی ئاڵۆزترە و بۆ گەیشتن بە ئاستێکی گونجاوی ژیان هەوڵ و کێبڕکێیەکی زۆرتری گەرەکە، هەروەها ئەو ترسەشی تیادایە نەگەینە ئەو ئاستەی کە ژیانی شارستانی لێمانی دەخوازێت و دەترسین لە گەیشتن بەم ئاستە شکست بهێنین و ڕقمان لە هەموو ئەو کەسانەش دەبێتەوە کە شکستیان هێناوە، چوونکە ئەو

ڕۆڵـەمان وەبیردێنێتـەوە کـە ڕەنگـە ئێمـەش شکـستی تیـادا بهێـنین، لەبەرئـەوە سەرکەوتنمان پێویستی بە کێبڕکێ و بێنەبەردە و هەوڵێکی دەروونـی و جەسـتەیی زۆر شـەکەتکەرەوە هەیـە، بۆیـە ڕقمـان لـەو ئاسـتە دەبێتـەوە و ڕقمـان لـەو کەسـەیش دەبێتەوە کە وەك دەرەنجامێك پێیگەیشتووە.

## سێیەم: بیردۆزی بێهوابوون یان قۆچی قوربانی

ئەم بیردۆزە بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەمـارگیری و ڕەگەزپەرستی دەرەنجامی بێهـوایی و قوربـانیبوونی کەسـە خـاوەن ئاراسـتەکەیە، چـوونکە ژیـانی خـەڵك لـەم سەردەمەدا تەژییە لە بێهیواییەکان، ئەمەیش وادەکات خۆزگە و ئاواتەکانی نەینەدی و تاك نەتوانێ پێداویستییەکانی دەستەبەر بکـات. زۆربـەی جاریش بێهیوابـوون دەبێتـە هۆی پەیدابوونی ڕەفتاری دوژمنکارانە و تاك ناتوانێ دوژمنایەتییەکەی ئاراسـتەی ئـەو وروژێنەرانە بکات کە بووەتە هۆی وروژاندنی خولیـا و ئاراسـتە دوژمنکاریـەکانی، بۆیـە لەڕێگەی کردەی گۆڕین و وەرچـەرخاندنەوە دوژمنایەتییەکـەی ئاراسـتەی تاکەکەسـی گـروپ و کەمینـەکان دەکـات، جـا دەمـارگیری و ڕەگەزپەرسـتی بـەپێی ئـەم بـیردۆزە دەرەنجامی لکاندنی کەموکورتی و هەستکردن بە گوناهی تاکە بـەو خەڵکانـەی کـە بـە قۆچی قوربانی دادەندرێن.

بێهوابوون/هەستکردن بە بێهوایی بەهۆی شکستهێنان لە شتێکی دیاریکراو.

دەستەپاچەیی کەسی بێهیوا لە کاردانەوە لەهەمبەر سەرچاوە ڕاستەقینەکە.

دوژمنایەتی و ڕەگەزپەرستی و حەزی گوزارشتکردن لە بێهواییەکە.

گشتاندنی ڕەگەزپەرستی و دوژمنایەتییەکە بەسەر تاك و کۆمەڵێکی دیکە .

## چوارەم: بیردۆزی دەوروبەر

ئەم بیردۆزە بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی ئاراستەیەکە منداڵ فێری دەبێت و وەریدەگرێت، منداڵ فێری ئەوە دەبێت لە کۆمەڵگەکەیدا چەندان گروپی جۆراوجۆر هەن، هەروەها فێری ئەوەش دەبێت کە سەر بە گروپ و کۆمەڵەیەکی دیاریکراوە و فێری ئەوەش دەبێت کە هەر گروپە و سیفەتی تایبەت بەخۆی هەیە و لەسەری پێویستە لەهەمبەر ئەو گروپانەدا ڕەفتاری دیاریکراو بکات و ڕەزامەندی و پەسندکردنی کۆمەڵەکەی وەدەستبهێنێت، جا ئەگەر کۆمەڵەکەی خۆی دژی کۆمەڵە و گروپێکی دیکە دەمارگیر و ڕەگەزپەرست بوو، لەسەری پێویستە دەمارگیر و ڕەگەزپەرست بێت چوونکە گونجان لەگەڵ ڕەوتەکانی کۆمەڵەکەی خۆی کارێکی گرنگە. بەم شێوەیە دەمارگیری و ڕەگەزپەرستیی تاک تەنها ڕەنگدانەوەی ئەو شتانەیە کە تاک لەکاتی گەشەکردنیدا فێری بووە.

## پێنجەم بیردۆزی فینومینۆلۆژی

ئەم بیردۆزە لە لێکدانەوەی ڕەگەزپەرستیدا بە ڕەچاوکردنی گشت ئەو هۆکار و هێزانەی کاریگەرییان لەسەر هەڵوێستەکانی ئێستەدا هەیە پشت بە بنەماو بناغەی شارەزایی و ئەزموونی ئێستە ئەو هەڵوێستە دەبەستێ کە تاک پیایدا گوزەر دەکات،چوونکە ڕەفتاری تاکێك لە هەڵوێستێکدا پشت بە درککردنی دەبەستێت لەهەمبەر ئەو هەڵوێستەدا و لە دیاریکردنی درککردنی هەڵوێستێکیشدا چەند ڕاستییەکی بابەتی کاریگەری و ڕۆڵ و دەستەوەردانیان هەیە، جا لەسەر ئەم بنەمایەدا ڕەنگە تاکێك هێرش بکاتە سەر کۆمەڵەیەك یان ئەندامێکی کۆمەڵەیەکی دیاریکراو، چوونکە بە هەڕەشە و ورووژێنەری نیگەرانی و ڕقی خۆی لەقەڵەمی دەدات، یانیش

سیفەتی ناپەسندی لێدەبینێت. زۆر جاریش تاك لەبەر هەبوونی هەندێ رەفتار ئەم ئاراستەیە هەڵدەبژێرێ کە بەڕاستی رق و کینە و بێزراندن دەوروژێنێ، یانیش چەند هۆکارێکی خودی هەیە کە پەیوەندییان بە کەسە دەمارگیرەکە هەیە و کاریگەریی لە درککردنەکەی دەکات و وەهای لێدەکات شتی وەها لەو کەسانەدا ببینێت کە رق و قێزهاتنەوەی دەجولێنن یانیش هەردوو هۆکار بەیەکەوە کاریگەرییان دەبێت.

بۆنموونە: ئەمریکییەکی سپیپێست لە بواری کۆمەڵایەتیدا کەسێکی جوولەکە بە قوڵبڕ و فێڵاوی و ساختەکار دادەنێت.

## کەمکردنەوەی رەگەزپەرستی و بەرپەرچدانەوەی

١. بەدیارخستنی خراپی و زیانە دەروونییەکانی رەگەزپەرستی.

٢. ئاشنابوون بە هۆ و پاڵنەرەکانی رەگەزپەرستی و گەیشتن بەو راستی و زانیارییانەی کە هەڵەیی ئەم هۆکارانە دەسەلمێنن و لەناوبردنی هۆیەکانی گەشەکردنی رەگەزپەرستی.

٣. بڵاوکردنەوەی بنەمایە دروستەکانی دیموکراسی و بەهاکانی مرۆیی و بنەمایەکانی لێبوردەیی کۆمەڵایەتی.

٤. پەخشکردنی گیانی هاوسۆزیی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە بەهۆی شیاندنی منداڵ لە سەردەمێکی زۆر زووەوە.

٥. بەشدارپێکردنی تاك لە ئەندامیەتی کۆمەڵەیەك کە دژ بە هیچ کۆمەڵەیەکی دیکە رەگەزپەرستی و دەمارگیری تیادا نەبێت.

٦. هاندانی تاك بۆ تێکەڵبوون و پەیوەندیی نێوان کۆمەڵەکان و رەخساندنی دەرفەت لەبەردەم ئەو خەڵکانەی نەژاد و نەتەوە و ئاینی جیاوازیان هەیە بۆئەوەی کارلێکیان لەگەڵ یەکتریدا هەبێت و بتوانن بەیەکەوە بژیەن، چوونکە پترکردنی دەرفەتەکانی کارلێکی نێوان کەسەکان و کۆمەڵەکان، دەرفەتی کەمکردنەوەی دەمارگیری و رەگەزپەرستی پتر دەکات.

★ سەرکردەیی

★ چەمکەکەی.

★سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی.

★ بیردۆزەکانی سەرکردایەتی.

★ جۆرەکانی سەرکردایەتی.

★ راهێنان لەسەر سەرکردایەتی

# چەمکی سەرکردەیی

چەمکی سەرکردەیی وەها پێناسەی بۆ دەکرێت کە هونەری کاریگەری دروستکردنە لەسەر کەسەکان و ئاراستەکردنیانە بەشێوەیەك لەپێناو گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو گوێڕایەڵی و ڕێزیان وەدەستبێنێ. یانیش هونەری هەماهەنگی دروستکردنە لەنێوان تاك و کۆمەڵەکان و هاندانیانە بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی خواستراو.

هیمان پێیوایە تاك بەهۆی سەرکردایەتیەوە دەتوانێ ئاراستەکاری و کاریگەری دروستبکات و هزر و هەست و ڕەفتاری کەسان بەرزەفت بکات. تۆماس گۆردنیش پێیوایە کە سەرکردەیی ئەرك و شەقڵ و تایبەتمەندییەکە کە بە ئەزموون و فێربوون وەدەستدێت.

# سەرکردەیی و سەرۆکایەتی

# Leader Ship and presidency

**یەکـــەم: ســـەرۆکایەتی لەســـەر بنـــەمای سیـــستم دادەڕێـــژرێت و دەرەنجـــامی دانپێدانانی تاکەکانی کۆمەڵەیەك نییە.**

* سەرۆك بەپێی بەرژەوەندییەکانی ئامانج هەڵدەبـژێرێت، واتـا خـودی کۆمەڵەکـەی ئامانجەکە دیاریی ناکەن.

* ســـەرۆکایەتی بـــە کەمـــە هەستوســـۆزێکی هاویـــەش و کـــاری کـــەمی هاویـــەش دەناسرێتەوە.

* دوورییەکی گەورەی کۆمەڵایەتی لـەنێوان سـەرۆك و ئەنـدامانی کۆمەڵـەدا هەیـە و سەرۆك هەوڵدەدات بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی وەك هۆکارێك بـۆ ناچـارکردنی کۆمەڵـە بەکاری بهێنێ..

* سەرچاوەی دەسەڵاتی سەرۆك لە دەرەوەی کۆمەڵەوەیە.

**دووەم: سەرکردایەتی، سەرکردایەتی لەنێو کۆمەڵەوە دروستدەبێت.**

* کردەی کێبڕکێکردن لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵەوە لە پێش سەرکردایەتی دێت.

* کۆمەڵە دەستنیشانی ئامانجەکان دەکات نەك سەرکردە.

* کارلێکی نێوان سەرکردە و شـوێنکەوتووانی زۆر بـەهێزە و مـەرجێکی سـەرەکیی سەرکردایەتیکردنە.

* دەسەڵاتی سەرکردە لە دەستی کۆمەڵەدایە و هەر ئەوان هەڵیدەبـژێرن و شـوێنی دەکەون.

# ڕەفتاری سەرکردەییانە

گشت لێکۆڵینەوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ڕەفتاری سەرکردەییانە لەو کردار و ڕەفتارانەدا بەدیاردەکەوێت کەوا سەرکردە ئەنجامیان دەدات، لە ڕووی وەزیفیشەوە وابەستەی ئەمانەی لای خوارەوەیە:

- وەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی کۆمەڵە.
- نۆژەنکردنەوە و مشتومالْکردن و پاڵپشتیکردنی یەکگرتوویی و هێزی کۆمەڵە.

ڕەفتاری سەرکردەییانە ئاراستەی وەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی کۆمەڵە دەکرێت بۆ:

- پێشکەشکردنی پێشنیارە کردارییە بونیادنەرەکان.
- هەڵسەنگاندنی کاری کۆمەڵە و ڕەچاوکردنی پێشکەوتنەکەی لەهەمبەر ئامانجەکاندا.
- ڕێگرتن لە گشت ئەو کارانەی سوود بە ئامانجەکان نابەخشن.
- پێشکەشکردنی ئەو چارەسەرانەی کە بەشدارن لە وەدیهێنانی ئەو ئامانجانە.

بەڵام ڕەفتاری سەرکردەییانەی ئاراستەکراو بەرەو پاراستنی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵەدەچێت و گشت ئەو شتانە دەگرێتەوە کە پێداویستییەکانی کۆمەڵەکە دەهێننەدی، وەك:

- هاندان و دنەدانی ئەندامان.
- کەمکردنەوەی توندیی ئەو گرژییەی کە ڕەنگە بەهەر هۆیەك لە هەر کۆمەڵەیەکدا سەر هەڵبدەن.

- رەخساندنی دەرفەت بۆ گشت ئەندامانی کۆمەڵە بۆ ئەوەی گوزارشت لە راوبۆچوونی خۆیان بکەن.

گرنگترین تایبەتمەندییەکانی رەفتاری سەرکردەییانەش ئەمانەن:

١. دەستپێشخەری و داهێنان و بەردەوامی و بەرتەمایی (طموح): کۆمەڵە چاوەڕوانیان لە سەرکردە هەیە کە لە گشت ئەندامەکانی کۆمەڵەکە پتر دەستپێشخەریی لە کار هەبێت و بۆ داهێنان و ئافراندن لە هەڵوێستەکانی کۆمەڵایەتیدا لەهەموویان بەتواناتر بێت و بەردەوامی و بەرگەگرییەکەی لەهەمووان پتر بێت.

٢. کارلێکی کۆمەڵایەتی:کۆمەڵە ئەو چاوەڕوانییەیان لە سەرکردە هەیە کە لە کارلێکی کۆمەڵایەتیدا لە گشت ئەندامانی دیکەی کۆمەڵە بەشداریی و چالاکیی پتر بێت.

٣. بەرزەفتکردن: رەنگە سەرکردە لە کەسانی دیکە پتر حەز بە بەرزەفتکردن و پایەبڵندی و بەرزیی پێگەی کۆمەڵایەتی بکات و پتر دەسەڵات و هێزی لەبەر دەستدا بێت.

٤. نوێنەرایەتیکردنی دەرەکیانەی کۆمەڵە: سەرکردە وەك نوێنەرێکی دەرەکیی کۆمەڵە لە کۆمەڵەکانی دیکە و تاکەکانی دیکەی دەرەوەی کۆمەڵەکە نوێنەرایەتیی کۆمەڵەکەی دەکات.

٥. پەیوەندییەکانی گشتی: سەرکردە بەرزەفتکەرێکی پەیوەندییە گشتییە ناوەخۆییەکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەیە، ئەمەیش بۆ راگرتنی یەکگرتوویی نێوانیانە.

٦. کامڵبوون: سەرکردە کار بۆ وەدیهێنانی کامڵبوونی کۆمەڵایەتی نێو کۆمەڵەکەی دەکات و هەوڵ دەدات گرژی و ناکۆکییەکان کەم بکاتەوە و کۆمەڵەکە لەیەکتری نزیک بکاتەوە.

٧. پلاندانان و سیستەم و ڕێکخستن: پلاندانان بۆ رەفتاری کۆمەڵایەتییانەی کۆمەڵەو ڕێکخستنی رەفتارەکە و ڕێکخستن و ئاراستەکردنی راکێشانی بیرکۆیی (ترکین)ی کۆمەڵە لەسەر ئامانجەکان.

٨. راگەیاندن: بەخشینی زانیاری بە ئەندامانی کۆمەڵەکەی لەهەمبەر راستیی پرسەکان و دواتریش زانیارییەکان دەگەنە ئەندامانی کۆمەڵە و لەوانیشەوە دەگاتە کۆمەڵەی دیکە.

٩. پەسندکردن و دانپێدانانی دوو لایەنە لەنێوان سەرکردە و شوێنکەوتووان: گوزارشتکردن لەو پەسندکردنە و رەچاوکردنی هەستوسۆزی خەڵکان، دەبێ ئەمە بە رەفتار پیشان بدات.

١٠. هەماهەنگیی دەروونی کۆمەڵایەتی: جێگیری و پایەداری و سەنگینی و کاریگەرنەبوون بە رەخنە و قبوڵکردنی رەخنە بە سینگێکی کراوە و دانان بە هەڵە و دەستپێشخەریکردن بۆ چاککردنەوەی هەڵەکان دەگرێتەوە.

کاریگەریی کۆمەڵە لەسەر رەفتاری سەرکردەی سەرکەوتوو لەمانەی خوارەوەدا بەدیار دەکەوێت:

١. کارلێکی کۆمەڵە لەگەڵ سەرکردە و یارمەتیدانی بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلان و تەگبیرانەی کەوا کۆمەڵەکە دەگەیەننە ئامانجە خواستراوەکەی.

٢. بەکارهێنانی کارامەیی لە وروژاندنی گرنگیدانی سەرکردە، ئەمەیش یارمەتیدەری سەرکەوتن و وەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵەکەیە.

٣. درککردنـی کۆمەڵـە بـە هەڵـە و لایەنـە کەموکورتیـدارەکانی بۆنـەوەی کۆمەڵـە بەکارامەییەوە بتوانێ کەموکورتییەکەی پڕبکاتەوە، ئەمەیش هەر لەپێناو وەدیهێنـانی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵەیە.

٤. لەسـەر کۆمەڵـە پێویـستە بـەخۆیان پرسـە سـادەکان چارەسـەربکەن و بـاری سەرشانی سەرکردە سووک بکەن.

# بیردۆزەکانی سەرکردەیی

**یەکەم: بیردۆزی تایبەتمەند و شەقڵەکان Trait Theory**

لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە سەرکردەیی جەختیان لەسەر شرۆڤەکردنی کەسێتی و تایبەتمەندییە جەستەیی و ئەقڵی و هەڵچوونی و کۆمەڵایەتییەکانی کردووەتەوە. ئەم بیردۆزە لەسەرەتادا وەها سەریهەڵدا کە پێیوابوو سەرکردەیی تایبەتمەندییەکی یەکگرتوو (موحدە) و سەرکردەکان لەهەر کوێیەك بن ، بەبێ رەچاوکردنی جۆری سەرکردە و هەڵوێست و رۆشنبیری و کەلتوورە جیاوازەکانیان پێی دەناسرێنەوە ، بەڵام ئەم بیردۆزە لە بەرانبەر ئەو واقیعەدا خۆی نەگرت کە پێیوایە چەندان جۆرە سەرکردایەتی لە رۆشنبیری و کەلتووری جۆراوجۆردا سەرهەڵدەدەن، راستە کە چەند تایبەتمەندییەکی هاوبەش هەیە کە لەنێو گشت سەرکردەکاندا باوە، بەڵام بەڵگەکان ئاماژە بەوە ناکەن کە سەرکردایەتی تایبەتمەندییەکی هاوبەش بێت.

دەرەنجامی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکان بریتی بوون لەچەند لیستێکی تایبەت بە تایبەتمەندییە باشەکانی سەرکردە، لەوانە:

١. **تایبەتمەندییەکانی جەستەیی:** سەرکردەکان لە شوێنکەوتووەکانیان باڵایان درێژترە، و کێشیان قورسترە و ئەگەر ئامانجیشیان جەنگ بێت بەهێزترە، هەروەها لە شوێنکەوتووەکانیان چالاکتر و سەرزندەترن.

٢. **تایبەتمەندییەکانی ئەقڵیی مەعریفی:** سەرکردەکان بۆ پێشبینیکردنی شتە کتوپڕەکان و خۆ ئامادەکردن لەهەمبەریان و لە رووی زیرەکیی گشتییەوە لە شوێنکەوتووانیان زیرەکتر و رۆشنبیرتر و پڕ زانیاریتر و دووربینتر و بەتواناترن، بەشێوەیەکی باشتریش رەفتار لەگەڵ شتە کتوپڕەکان دەکات و لە رووی درککردن و

بیرکردنەوە ئاستی بەرزترە و لەرووی ڕەوانبێژی و بەدەمودوویی ئاستی بەرزترە و و بەشێوەیەکی باشتر حوکم لەسەر مەسەلەکان دەدات و لە بڕیارداندا خێراترە.

٣. **تایبەتمەندییەکانی هەڵچوونی:** سەرکردەکان لەرووی هەڵچوونی و پێگەیشتنی هەڵچوونی و هێزی ئیرادە و متمانەبەخۆکردن و بەرزەفتکردنی خودەوە دەناسرێنەوە.

٤. **تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵایەتی:** گیانی هاوکاری هەیە و گیانی مامەڵەکردن لەنێو شوێنکەوتووانیدا پەرە پێدەدات و توانای هەیە لەگەڵ کۆمەڵە هاوکاری بکات ، نوکتەباز و قسە خۆشە و بۆ پاراستنی ئەندامانی کۆمەڵە و ڕەچاوکردنی هەستوسۆزیان و بەدەستهێنانی متمانەیان و دروستکردنی متمانە بەخۆکردن لەنێو دەروونی ئەنداماندا بەتواناترە. سەرکردە لەگشت ئەندامانی دیکە پتر حەزی لە بەشداریکردنی ئەرێیە لە چالاکییەکانی کۆمەڵایەتیدا و بەتواناترە بۆ دروستکردنی گیانی بەرزی مەعنەوی لە کۆمەڵەدا و کارامەترە لە پاراستنی.

٥. **تایبەتمەندییەکانی گشتی:** کەسێکی خاکییە و پابەندی بەهاکانی ڕوحی و مرۆیی و پێوەرەکانی کۆمەڵایەتییە و کارزانەو شارەزایی تەواوی هەیە و گیانی شانازیکردنی هەیە و دەستپاك و داوێنپاکە و پارێزگاری لە کات دەکات.

گرنگترینی ئەو بیرۆکە سەرەکییەی کە دەتوانین لە بیردۆزی تایبەتمەندییەکاندا بەدەستی بهێنین ئەوەیە کە شێواز و مۆرکێکی نەگۆڕ نییە گشت سەرکردەیەك لە گشت کات و شوێنێکدا پێی بناسرێنەوە و تیایدا هاوبەش بن.

## دووەم بیردۆزی وەزیفی Functionak Theory:

بەپێی ئەم بیردۆزە سەرکردەیی ئەنجامدانی ئەو ئەرکە کۆمەڵایەتیانەیە کە یارمەتیدەری کۆمەڵەیە بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی. لێرەدا وەها لە سەرکردەیی

دەنواردرێت کە ئەرکێکی رێکخستنکارییە. کەسانی سەر بەم رێبازە گرنگیی بەو پرسیارە دەدەن: چۆن ئەرکە سەرکردەییەکانی نێو کۆمەڵە دابەش دەکرێت؟ رەنگە دابەشکردنی ئەرکە سەرکردەییەکان بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوان بێت و دیاریکراو و تەنگەبەریش بێت بە ئاستێك کە گشت ئەرکێکی سەرکردەیی لەیەك کەسدا کۆ دەبێتەوە ئەویش سەرکردەیە. گرنگترین ئەرکەکانی سەرکردەی کۆمەڵەیەکیش ئەمانەن:

* پلاندانان: پلاندانان بۆ ئامانجەکانی دوور مەودا و نزیك مەودا.

* دانانی سیاسەت: سەرکردە لە چوارچێوەیەکدا دەجولێت کە تیایدا ئامانجەکان لە سێ سەرچاوەوە دیاریی دەکرێن:

– سەرچاوەکانی سەروو: لە دەسەلاتە بالاکانی کۆمەڵە هەروەك دۆخی کۆمەڵەکانی سەربازی.

- سەرچاوەکانی خواروو: لە بریاری کۆی ئەندامانی کۆمەڵە پێکدێت.

- لە خودی سەرکردەوە: کاتێ دەسەلاتی بالا و خودی کۆمەڵەکە رێگەی پێدەدەن سیاسەتەکان دابنێ.

* ئایدۆلۆژی: لە زۆربەی کاتەکاندا وەك سەرچاوەی هزر و بیروباوەڕ و بەهایەکانی کۆمەڵە کاردەکات.

* شارەزایی و ئەزموون: سەرکردە وەك شارەزا و پسپۆڕ و سەرچاوەی شارەزایی هونەری و کارگێڕی و زانیاریی کۆمەڵە دادەندرێت.

* بەڕێوەبردن و جێبەجێکردن: جوولاندنی کارلێکی کۆمەڵایەتی و رێکخستنی سیاسەت و ئامانجەکانی کۆمەڵە و چاودێریکردن.

* دادوەر و نێوەنـدکار: سـەرکردە دادوەر و نێوەنـدکاریی لەهەمبـەر گـشت ئـەو کێشمەکێش و بێنەوبەردانەدا دەکات کە لەنێو کۆمەڵەدا دێنەکایەوە.

* پاداشـت و سـزا: سـەرکردە سەرچـاوەی پاداشـت و سـزایە، ئەمـەیش یارمـەتیی ڕێککاری و هەماهەنگیی نێو کۆمەڵە دەدات.

* نموونە و ئاڵکۆیەکە و چاوی لێدەکرێت: بۆ ئەندامانی کۆمەڵەکەی نموونەی بـاڵای ڕەفتاری جوانە.

* سیمبوڵی کۆمەڵەیە: سیمبوڵ و بەردەوامییەکەی لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی.

* وێنەی باوکە: هێمای یەکبوون و چوونە نێو دەورە.

## سێیەم: بیردۆزی هەڵوێستی Sitnational Theory

ئەم بیردۆزە وەها لەو ئەرك و ڕەفتارە دەنوارێت کە گوزارشتی لێدەکات و تـاك لـە هەڵوێـستێکی دیـاریکراودا ئـەنجامی دەدات بـەوەی کـە خـودی سـەرکردایەتییە. ئـەم بیردۆزە ئاماژە بەوە دەکات کە ئەندامی کۆمەڵە ڕەنگە ببێتە سەرکردەشـی، بەتایبـەت لـەو هەڵوێـستەی کـە تیایـدا دەتوانێـت چـەند ئـەرکێکی سـەرکردەیی ئـەنجام بـدات بەشێوەیەك لەگەڵ خودی هەڵوێستەکەدا بگونجێت، ئەو تاکەی لە هەڵوێستێکدا دەبێتە سەرکردە مەرج نییە لە هەڵوێستێکی دیکەدا ببێتە سەرکردە.

ئەم بیردۆزە ئاماژە بەوە دەکات کە " سەرکردایەتی پەیوەندیی نێـوان هەڵوێـست و کەسێتیی سـەرکردەیە" و کـەس و هەڵوێـستەکەش لـە کـردەی کارلێـك و ئاوێتەبوونـدا دەبن، ئەمەیش مانای ئەوەیـە هەڵوێـستە جۆراوجۆرەکـان پێویـستیان بـە سـەرکردەی جۆراوجۆر هەیەو هەر یەکێکیان چەند تایبەتمەندیەکیان هەیە ڕێگەیان بـۆ خۆشـدەکات سەرکردایەتی هەڵوێستێك بکەن کە لە ڕووی پێکهاتە و داواکارییەکانیەوە لەگەڵ ئـەوی

دیکە جیاوازە. هەر لێرەوە دەستەواژەی (پیاوی کاتی گونجاو) سەریهەڵدا و بەهەندێ لەو سەرکردانە دەگوترێت کە لەهەلومەرجی دیاریکراودا بەدیار دەکەون و لە هەڵوێستی دیاریکراودا ئەرکی سەرکردایەتیکردنی کۆمەڵەکان بە سەرکەوتوویی دەگرنە ئەستۆ و سەرکردایەتیکردنەکەیش لەگەڵ توانا و ئامادەییەکانیاندا دەگونجێت.

## چوارەم بیردۆزی کارلێککردن Ineractional Theory

ئەم بیردۆزە لەسەر بنەمای کاملکردن و کارلێکی نێوان گشت گۆڕاوە سەرەکییەکانی سەرکردایەتی بونیاد نراوە کە ئەمانەن:

- سەرکردە و کەسێتی و چالاکییەکەی لە کۆمەڵەدا.
- خودی کۆمەڵەکە خۆی و بونیاد و پەیوەندیی نێوان تاکەکانی و تایبەتمەندی و ئامانجەکانی و سایکۆلۆژیای کۆمەڵە.
- ئەو هەڵوێستانەی کە هۆکارە ئابوورییەکان و هەلومەرجی کار و سروشتەکەی دیارییان دەکات. ئەمەیش پشت بە کارلێکی سەرکردە لەگەڵ شوێنکەوتووان و درککردنی سەرکردە بۆ خودی خۆی و درککردنی سەرکردە لەلایەن شوێنکەوتووانی و درککردنی جەماوەر لەلایەن سەرکردەوە و کارلێکی کۆمەڵایەتی دەبەستێ.. هەروەها سەرکەوتنی سەرکردە بەندە بە توانای کارلێککردنی لەگەڵ شوێنکەوتووانی و وەدیهێنانی ئامانجیان و چارەسەرکردنی گرفتەکانیان.

## پێنجەم: بیردۆزی پیاوی مەزن (سرووش) Great Man Theory

کەسانی سەر بەم بیردۆزە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هەندێ پیاوی مەزن لە کۆمەڵگەدا بەرجەستە دەبن و بەدیاردەکەون، ئەمەیش لەبەر توانا و بەهرە مەزنەکانیان و تایبەتمەندی و بلیمەتییە نائاساییەکەیانە کە وایان لێدەکات ببنە

سەرکردە، جا ئەو هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەی رووبەرووی دەبنەوە هەر جۆرێك بێت.
ئەم بیردۆز پێیوایە سەرکردە هێزی بەکێشکردنی کەسییانەی هەیە و کۆمەڵە وەك کەسێکی میسالی لێی دەنواڕن کە هێزێکی هەیە و لە هەڵەکردن بەدوورە و پەیوەندییان لەگەڵیدا لەسەر بنەمای پشتگیریکردنی تەواوە و دەبنە لایەنگری سەرسەختی و هەر ئاماژەیەکی سەرکردە بۆیان دەبێتە فەرمانێك کە دەبێ جێبەجێ بکرێت.

## سەرکردە و شوێنکەوتەکانی

جیاوازیی نێوان سەرکردە و شوێنکەوتەکانی جیاوازییە لە پلەدا نەك لە جۆردا، دەتوانین شوێنکەوتەکان بە پێگە و بنەمای دروستکردنی سەرکردەیی دابنێین، ئەمەیش لە دوو لایەندا:

١. سەرکردە بەبێ بوونی شوێنکەوتە بوونی نابێت.

٢. سەرکردایەتی لە رێگەی درککردنی تاکی کۆمەڵەکانە بەوەی کە ئەو کارەی یەکێکیان ئەنجامی دەدات کاریگەریی ئەرێیی لە پێشکەوتنی کۆمەڵەدا هەیە بەرەو وەدیهێنانی ئامانجەکانی و دواتر وەك سەرکردەیەك هەڵیدەبژێرن.

شوێنکەوتەکان لە کارلێکی کۆمەڵایەتی پێگەیەکی بەرزو قورساییەکی زۆریشیان لە پەیوەندییە ئاڵۆزکراوەکانی نێوان سەرکردە و شوێنکەوتەکانیدا هەیە و لە پەیوەندیی نێوان هەر دوو لادا ڕووندەبێتەوە و لەمیانی کارلێکی کۆمەڵایەتی و دیاریکردنی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و رۆڵی هەر یەکە لە سەرکردە و شوێنکەوتەکانی دیاریی دەکرێت، ئەم پەیوەندییە دابیابیە جا ئەگەر خۆشەویستیش تیایدا کەم و دەگمەن بێت و ترسیشی زۆر بێت پەیوەندییەکە (زۆر داپڵۆسێنەر) دەبێت، ئەگەر خۆشەویستییەکە زۆربێت و ترسەکەش کەم بێت پەیوەندییەکە (بێگەرد) دەبێت.

# جۆرەکانی سەرکردایەتی و کەشی کۆمەڵایەتی

چەندان جۆری سەرکردایەتی هەن کە جۆراوجۆرن و بە جیاوازبوونی پەیوەندیی نێوان سەرکردە و شوێنکەوتەکانی دەگۆڕێن.

**یەکەم: سەرکردایەتیی دیموکراتیانە Democratic Loadership**

سەرکردایەتیی دیموکراسی لەسەر بنەمای رێزگرتنی کەسێتیی تاك و ئازادیی لە هەڵبژاردن و باوەڕپێهێنان و بڕیاری کۆتایی زۆرینە و مومارەسەکردنی زۆرترین رێژەی ئاراستەکردن و بەرگەگرتنی بەرپرسیاریەتی و خۆگری و مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵك بەشێوەیەکی بەڕێزانە بونیاد نراوە. سەکردەیش بۆ ژیانێکی باشتر کار بۆ چاکترکردنی دەرفەتەکانی خەڵکانی دیکە دەکات. سەرکردەی دیموکراسی گفتوگۆیە بەکۆمەڵەکان هان دەدات و یارمەتیی کۆمەڵە دەدات بۆ بڕیار دان لەسەر دانانی سیاسەتەکان، چوونکە راوێژ پێشکەش دەکات کاتێ پێویستی بەوە هەبێت و هەنگاوەکانی جێگرەوە بەدیاردەخات کە دەتوانرێ بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکان بهاوێژرێن.

**دووەم: سەرکردەی دیکتاتۆری Autocratic Leadership**

لەسەر بنەمای راوبۆچوون سەپاندن بونیادنراوە و شێوازەکانی داسەپاندن و ناچارکردن دەگرێتە بەر و رێگە بەهیچ گفتوگۆ و تێگەیشتنێك نادات و لەسەر بنەمای ئاراستەکردنی خەڵکان بە دەرکردنی بڕیارەکان وەستاوە. سەرکردەی دیکتاتۆری و خۆسەپێن تاکە بڕیار بەدەستە لەوەی کە خەڵك چی بکات و چی نەکات و لەکوێ و کەی ئەنجامی بدات. لە کۆمەڵە دابڕاوە و هیچ پەیوەندییەکی مرۆیی بە کۆمەڵەکەی نابەستێتەوە. ئەم جۆرە سەرکردەییە دەبێتە هۆی توندکردنی دەسەڵات و رێکوپێکی

لە کار و پترکردنی بەرهەم، بەڵام رەنگدانەوەیەکی نەرێیی بەسەر کەسێتیی تاکەکان و دروستکردنی هەستوسۆزی دوژمنکارانە و یاخیبووندا هەیە.

## سێیەم: سەرکردەی بێسەروبەر (بەهەراوزەنا) Laisses Fair Leadership

سەربەستیی تەواو بە ئەوانی دیکە دەبەخشێت بەبێ ئەوەی دەست لە کاروبارییان وەربدات. سەرکردەی بێسەروبەر زانیاری دەگەیەنێتە شوێنکەوتەکانی و لە رەفتارکردندا سەرکەوتنی تەواویان پێدەبەخشێت، ئەم جۆرە سەرکردەیە بەوە دەناسرێتەوە کە لەرووی بەرهەمی کارەوە کەمترین بەرهەمی هەیە، ئەمەیش وەها لە تاک و شوێنکەوتووەکانی دەکات لە رەفتارکردن هەست بە بزربوون و بێتواناییی بکەن و متمانەش بەخۆیان ناکەن.

ئەم خشتەیەی خوارەوە گرنگترین لایەن و روخسارەکانی جۆرەکانی سەرکردایەتی دیاریی دەکات لە رووی: کەشی کۆمەڵایەتی، سەرکردە، تاکەکان، لەهەمبەر بەجێهێشتنی سەرۆک بۆ شوێنی خۆی و ، رەفتاری کۆمەڵایەتی:

| جۆری سەرکردەیی | سەرکردەیی باوەڕپێهێنەری دیموکراسی | سەرکردایەتیی دیکتاتۆری یان ناچارکەر داپڵۆسێنەر و ئۆتوکراتی. | سەرکردایەتی فەوزەوی (بێبەندوبار)سەربەستیی رەها |
| --- | --- | --- | --- |
| کەشی کۆمەڵایەتی | وەدیهێنانی پێداویستییەکانی هەریەکە لە سەرکردە و خەڵکی تیادا باوە/ | دیکتاتۆری و دەستبەسەرداگر و داپڵۆسێنەر و ناچارکەرە. | بە هەراوزەنایە (بێ بەندوبارە)چوونکە تاکەکانی کۆمەڵ و سەرکردە سەربەستیی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | ڕێزگرتنی دوولایەنە بۆ مافەکان هەیە/ سیاسەتەکان لەئەنجامی گفتوگۆی بەکۆمەڵەوە دیاری دەکرێن/ بەرپرسیاریەتی و کارەکان لەسەر بڕیارێکی بە کۆمەڵەوە دابەش دەکرێن. | | تەواوی بێ کۆتوبەندیان هەیە. |
| سەرکردە | بەشداری لە گفتوگۆیەکانی کۆمەڵە دەکات،لەگفتوگۆیەکانیاندا هانی کۆمەڵەکەی دەدات و ئاراستەیان دەکات و زانیاری دەبەخشێتە ئەندامەکانی لەهەمبەر هەنگاوەکانی کار و ئەو ئامانجەی هەوڵی وەدیهێنانی دەدەن سەرکردە دیارییان دەکات، سەربەستیی دابەشکردنی کار دەداتە ئەندامان و لە ستایشکردن و ڕەخنەگرتنیشدا بابەتییە و هانی ڕەخنەگرتن دەدات. | تەنهاخۆی دەستنیشانی سیاسەتەکان دەکات ، هەنگاوەکانی کار و لایەنەکانی چالاکی و جۆری ئەو کارە دیاریی دەکات کە تایبەتە بە هەر تاکێک، بەشێوەیەکی کرداری بەشداری لە کاری کۆمەڵە ناکات تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە کارێک وەک نموونە دەخاتە ڕوو، چەندان فەرمان دەردەکات دژی حەزی کۆمەڵە دەوەستێتەوە، هەر خۆی تەوەری سەرنج و گرنگیدانی کۆمەڵەیە و گرنگیی بە هێشتنەوەی گوێڕایەڵیی ئەندامانی کۆمەڵە دەدات. | بێلایەنە و بەشێوەیەکی زۆر کەم بەشداریی دەکات. و زۆر بەکەمی گیانی هاوکاری پیشان دەدات و لێدوانەکانی لەسەر کار ڕووکەشانەیە و هەوڵ نادات ڕەوتی کارەکان ڕێکبخات یان چاکتری بکات و نە ستایشی کەس دەکات نە ڕەخنەش لەکەس دەگرێت. |

| تاکەکان | هەر تاکێك هەست بە گرنگیی بەشداریکردنی ئەرێیانەی خۆی دەکات لە کردەی کۆمەڵایەتیدا، کاتێکیش پێویستیان بە راوێژی هونەری دەبێت، سەرکردە چەندان پێشنیاریان بۆ دەکات و مافی سەربەستیی هەڵبژاردنی هاوکاران و ئەو کارانەیان هەیە کە بەپێی حەز و تواناکانیان هەڵیدەبژێرن، ئەوان گوڕوتاو و پاڵنەریان بۆ کار زۆرە، کۆمەڵەکەیان زۆر یەکگرتوو تەبان و گیانی مەعنەوییان بەرزە. | قۆناغەکانی کار هەنگاو بە هەنگاو جێبەجێ کارەکان دەکات بەشێوەیەك بەهیچ شێوەیەك ناتوانن بزانن هەنگاوەکانی دواتر چین، یانیش پلانەکە تەواوە یان نا، ناتوانن هاوکارانی کاری خۆیان هەڵبژێرن، بەڵکو سەرکردە هاوکارەکانیان بۆ هەڵدەبژێری. | بە سەربەستیی تەواوەوە هاوڕێ و هاوکارانی خۆیان هەڵدەبژێرن. |
|---|---|---|---|
| ئەگەر سەرکردە شوێنی خۆی بەجێهێشت | ئەگەر سەرکردە شوێنی خۆی بەجێهێشت، یان لادرا، ئەوا بەرهەم لە نەبوون و لادرانی سەرکردە و ئامادەبوونیشیدا یەکسانە، هەروەها چالاکیش. | ئەگەر سەرکردە شوێنی خۆی جێهێشت یان لادرا رەنگە ببێتە هۆی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەکەو سستبوونی گیانی مەعنەوی. | ئەگەر سەرکردە لە شوێنی خۆی لادرا یان شوێنی خۆی جێهێشت رەنگە بەرهەم لە نائامادەیی و لادرانیدا یەکسان یان کەمتر یان پتر بێت لەوەی کە ئامادەبێت، ئەمەش بەپێی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | هەلومەرجی کارلێکی کۆمەڵایەتییە. |
| رەفتاری کۆمەڵایەتی | رەفتاری کۆمەڵایەتی بە هەستکردنی دوو لایەنەی هەردوو لا بە متمانە و دۆستایەتی و خۆشەویستیی نێوان تاکەکان و سەرکردە دەناسرێتەوە،هەروەها هەستکردن بە سەقامگیری و حەسانەوەی دەروونی باڵی کێشاوە | بەگیانی دوژمنکارانە و رەفتاری تێکدەرانە و زۆریی کێبڕکێ و رکابەری و ملکەچکردن و نەرێیبوون باوە، تاکەکان هەست بە کەموکورتی و دەستەپاچەیی دەکەن و پتر پشت بە سەرکردە دەبەستن و بێ متمانەیی دوولایەنە لەنێوان تاکەکان لەلایەک و لەنێوان تاکەکان و سەرکردەدا باڵی کێشاوە، هەروەها ماستاوکردن بۆ سەرکردە و رقبوونەوە لەهەمان کاتدا باڵ دەکێشێت، هەروەها هەستکردن بە بێهوایی و بێبەشبوون و نیگەرانی و ناسەقامگیری و توندیی خوو خدە | بەوە دەناسرێتەوە کە متمانەی نێوان تاکەکان لەلایەک و متمانەی نێوان تاکەکان و سەرکردە لەلایەکی دیکەوە مامناوەندییە و بێزاربوون و نیگەرانیش بەپلەیەکی مامناوەندییە. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | سستبوونی گیانی مەعنەوی بال دەکێشێت. | |

## خۆ راهێنان لەسەر سەرکردەیی و سەرکردایەتی

ئەگەر وەك تایبەتمەندییەکی کەسێتی بنوارینە سەرکردایەتیکردن، ئەوا زۆربەی تایبەتمەندییە کەسییەکان شتێکی بۆ ماوەیی نین و لە دەورووبەرەوە وەردەگیرێن، ئەگەر وەك رۆڵێکی کۆمەلآیەتیش لێی بنوارین ئەوا لە چوارچێوەی پێوەرە وەرگیراوەکانی کۆمەلآیەتی دیاریی دەکرێت، لێرەوە ئەم وتە کۆنە پووچ دەبێتەوە کە دەڵێ: سەرکردەکان لەدایکدەبن، دروستناکرێن".

لە کاتێکدا بۆچوونی نوێ لەهەمبەر سەرکردایەتیدا پێیوایە کە تاك دەتوانێ فێری ببێت و خەڵکیش لەسەری رابهێندرێ، سەرکردەش دروستدەکرێ پتر لەوەی لەدایك دەبێت" لێرەوە پێویستی و گرنگیدان بە پراوەکردن لەسەر سەرکردەیی زەقبوویەوە.

لە رێگەکانی پراوەکردنیش لەسەر سەرکردەیی رێگەی (رۆڵگێرانە) کە بیردۆزی مۆرینۆیە و تاك لەو هەڵوێستە جۆراجۆرانەدا رۆڵی سەرکردەیی دەگێرێت کە زۆر بە هەڵوێستەکانی ژیانی رۆژانە دەچێت، هەندێکیش پێیانوایە کە پراوەکردنەکە بەم قۆناغانەدا گوزەر دەکات:

* بە فێربوون و ئاشنابوون بەو لایەنە رەفتاریانە دەستپێدەکات کە پێویستە تاك فێریان ببێت.

* دواتر رۆڵی ئەنجامدانی رەفتارەکە دێت.

* دواتر ئەو شتانەی لە قۆناغی پراوەکردندا تاك فێریان بووە دەیگوازێتەوە بۆ قۆناغی کاری راستەقینەی سەرکردایەتی.

## لەو هۆکارانەی کە یارمەتیدەری پراوەکردنن لەسەر سەرکردایەتیکردن، ئەمانەن:

١. راهێنانی کرداری لەسەر سەرکردایەتیکردن لە کۆمەڵەکاندا، چوونکە کۆمەڵە کاریگەرییەکی زۆری لە دیاریکردن و هەموارکردنی رەفتاری تاك و بڕیار و ئاراستەکانیدا هەیە، ئەمەیش لە هەریەکە لە سەرکردەیی و شوێنکەوتەییدا دەرفەتی وەرگرتنی زانیاری و شارەزایی دەڕەخسێنێ.

٢. بونیادنانی کۆمەڵەی راهێنان بەشێوەیەك گۆڕان پەسندبکات و ئامادەی گەشەکردن بێت.

٣. ئاڵوێرکردنی پەیوەندی و بیروڕایەکان و تاوتوێکردنی گرفت و چارەسەرەکان لەنێوان راهێنەران و پراوەکاراندا بەوپەڕی سەربەستی و روونییەوە.

٤. پراوەکردن و فێربوونی دارێژراو لەسەر بنەمای شارەزایی و مومارەسە لە کەشێکی دیموکراسی و تێبینییکردنی راهێنەر لە سەرکردایەتیکردنی کۆمەڵە و تێبینیکردنی ئەندامەکانی دیکەی کۆمەڵە.

٥. پراوەکردن لەسەر رەخنەی بونیادنەرانە و قبوڵکردنی بەشێوەیەك توانای هەموارکردنی رەفتاری هەبێت بەرەو باشتر.

٦. پراوەکردن بۆ روونیی بیرکردنەوە و بڕیاردان و خێرا دەستپێکردنی کار بەتایبەتیش کتوپڕەکان.

٧. بەخشینی بەرپرسیاریەتی بە گشت کەسێك کە حەزی لێبکات و بتوانێ هەڵیسوڕێنێت و بەرگەی بگرێت.

٨. ئاوێتەبوونی راستەقینەی تەواو لەگەڵ بەرنامەکانی راهێنان و پراوەکردن، بەشێوەیەك لەدوای کۆتایی هاتنی ماوەی پراوەکردنەکە دابینکەری گۆڕینی رەفتاری پراوەکاربێت.

٩. بوونی راهێنەرێکی بەتوانا و لێهاتوو کە زانیاری و شارەزایی ببەخشێتە پراوەکاران و دەبێتە سەرمەشقێکی چاك.

١٠. خوێندنەوە و توێژینەوەکردن لە دەروونناسیی، بەتایبەتیش دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بۆ زانیاری پەیداکردن لەسەر رەفتاری کۆمەڵایەتی و پاڵنەرەکانی و کارلێکی کۆمەڵایەتی.

١١. نەرمی و گونجانی بەرنامەکانی راهێنان بەشێوەیەك بتواندرێ بەچەندین رێگە و شێوازی جیاجیا بەپێی سروشت و داواکارییەکانی هەڵوێستەکە بەرنامەی جۆراوجۆر پێڕەو بکرێت.

# دەوروبەر و رەفتاری کۆمەلآیەتی

زانایـانی دەروونناس گرنگییـان بـە کاریگەرییـە دەروونـی و کۆمەلآیەتییـەکانی کۆمەلگـەو قـەرەبالغی داوە و یەکـەم جـار لێکۆلێنـەوەیان لەسـەر رەفتـاری ئاژەلآنـدا کردووە بەتایبەتیش مشکەکان، دواتر زانایـان لـە تاقیگەکانیانـدا هاتوونەتـە دەرەوە و چوونەتە دەوروبەری راستەقینە و لە ئاژەلآنیشەوە چوونەتە سەر شرۆڤەکردنی مرۆڤ، ئەمـەیش بووەتـە هـۆی ئـەوەی لەسـالی ١٩٥٠دا زانـستێك سـەرهەلبدات کـە بـە دەروونناسیی دەوروبـەر نـاودێر بکرێـت. لـە تاقیکردنەوەیەکدا توێـژەرانی پەیمانگـەی نەتەوەیی ئەمریکی بۆ دروستیی ئەقلّ توێژینەوەیـەکی ئـەزموونیان کـرد و خانوویـەکی چـوار ژووریـان بـۆ کۆمـەلێك مـشك چـێکرد کـە رێینگەیـەکی بازنـەیی بەیـەکیانی دەبەستانەوە و بەشێوەیەك چێکرابوون کە ئـەو مـشکانەی لـە لێوارەکـانی ژوورەکـەدا بـوون دەبوایـە بـەر لـەوەی بگەنـە شـوێنی تایبـەتی خۆیـان یەکـەم جـار بـە ژوورە مەرکەزییەکاندا تێپەرن، بەم شێوەیە ژوورە مەرکەزییـەکان(٨٠) مـشکیان تیـادا بـوو، ئەم ژمارەیەش دوو هێندەی ژمارە گونجاوەکە بوو کـە (٣٢) مـشکە. لێکۆلـەرەکان لـە مەرجـە ئەزموونیەکەیانـدا کـە بـالّی بەسـەر تاقیکردنەوەکـەدا کێشابوو سـەبارەت بـە رەفتـاری کۆمەلآیـەتی و دەروونـی لەسـەر مـشکەکان بـەدوای شـرۆڤەکردنی کاریگەرییەکانی ئەم مەسەلەیەدا چوون، مەسەلەکەیش بریتیبوو لە چرِیی دانیشتوان لـە خانووەکـەدا، دواتـر لێکۆلـەران تێبینیـی هەنـدێ گۆرانکـاریی سـەیری رەفتـاری و کۆمەلآیەتیان کرد کە بەسەر مشکەکانی ژێر تاقیکردنەوەکەدا دەهاتن. هەرچـەندە ئـەو مشکانە خـواردنێکی زۆر و ئامرازەکـانی حەسانەوەیان بـۆ فەراهـەم کرابـوو، تێبینیـی ئەوە کرا زۆربەی مشکەکان لە رووی شوێنی حەوانەوە و خۆراك و خواردنـەوەوە مـافی

ئـەوانی دیکـەیان پێـشێل دەکـرد. نێـرە مـشکەکانیش توندوتیـژی و دوژمنکارییـان گرتبوویـە بـەر، هەندێکیـشیان نـەرێیبوون و کشانەوەیان هەڵبـژاردبوو، بـەڵام مـشکە مێیـەکان تەنبـەڵی و پشتگوێخـستنی بێـچووەکانیان کردبوویـە پیـشە، هـیچ بێـچووە مـشکێکیش نەیـدەتوانی بگاتـە قۆناغـە گونجاوەکـانی پێگەیـشتن، بۆیـە سیـستمی کۆمەڵایەتییان تێکچوو و هەراوزەنا و توندوتیژی تەنبـەڵی و هەڵوەشـانەوەی رەفتـاری باڵی بەسەر ژیانیاندا کێشابوو.

ئەم تاقیکردنەوەیـەی سـەرەوە نموونـەی کاریگـەریی دەوروبـەرە بەسـەر رەفتـاری کۆمەڵایەتیانەی تاکەکەس، لە راستیدا گرنگیدانی زانایـانی دەروونـناس بـە کاریگـەریی ژینگە لەسەر رەفتاری مـرۆڤ بـە بنـەمای سـەرەکیی بـیردۆزی فێربوونـەوە لکـاوە هـەر لەکاتی سەرهەڵدانیدا و لەمیانی ئـەو هاوکێـشەیەی کـە واتـسۆنی رێبـەری قوتابخانـەی رەفتاری دایناوە کە پێی وایە:" رەفتار ئـەرکی کەسـە نـەك دەوروبـەر، واتـا کـەس بـە ئامادەییە جۆراوجۆرەکانییەوە لە چوارچێوەیەکی دەوروبەریدا دەژیەت و هـەردووکیان کاریگەربوون و کاریگەری دروستکردن ئاڵوێر دەکەن.

دوای ئەمە زانایانی دەروونناس توێژینەوەکانیان بردە دەرەوەی تاقیگەکانیان و لـە چوارچێوەیەکی دەرەکـی دەسـتیان بـە شـرۆڤەکردنی رەفتارەکـان کـرد، توێژینـەوەی دەروونناسیی دەوروبـەریی جـەخت لەسـەر تێبینیکردنـی رەفتارەکـان دەکەنـەوە هـەر وەك چـۆن لـە چوارچـێوە سروشـتییەکەیدا روودەدات نـەك لـە هەڵوێـستە دیـاریکراوە ئەزموونییەکانـدا. ئـەم توێژینەوانـە گرنگیـی خۆیـان لەسـەر دەوروبـەری سروشـتی و کاریگەرییەکانی بەسەر جۆرەکـانی رەفتـار و شـێوازەکانی کـارلێکی کۆمەڵایەتیـدا چـڕ دەکەنـەوە، بـەم پێیـە دەوروبـەر وەك گـۆڕاوێکی سـەربەخۆی لێـدێت کـە خـۆی لـە

لێکۆڵینەوەکان جیادەکاتەوە، هەروەها دەروونناسیی بواری دەورووبەر وەها لە پەیوەندیی نێوان کەس و ژینگە دەنوارێت بەوەی کە پەیوەندیی تێکچرژان و بەیەکەوە لکانە، بەو واتایەی رەفتاری تاك هەموار دەکرێتەوە و دەگۆڕێت بە رێژە و شێوەی ئەو کاردانەوەیەی کە ژینگە وەك کاردانەوەیەك لەهەمبەر رەفتاردا پیشانی دەدات.

دەروونناسیی بواری دەورووبەر تاوتۆێی پرسی درککردنی تاك دەکات بە دەورووبەرەکەی، بەوەی کە شتێکی بێهاوتا و قورساییەکی زۆری لە پێشبینیکردنی رێژەی ئەو کاریگەرییەدا هەیە کە دەورووبەر لەسەر تاکەکەی بەجێی دەهێڵێ. زانایانی دەروونناسی بواری دەورووبەر لەکاتی داڕشتنی یاسا و بنەماکان و بیردۆزەکانیاندا پشت بە تێبینی و دەرەنجامی توێژینەوەکانی نێو لێکۆڵینەوەکانی ئەنترۆپۆلۆژی (مرۆڤناسی) و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دەبەستن. ئامانجی دەروونناسیی بواری دەورووبەریش ژیانێکی باشتری مرۆییە، چوونکە کاتێ توێژینەوە لەبارەی پیسبووندا دەکرێت، تەنها لەپێناو زانست و زانیاری و خودی توێژینەوەکە نییە، بەڵکو بۆ بەرزەفتکردنی دیاردەی پیسبوونەکەیە بەشێوەیەك دابینکەری زاڵبوون بێت بەسەر کاریگەرییە نەرێنییەکان، واتا پتر گرنگیی بە لایەنی پیادەکاریی دەدەن نەك تێوری.

# کاریگەرییە دەروونییەکانی شوێن

لایەنی سەرەکیی ژینگە ئەو شوێنەیە کەوا تیایدا دەژین، رەفتاری تاکیش بەپێی گۆڕانی دەوروبەرەکەی دەگۆڕێت، رەنگە کاردانەوەکانی لە گوند و ناوچەیەکی شاخاوی جیاواز بێت، هەروەها لەتایبەتمەندییەکانی خۆیدا دەگۆڕێت ئەگەر لە شوێنێکی چۆڵ یان لە ماڵەوە بێت لەوەی کە باڵەخانەیەکی پڕ لە خەڵك و دانیشتووان و شوێنێکی قەرەباڵغدا بێت. جا پرسیارە سەرەکییەکە ئەوەیە ئەو کاریگەری و شوێنەوارە رەفتارییە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیانە چین کە ژیانکردن لە شوێنێکی تایبەتدا دروستی دەکات و لە شوێنێکی دیکەش دروستی ناکات؟ بەر لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە باسی هەندێك لەو چەمکانە دەکەین کە وابەستەی بەکارهێنانی شوێنە.

## شوێنی تایبەتی بۆ دەروون شتێکە

زۆربەی جار کاتێك کەسێك هەوڵ دەدات وتارێك بخوێنێتەوە یان نهێنییەك بدرکێنێ تووڕەدەبین، چوونکە مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە بەشێکی ژیانی لە چاو و گوێی خەڵك بەدوور بێت، پێویستیی تایبەت یان تایبەتمەندی مانای دابڕانی شوێنیی نییە، رەنگە لە ماڵی خۆتدا تایبەتمەندیت دیاریکراو و سنووردارتر بێت لەوەی لە شوێنێکی قەرەباڵغ دابیت. تایبەتمەندیش چەند دۆخێکە کە (وستن) بەم شێوەیە باسیدەکات:

* تەنیایی و خۆ دابڕین لە شوێنێکی دوورە دەست و دوورە چاو، ئەمەیش لەو کاتەدایە کە دەچیتە سەر پێخەف و ژوورەکەت بۆ ئەوەی کارێکی تایبەت بەخۆت بکەیت وەك: خوێندن و راکشانی سەربەست و نووسین بەبێ ئەوەی خەڵکانی دیکە دەست لەم کاروبارانەت وەربدەن.

* شوێنی خانەوادەیی ئەمەیش پەیوەندیی بە تایبەتمەندیی دوو کەس یان پتر هەیە کە لە شوێنێکی وەك ماڵ و ئۆتومبێل و کورسیەکی نێو باخچەیەکدا هاوبەشن، یان ئەو شوێنە تایبەتەی کە دوو هاوڕێ لەسەری دادەنیشن و گفتوگۆ لەسەر پرسە کەسییەکانیاندا دەکەن.

* نادیاری: دۆخێکی تایبەتمەندییە کە تاك خۆی تیادا دەخزێنێ، ئەمەیش شوێنێکی گشتییە یان پاسێکە، تاك هەست بە حەسانەوە و هێمنی دەکات ئەگەر لەهەندێ شوێنی گشتیی وەك سینەما و شەقام و ناوچەیەکدا بێت کەوا کەس نەیناسێت.

جا بۆ ئەوەی جیاوازیی نێوان تەنیایی و گۆشەگیری بزانین دەبێ حوکمدانی تاك لە بارەیەوە بزانین، ئایا بە ویستی خۆی بووە یان بەسەریدا سەپێندراوە؟ یەکێك لە بەندکراوەکان لە توێژینەوەیەکدا باسی جیاوازیی نێوان تەنیایی و گۆشەگیری و پێویستی مرۆڤ بۆ تایبەتمەندیی دەکات و دەڵێت: لە خانەوادەکەم دایانبڕیوم و لە گشت پێداویستییەك بێبەشیان کردووم و بەری تیشکی خۆریان لێمگرتووە و بەبێ هیچ شتێك وازیان لێم هێناوە و گوڵ و درەختیان بە دەرگەی ئاسنین گۆڕیوەتەوە، لەسەرووی ئەو دڵتەنگییەی کە بەسەرمدا زاڵ بووە حەزی خۆ کوشتنیشم هەیە، بەلام دۆزینەوەی خۆم و هزرەکانم دڵم خۆشدەکەن، تا ئەو کاتەی شێوازێك دەبیننەوە بۆ ئەوەی لە بەهەشتی هزرەکانم بێبەشم بکەن ئەوا من سەربەستم. مرۆڤ دەتوانێ بەبێ سەربەستی لە جوولەکردن بژیەت، بەلام ناتوانێ بەبێ ئازادیی ئەقڵی و زانیاریی ئەقڵی بژیەت، هەر بەهۆی سەربەستی و زانیارییە کە مرۆڤ سەرچاوەی هیوای خۆی لەم شوێنە ناخۆشە و ناخۆشترین شوێندا دەدۆزێتەوە و دەتوانێت بژیەت.

چەندان هۆکاری جۆراوجۆر هەن وەها لە خەڵکی دەکەن بەدوای تایبەتمەندیدا بگەڕێن:

* تێرکردنی هەستکردن بە تاکایەتی و سەربەخۆیی کەسی.

* ئازادبوونی هەڵچوونی و دەربازبوون لە بێهیوایی و فشاری دەروونی، بەتایبەت ئەگەر سەرچاوەکەی ژیان بێت لەگەڵ خەڵکانی دیکە.

* هەندێ کەس بەهۆی ئەو دەرفەتەی تایبەتمەندی بۆ هەڵسەنگاندنی دەروون بۆیانی دەڕەخسێنێ، پێویستیان بە تایبەمەندی هەیە (پیاوانی بەڕێوەبردن لەکاتی بڕیاردانەکاندا).

* ئەو کەسانەی نیگەرانن وەهایان پێباشترە تێکەڵی خەڵك نەبن و دووریکەونەوە.

گۆشەگیری و تایبەتمەندی لەیەکتری جیاوازن، چوونکە گۆشەگیری هەوڵی تاکەکەسە بۆ تەنیابوون لەماوەیەکی دیاریکراو بۆ وەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراوی هەڵچوونی و ئەقڵی، بەڵام گۆشەگیری بەپێچەوانەوە ئامارە بەو هەستە دەکات کە تەنیابوونی تاك لەشوێنێکی دیاریکراودا بەبێ هۆیە و بەسەریدا سەپێندراوە، یانیش بەهۆی هەستکردنیەتی بە کەموکورتی و دەستەپاچەیی لەوکاتەی تێکەڵی خەڵك دەبێت و بەخەڵکانی دیکە دەگات.

جێگەی داخە زۆربەی خانەوادەکانی عەرەبی وەهایان پێباشترە لە شوێنی هاویەشدا بژیەن بەبێ ئەوەی رێگە بە تاکەکانیان بدەن کەمە سەربەستی و تایبەتمەندییەکیان هەبێت، ئەمەیش سەرچاوە لە هەندێ هزری نا دروستی تایبەت بە یەکگرتوویی خانەوادەیی و هەماهەنگیی خێزانی دەگرێت، بەڵام ئەمە چەندان گرفت و سکاڵای دەروونیی ئەوتۆ بەدوای خۆیدا دەهێنێ کە ئێستا بواری باسکردنی نییە.

**شوێنی کەسی:** ماوەی نێوان ئێمە و خەڵکانی دیکە و ماوەی نێوان تۆ و هاوڕێیەکەت چەندە لەو کاتەی گفتوگۆ دەکەن؟ ئایا هەمان ماوەی نێوان تۆ و کەسێکی بێگانەیە؟ یان مەودای نێوان تۆ و کەسێکی دیکەی هاورەگەزتە؟ ئەگەر بەجوانی وردبیتەوە دەبینیت مەودای نێوان تۆ و خەڵکانی دیکە بەپێی پێگەی هەر یەکێکیان و و جیاوازیی هەستوسۆزت لەبەرانبەریان و قووڵیی پەیوەندیت لەگەڵیاندا و بەپێی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی و تەمەن و رەگەز و ئاین دەگۆڕێت.

هەر کەسێك سنوورێکی شوێنیی نەبینراوی هەیە و هەوڵ دەدات رێزی خۆی بسەپێنێ و پێمانوایە کە رێزگرتنمان لە سنووری خەڵکی و نەبەزاندنی سنوورە شوێنییەکەیان و سەرەتاتێکی نەکردن لەهەمبەر ئەو سنوورە جۆرێکە لە رێککەوتنی ناوەکی بۆ رێزگرتنی دوولایەنەی ئاڵوێرکراوی سنووری کەسیی هەردوو لا. بەپێی رای (هۆل) خەڵك لەکاتی بەرکەوتنیان بە خەڵکانی دیکە بەچوار رێگە مەودای شوێنی بەکاردەهێنن.

* **پەیوەندیی گەرم و گوڕ و پتەو:** بەرکەوتنی جەستەیی لەخۆی دەگرێت و زۆربەی جاریش پەیوەندییەکی قووڵی نێوان دووکەسە وەك قۆڵ لەیەکتری هەڵکێشان و دانانی قۆڵ لەسەر شانی کەسی هاوڕێ و سەماکردن. هەندێ جاریش مەودای نزیکی نێوان دووکەس ئاماژەی پەیوەندیی قووڵ نییە، چوونکە کاتێ کەسێك لە شوێنێکی گشتیدا قۆڵێکی لەسەر شانی رەگەزێکی جیاواز دادەنێت، رەنگە رق و تووڕەیی بوروژێنێ، کاتێکیش فێرخواز قووڵی دەخاتە سەرشانی مامۆستاکەی رەنگە نەبێتە هۆی ئاسوودەیی، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر مامۆستا قۆڵی لەسەر شانی فێرخوازێکی

دانا رەنگە ئاسوودەیی دروست بکات، هەروەها دۆخی کەسی ژێردەست و سەرۆکیش وەهایە.

* مەودای کەسی: ئەویش مەودای نزیکی و دوورییە لەهەمبەر رۆیشتن و دانیشتن.

* مەودای کۆمەڵایەتی: ئەو مەودایەیە کە لەکاتی تێکەڵ بوونمان بە چالاکیی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی ئێمە و خەڵکانی دیکە لە یەکتری دادەبڕێت، بۆنموونە: لە گفتۆگۆیەکانی کۆمەڵایەتیدا خەڵك لەنزیك یەکتری دەوەستن و دادەنیشن بەشێوەیەك بتوانن گوێیان لە قسەکانی یەکتری بێت، ئەمەیش شتێکی جێگیرە جا ئەگەر ئەوانەی گفتوگۆ دەکەن هاوڕێ بن یانیش کەسانی بێگانەبن.

* مەودای گشتی و فەرمی: وەك مەودای نێوان فێرخوازان و مامۆستایان لە وانە، مەودای وتاربێژ لە جەماوەر.

مەودای نێوان کەسەکان لەکاتی ئاڵوێرکردنی دیاریکراو لە شارستانیەك بۆ شارستانییەکی دیکە دەگۆڕێت، بۆ نموونە مەودا لە وڵاتانی عەرەبیدا هێندە نزیکە کە هەندێ جار دەگاتە رادەی بەریەککەوتن و لە جیهانی عەرەبیدا شتێکی پەسندە، بەلام ئەمریکییەکان کەمتر پەسندی دەکەن و مەودای نێوانیان دوورترە، جا لەبەر جیاوازیی شارستانییەکانی مرۆیی لە دیاریکردنی مەوداکانی نێوان تاکەکان لەکاتی گفتوگۆدا شتێکی سەرنجڕاکێشە کە تێبینیی بکەیت کاتێ ئینگلیزێك چاوی بە کەسێکی خۆرهەلاتی دەکەوێت بۆ ئاڵوێرکردنی گفتوگۆیەکی دیاریکراو، کەسە خۆرهەلاتییەکە نزیك دەوەستێ و چەند هەنگاوێك نزیك دەبێتەوە بەلام کەسە

ئەمریکیەکە خۆی دوا دەخات و دەکشێتەوە دواوە، لەبەرئەوە ئەو خۆرهەلاتییەی دەچێتە کۆمەڵگەیەك کە رۆشنبیرییەکەی ئینگلیزی یان ئەمریکییە، وا هەست دەکات

کە لووتیان بەرزە و بەئاسانی هاوڕێیەتی قبوڵ ناکەن. هەروەها کەسە خۆرئاواییەکەش کـاتێ دێتـە ولاتـانی خۆرهـەلاتی لـە جـۆری مـەوداکان تێناگـات و هەسـتدەکات خۆرهەلاتییـەکان کەسـانی دوژمنکارانـە و هەڵپـەدارن، رەنگـە ئـەم هەڵانـەیش لـەکاتی کارلێککردن لەنێوان تاکەکانی شارستانییە جۆراوجۆرەکاندا ببنە هۆی خـراپ گونجـان، ئەمەیش دەرنجامی تێنەگەیشتنە لە مەوداکان و جۆرەکـانی بەرکەوتنـەکان و کـارلێکی گشت شارستانییەك.

# دیاردەی چڕیی دانیشتوان و قەرەباڵغیی شوێنی

قەرەباڵغیی شوێنی دەبێتە هۆی داڕووخان و تێکچوونی شێوەکانی رەفتاری مرۆیی‌و داڕووخانی سیستمی کۆمەڵایەتی. لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان روونکردووەتەوە کە قەرەباڵغی لە شوێنە میللییەکاندا هۆکارێکی یارمەتیدەری بڵاوبوونەوەی تاوان و نەخۆشییەکانی جەستەیی و دەروونییە.

کاردانەوەکانی خەڵك لەهەمبەر قەرەباڵغیدا جۆراوجۆرە و چەندان شێوەی جیاجیا وەردەگرێت، لەوانە گرژیی فیسیۆلۆژی کاتێ لێدانی دڵ زیاد دەکات و رژێنەکان دەردراوەکان دەردەدەن و ماسوولکەکان گرژ دەبن، رەنگە کاردانەوەی خەڵك لەهەمبەر قەرەباڵغیدا بە هەڵاتن بێت لە شوێنەکە ئەگەر بتوانن ئەمە بکەن یانیش رەنگە کاردانەوەی دوژمنکارانە و بێهوایی بگرنەبەر هەروەك لە تابوورە دووروودرێژەکانی نۆرەگرتندا روودەدات. کاتێ مرۆڤیش ناتوانێ رابکات رەنگە کاردانەوەکەی بە خۆگونجاندن بێت لەبەرانبەر هەڵوێستەکە و هەوڵدان بێت بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو بێهیواییەی کە قەرەباڵغی دروستیدەکات، ئەمەیش بە پیشاندانی ئەتەکێت و ئەدەب و رێزگرتن لە خەڵکان دێتەدی.

## رێژەییبوونی کاردانەوە لەهەمبەر قەرەباڵغی و کەڵەکەبووندا

کاردانەوە پشت بە درککردنی کەسی دەبەستێت لەهەمبەر هەڵوێستەکەدا، فریدمان سێ هۆکاری دەستنیشانکردووە کە کاریگەریی لەو درککردنە دەکات:

١. جۆری ئەو کەسانەی لە چواردەوری تۆدا قەرەباڵغیان دروستکردووە: چوونکە ئێمە قەرەباڵغی دروستدەکەین ئەگەر کەسەکان هاوڕێی نێو ئاهەنگ و شوێنێکی گشتی بن.

٢. سروشتی ئەو چالاکییە باوەی کە لە شوێنە قەرەباڵغەکەدا هەیە: ئێمە هەست بە چارپسبوون و تەنگەتاوی دەکەین کاتێ شوێنە قەرەباڵغەکە کاریگەریی لە حەسانەوە کەسییەکەمان بکات، وەك قەرەباڵغی لەبەردەم پەنجەرەی بانك و سینەما. هەروەها رەنگە تەقەبولی قەرەباڵغی بکەین ئەگەر هاتوو کاریگەریی لە حەسانەوەمان نەکرد، چوونکە بینینی فیلمێکی سینەمایی لە هۆڵێکی سیخناخی پڕ لە خەڵك دووچاری تەنگەتاوییمان ناکات ئەگەر شوێن و کورسییەکی گونجاومان هەبێت.

٣. ئەزموونی پێشوو و ئاستی پەسندکردنی دەروونیانەی قەرەباڵغی: هەرچەندە تۆ چێژ لە سواربوونی پاس و شەمەندەفەر وەرناگریت، بەلام خۆت لەسەر پشتگوێخستنی تەنگەتاوی و بەرگەگرتنی هەڵوێستەکە رادەهێنیت (بەوەی خۆت لەسەری رابهێنیت) چوونکە قەرەباڵغی پرسێکی رێژەییە و رەنگە هۆڵی نمایشی سینەمایی پڕ و سیخناخ بێت بەلام بەوە ناچێت قەرەبالغ بێت، چوونکە بوونی خەڵکانی دیکە کاریگەری نابێت و دەتوانم شاشەکە ببینم، بەلام بوونی کەسی سێیەم لە ژوورێکدا رەنگە ئەو هەستەم لەلا دروستبکات کەوا شوێنەکە قەرەباڵغە ئەگەر بمەوێت لەگەڵ کەس دانەنیشم جا ئەگەر ژوورەکە زۆریش فراوان بێت.

رەنگە کاریگەری و شوێنەوارە مرۆییە دەروونییەکان بگۆڕێن و نەرێی و نەخۆشیاویش نەبن، چوونکە هەندێ هەڵوێست هەن کە لەوانەیە قەرەباڵغی ببێتە هۆی

هەستکردن بە ڕەزامەندی و دڵخۆشی، وەك بینینی گەمەکانی تۆپی پێ و میهرەجانەکانی میللی و جەژنەکان.

کاردانەوە لەهەمبەر قەرەباڵغی بە گۆڕانی کەسەکان دەگۆڕێت، چوونکە بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی فریدمان بوونی جیاوازی ڕەگەزیی لە کاردانەوەی هەمبەر قەرەباڵغیدا بەدیارکەوتووە و پیاوان بە دوژمنکارییەوە کاردانەوەیان لەهەمبەر قەرەباڵغیدا دەبێت، بەڵام ژنان بە ڕەزامەندییەوە کاردانەوەیان دەبێت و حەزی هاوکاریکردنیان لەم هەلومەرجانەدا پتردەبێت، هەروەها بوونی ئافرەت کاریگەریی نەرێیی قەرەباڵغی لەلای پیاو کەمدەکاتەوە و حەزی دوژمنکاری و کێبڕکیی دادبەزێنێت.

## ژیان لە شاردا

زانایانی دەروونناس شرۆڤەی کاریگەریی دەوروبەری شاری دەکەن لەسەر ڕەفتارداو ئەوەیان بۆ ڕوونبووەتەوە چەند جۆرە ڕەفتارێك هەن لە شاردا بلاو دەبنەوە کە هەندێکیان باشن و هەندێکیشیان خراپن، چوونکە هەرچەندە شار چڕیی دانیشتوانی زۆرە و ئەم چڕییەش وەها دەکات دەرەنجامی نەرێیی وەك نامۆبوون و بێهیوایی و گیانی تێکدەریی لێبکەوێتەوە، بەڵام ژیانی شار بۆ پێشکەوتنی ڕۆشنبیریو ئابووری و زانستی و چالاکی و جوولە دەرفەتی پتر و گەورەتر دەڕەخسێنێ، با چەند نموونەیەك سەبارەت بە ژیانی شار بهێنینەوە: زۆر لەمێژ نییە کچێکم بینی کە لەو کاتەی کە ویستبووی بۆ ماڵەوە بگەڕێتەوە بە چەقۆ کوژرابوو، کەسێکی (وینستۆن) کە ئێستا تا ژیانی ماوە لە بەندیخانەی نیویۆرکدا بەندکراوە بەچەقۆ لێی دابوو، کچە کوژراوەکە زۆر بەرهەڵستیی کردبوو بۆیە پیاوەکە تا گیانی دەردەچێت بەچەقۆ لێی دەدات، سەیرەکە لەوە دابوو کە بەلای کەمەوە ٣٨ کەس

گوێیان لە هاواری کچەکە ببوو و کردەی کوشتنەکەیان بینیبوو، بەبێ ئەوەی خۆیان لەمەسەلەکە وەربدەن، لێرەدا گرفتەکە پەیوەندیی بە ژیانی شارەوە هەیە، ئەویش دوودڵیی خەڵکە لە پێشکەشکردنی یارمەتیی بە خەڵکانی دیکە. بۆیە زانایانی دەروونناس پەنایان بردە بەر شرۆڤەکردنی دیاردەی پێشکەشکردنی یارمەتی وەك رەفتارێك کە مەرج و سنووربەندیی خۆی هەیە و ئەو پرسیارەشیان کرد: ئایا ئەو رەفتارە نەرێییە لەهەمبەر رەفتاری پێشکەشکردنی یارمەتی بە خەڵکانی دیکە لە لایەنە تاریکەکانی سروشتی مرۆییە بۆ هەڵاتن لە بەرپرسیاریەتیی و خۆ دوورگرتن لە مەترسی، یانیش مەسەلەیەکە و هەلومەرجی ژیانی شارە مەترسیدارە زەبەلاحەکان دەیسەپێنێ؟ زانایان چەندان تاقیکردنەوەیان کرد لەوانە ئەم تاقیکردنەوەیە بوو: وەهای دابنێ تۆ لە شارێکی زۆر گەورەدایت و چاوەڕوانی هاتنی پاسیت و کتوپڕ لە نزیك تۆدا پیاوێکی غەوارە بە دوو دارشەقەوە لە تەنیشتت دەکەوێتە سەرزەوی کە پێیەکانی گەچیان لێنراوە، ئایا لەم دۆخەدا یارمەتیی دەدەیت؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دوو توێژەری دەروونی بۆ زانینی چۆنیەتیی کاردانەوەی خەڵك لەهەمبەر کەسانی بێگانەی نێو شارەکاندا ئەزموونێکی واقیعیان ئەنجام دا و پراوەیان بەکەسێککرد بۆ ئەوەی رۆڵی پیاوێکی دەستەپاچە بگێڕێت کە دوو داردەستی لەدەستە، داوایان لێی کرد لە چەند شوێنێکی جیاجیای وەك وێستگەکانی پاسی نیویۆرك ٦٠ جار خۆی بکەوێنێ، دەرەنجامەکە گەشبینانە بوو، چوونکە نزیکەی (٥٠) کەس دەستی یارمەتییان بۆ درێژکرد (٨٣٪)، هەمان نواندیان لە فڕۆکەخانە کرد بەڵام تەنها (٢٥) کەس دەستیان بۆ درێژکرد (٤١٪). ئێستا ئەو هۆیە باوەڕپێهێنەرانەی ئەو

جیاوازییە لەهەڵویستێکەوە بۆ هەڵویستێکی دیکە چییە؟ ئایا جۆری خەڵکەکەیە لە نێو فرۆکەخانەکان و پاسەکاندا؟.

هەردوو لێکۆڵەر بانگهێشتی ئەو کەسانەیانکرد کە دەستی یارمەتییان درێژکردبوو بۆ ئەوەی لە هۆیەکان بکۆڵنەوە، لە ئەنجامدا ئەوە روونبوویەوە کە جیاوازییەکان بۆ ئاشنایی شوێنەکان دەگەڕێنەوە، چوونکە ئەو خەڵکانەی سواری ئۆتۆبیس دەبن ئەمە بەبەردەوامی دەکەن و هەست بە دڵنیایی دەکەن، بەڵام خەڵکانی نێو فرۆکەخانەکان لە هەڵویستێکی نابـاون و بە سەلامەتیی خۆیان و کاتەکانی گەیشتن و سەفەرکردنەوە سەرقاڵن.

لەبەرئەوە ناکرێ لێکدانەوە بۆ کاریگەریی رەفتاریی ژیانی شار بکرێت، بە واتایەکی دیکە رێژەی ئەو شڵەژانە دەروونی و نامۆبوونە چەندە کە وەها دەردەکەوێت پەیوەندیی بە ژیانی شارەوە هەیە؟

رەنگە ژیانکردن لەگەڵ خەڵکانی بێگانەدا و ناچاربوونمان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ زۆربەی جۆرەکانی مرۆیی نێو شارە گەورەکان کە هیچ پەیوەندییەکی سۆزی بە ئێمەیان نابەستێتەوە، ببێتە هۆی وروژاندنی هەستکردن بە نامۆبوون و گوێپێنەدان، رەنگە ئەو گرژییەی لە تێکچوونی مامەڵەکردن لەگەڵ زۆربەی خەڵکی و پەیوەندی دروستکردنی ناپێویست لەگەڵیاندا پاڵ بەکەسەکانەوە بنێت چەند مەودایەکی دەروونی لەنێوان خۆیان و خەڵکانی دیکەدا بهێڵنەوە، ئەمەیش خودی نامۆبوونەکەیە. هەروەها لەوانەیە تێکدان و لەناوبردنی موڵك و ماڵی گشتی و توندوتیژی لەو شتانە بن کە سەرچاوەیان لە پێویستیی مامەڵەکردن لەگەڵ جەماوەری جۆراوجۆر و گۆڕاو گرتبێ، لەبەرئەوەی مرۆڤ هەستدەکات بزر و نادیارە. هاوڕێیەتیش لە شاردا ئەو پرسیارە بۆ

زانایـانی دەروونـی دروسـتدەکات ئایـا دروسـتکردنی هاوڕێیـەتی نێـو شـارەکان لـەهی گوندەکان قورسترە.

یەکێك لە زانایانی دەروونیی بواری دەوروبەر ویستی بەشێوەیەکی ئـەزموونی لەمـە دڵنیابێتــەوە، بۆیــە چــەند پرســیارێکی ئاراســتەی دوو کۆمەڵــە فێرخــوازکرد کــە کۆمەڵەیەکیان لە زانکۆیـەکی تایبـەت بـە شـارێکی گـەورەبوون و ئـەوی دیکەشـیان لـە زانکۆیەکەدا دەیانخوێند کە کەوتبووە ناوچەیەکی دێهاتی. ئەم دوو کۆمەڵەیە لـە رووی تایبەتمەندییەکانی وەك رەگەز و تەمەن و تاقیکردنەوەکانی کەوتنەبەر ژیـانی شـاری و گوندی لەپێشووتردا، یەکسان بـوون. لەسـەرەتادا هـەر کۆمەڵەیـە و لـە میـانی دووەم مانگی هاتنیان بۆ کۆلێژ بەتەنیا چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ئـەنجام درا، دواتـر کۆمـەڵێك پرسیار بەتەنها ئاراستەی هەر یەکێکیان کرا بۆ ئەوەی ژمارەی هاوڕێیـانی هـەر تاکێـك بزاندرێ، لە ئەنجامدا روونبوویەوە کە ئەو فێرخوازانەی لە ناوچە گوندییەکاندا هاتبوون ژمارەیـەکی زۆرتریـان هـاوڕێ هـەبوو کـە رێژەکـەی دوو هێنـدەی رێـژەی هـاوڕێی ئـەو فێرخوازانە بوو کە لەشار هاتبوون.

لێکۆڵەر دوای تێپەڕبوونی حەوت مانگ بەسـەر هاتنیـان بـۆ کۆلیژەکـە و مانـەوەیان لـەوێ، هـەمان پرسـیار و چـەند پرسـیارێکی دیکـەی لـە کۆمەڵەکـە کـرد، لەئەنجامـدا ژمارەی هاوڕێیانی فێرخوازە شارییەکان بەرزبوویـەوە و بـووە هـۆی نـەمانی جیاوازیی هـەردوو کۆمەڵـە لـە رووی هـەبوونی هـاوڕێ و ژمـارەی بینینـەکان. هـەروەها ئـەوەش روونبوویەوە کە فێرخوازانی شـار پێـشبینیی ئـەوە دەکـەن بـۆ پێکهێنـانی هاوڕێیـەتی بەخێرایی، لە فێرخوازانی گوند پتر رووبەڕووی تەنگوچـەڵەمە ببنـەوە، ئەمـەیش لەبـەر ترسانە لە کەسانی بێگانە و گومان و متمانە نەکردنە لەکاتی بینینی کەسـانی نـامۆ لـە

شارە گەورەکاندا. جا لەکاتی پرسیارکردن لە گەورەترین گرفتەکانی ژیان لـە ژینگـەی کۆمەڵایەتیانـەی زانکـۆدا، لێکۆڵـەر ئـەوەی بـۆ روونبوویـەوە کـە فێرخـوازانی شـار گوزارشـتیان لـە هەنـدێ گرفـت کـرد کـە پەیوەنـدیی بـە ئاسایـشەوە هەیـە، بـەڵام فێرخوازانی زانکۆی گوندی گوزارشتیان لەو گرفتانـە کـرد کـە پەیوەنـدیی بـە نـەبوونی توانـای رێکخـستنی کاتـەکانی خوێنـدن هەیـە بـەهۆی سـەردان و پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکان و بەرکەوتنە چاوەڕواننەکراوەکان.

هەروەها لایەنێکی ئەرێیی دیکەی ژیانی شاری وەرگرتنـی شـارەزایی و ئـەزموونی فراوانترە بەهۆی بەرکەوتن بەجۆرە مرۆییە جۆراوجۆرەکان و جیاوازەکانەوە، ئـەوەیش روونبووەتەوە کـە فێرخـوازانی شـار گوتوویانـە چاوپێکەوتنیان بـە هاوڕێیـەکانیان لـە هەلومەرجی قووڵتر دەبێت واتا لەمیانی ئـاڵوێرکردنی سـەردانەکان و ئاهەنگـەکانی نێـو ماڵەکانەوە دەبێت، ئەمەیش لـەنێو فێرخـوازانی زانکۆیـە گوندییەکـەدا بەدیارنەکـەوت، چوونکە هاوڕێیەتیان قووڵترە.

هەروەها کاریگەرییەکانی ژیان لە شارەکاندا لە دیاردەی قـەرەباڵغی دەپەڕێتـەوە و زۆربـەی جـاریش شـارە گـەورەکان و پایتەختـە زەبەلاحـەکان بـەهۆی رەخـساندنی دەرفـەتی پێـشکەوتنی رۆشـنبیری و ئـابووری و زانـستی خـەڵکانی زۆر بۆخۆیـان رادەکێشن، چـوونکە لەهەمبـەر هەنـدێ کەسدا دەبیـنین چـالاکی و جووڵـە و کـردار پەیوەندیی بە شارەوە هەیە.

لەگـەڵ بـڕاو و هەلومـەرجی پێـشکەوتنی ئـابووری و رۆشـنبیریدا رێـژەی کەسـانی بێگانە پتر دەبن، و لەم جۆرە ژینگەیەدا کێبڕکێ و دوژمنایەتی و پشتگوێخستن و پـتر دەبێت.

* قەرەباڵغی و دەرەنجامەکانی وەك تاوان و لادانەکان و نەخۆشییەکانی دەروونی و جەستەیی و گرژی پتر دەبێت.

* پەیوەندییەکان مۆرکێکی نا شەخسی وەردەگرن و نامۆبوون پتر دەبێت.

* ئاشنایەتیی هەندێ شوێن کەمتر دەبێتەوە، لەبەرئەوە خەڵك خۆیان لە پەیوەندییەکانی هاوڕێیەتی و هاوکاریکردنی خەڵکانی دیکە بەدوور دەگرن.

* هەرچەندە شار تەژییە بە مرۆڤ بەڵام هەست دەکات کەسێکی بزرە، لەبەرئەوە زۆر ئاسانە هەست بەوە بکات (کەس گرنگیم پێنادات، جا من بۆ گرنگی بدەم).

هەستکردنی تاك بە بزربوون لە خەڵکانی دیکە، یان دەبێتە هۆی ئەوەی لەمیانی کرداری چاکەوە خۆی بە خەڵکان بناسێنێ، یانیش تێکەڵی ئەو کارانە بێت کە قەدەغەکراو و حەرامکراون، گەرچی هیچ پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی لەمەدا بەدی ناهێنێت.

لێکۆڵەران پێیانوایە کە دیاردەکانی وێرانکردنی موڵك وماڵی گشتی بەهۆی سووتانو نەمانی تەزووی کارەبا بۆ ماوەیەکی زۆر دووردوودرێژ لە شارە گەورەکاندا لەئەنجامی هەستکردنی تاکەکەسە بەوەی کە بزرە و کەس نایناسێت.

* راگەیاندن.
* پەیوەندییەکانی گشتی.
* ریکلام و پڕوپاگەندە.
* ئاگاداری
* پەیوەندییە دینامیکیەکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی فێرگەیی

# ڕاگەیاندن: Information

**پێناسەی ڕاگەیاندن:**

کردەی بڵاوکردنەوە و پێشکەشکردنی زانیاریی دروست و ڕاستیی ڕوون و هەواڵی ڕاست و بابەتی ورد و واقیعی دیاریکراو و هزری لۆژیکی و ڕاوبۆچوونی بەجێیە لەگەڵ ناوهێنانی سەرچاوەکانیان وەك ڕاژەیەکی بەرژەوەندیی گشتی.

لەسەر گفتوگۆ و دیالۆگ و باوەڕپێهێنان بونیادنراوە و ڕەوتێکی دیموکراسیانە دەگرێتەبەر، ئامانجیشی گەشەکردن و هەماهەنگی و گونجانی کۆمەڵایەتی و شارستانیو بەرزکردنەوە و پێشخستنی ڕای گشتییە بەهۆی ڕۆشنکردنەوە و ڕۆشنبیرکردنییەوە. هەروەها کاریگەریی کرداری لە ڕەفتار و تاك و کۆمەڵەکاندا دەکات.

**سایکۆلۆژیای ڕاگەیاندن**

کردەی ڕاگەیاندن کردەی پەیوەندیگرتنی نێوان پەخشکەر (مرسل)ی بواری ڕاگەیاندن و وەرگر (مستقبل) جەماوەرە لە ڕێگەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن(ڕۆژنامە، تەلەفزیۆن.... هتد) کە بەهۆیەوە پەیامی ڕاگەیاندن لەسەر شێوەی (هێمای زمانەوانیی وێنەدارەوە) لە لایەکەی دیکەوە دەگوازرێتەوە، ئۆرگانی دەماریش ڕۆڵی سەرەکیی لە وەرگرتنی پەیامی ڕاگەیاندندا هەیە بەو پێیەی ورووژێنەرێکە و تاك و کۆمەڵەکان کاردانەوەیان لە هەمبەریدا دەبێت.

کاردانەوە لە هەمبەر پەیامی ڕاگەیاندندا چەندان کردەی دەروونیی لەخۆیدەگرێت بەو پێیەی ورووژێنەرێکە بۆ ئەوەی وەرگرەکان بەو شێوەیەی لێیان چاوەڕواندەکرێت

پەیامەکان وەربگرن، بەڵام دەبێ سەرنجڕاکێشبێت و بێزارکەر نەبێت و لەگەڵ پێکهاتەکانی کەسێتیی تاك و مۆرکی نەتەوەیی کەسێتیدا بگونجێت. هەروەها لەگەڵ ئەو بوارە دەروونیەدا بگونجێت کە تاك و کۆمەڵە تیایدا دەژیێن، دەبێ لەگەڵ پاڵنەر و رەمەك و پێداویستییەکان و ئەزموون و فێڵەکانی بەرگری و فێربوون و چەندان دیاریکەری دیکەی کاردانەوەشدا بگونجێت. کاردانەوەش لە هەمبەر پەیامی راگەیاندندا بەندە بەوەی کە ئاخۆ سادەیە یان ئاڵۆزە، راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیە، تێروپڕە یان کەموکورتیدارە، روونە یان لێڵە.

دەتوانین گرنگترین هۆکارەکانی پەیامی راگەیاندن لەم خاڵانەی خوارەوەدا پوختبکەینەوە:" پوختکردنەوەکەش هی ئیبراهیم ئیمامە، ١٩٦٨.

* وێکچوون و بەشداریکردن و هاوبەشی لە ئەزموونەکان و ئەو وێنانەی کە لەلای هەریەکە لە نێرەری (راگەیاندنکار) و وەرگر(جەماوەر)دا هەیە، بەشێوەیەك هێماکان بەکەڵکیان بێت و پێی ئاشنا بن و کاردانەوەیان لەهەمبەریدا هەبێت.

* وروژاندن و راکێشانی ئاگایی وەرگر و بەکارهێنانی ئەو هێمایانەی واتاکانیان روون و ئاشکرایە.

* بەستنەوەی پەیامی راگەیاندن بە پێداویستییەکانی ئایندە و پێشنیارکردنی چارەسەری تێروپڕ بۆی، ناشبێت لەگەڵ دابونەریتەکاندا دژبێت.

* رەچاوکردنی دۆخی دەروونیانەی ئایندە و وردیی لە هەڵبژاردنی کات و شوێنی گونجاو و ئامرازی سوودبەخش.

* گرنگیدان بەو واژانەی کە وەرگر دەتوانێت تێیانبگات و بەپێی پاشخانە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکەی کاردانەوەی لەهەمبەریاندا هەبێت.

* دەربازبوون لەو هۆکارانەی تێکدان و لێڵکردن (تشویش) کە دەبێتە کۆسپی بەردەم تێگەیشتنی نێوان نێرەر و وەرگر، چەندان نموونە لەم بارەیەوە هەن، وەك: قورسیی تێگەیشتن لە پەیامی راگەیاندن و خێرایی پێشکەشکردنی).

ئیبراهیم ئیمام (١٩٦٩) هەندێك تێبینیی سەبارەت بە ناوەڕۆکی راگەیاندن و کاریگەرییەکەی لە جەماوەر پوختکردووەتەوە:

* لە دۆخی پیشاندانی پرسێك بە جەماوەر و بەتایبەت ئەگەر رۆشنبیرییەکی بەرزی هەبوو، دەبێ دوو رای جیاواز پێشکەش بکرێن، بەڵام لە دۆخی ئەو جەماوەرەی کە رۆشنبیرییەکەی کەمە و پرسەکەی لەلا گرنگە، ئەوەندە بەسە تەنها راوبۆچوونەکە بخرێتەڕوو.

* دەبێ کەسی راگەیاندنکار بە بابەتیبوون پابەندبێت و خۆی لە بێلایەنیی رووکەشانە و لایەنگریی شاراوەی هەمبەر یەك راوبۆچوون بەدوور بگرێت.

* خستنەڕووی دوو راوبۆچوون بەیەکەوە بۆ جەماوەر وەك پاراستنێك دەبێت بۆئەوەی نەچێتە سەر راوبۆچوونەکەی دیکە کاتێك پێشکەشی دەکرێت، بەڵام ئەگەر جەماوەر بەشێوەیەکی ئاشکرا پابەندی راوبۆچوونێك بێت و دواتر لە چوارچێوەی سەربەستیدا باوەڕی پێی هێنا ئەوا ئەوەندە بەسە جەماوەر بخرێتە بەر یەك راوبۆچوون

* هێزی کاریگەریی ناوەڕۆکی راگەیاندن لەکاتی راڤەکردن و بڵاوکردنەوەیاندا لە گۆڕینی راوبۆچوون بەهێزتر دەبێت نەك لە ئاماژەپێکردن و نمایشکردن.

* هەرچەندە رێگەی دیاریکردنی ئامانجەکان لەبەردەم جەماوەردا روون و دیاریکراوبوون ئەوا گۆڕین و وەرچەرخاندنی راوبۆچوون بۆ رەفتار ئاسانتر دەبێت.

* هەرچەندە بەکارهێنانی هەڕەشە و ترساندن وەك هۆکارێك بۆ کاریگەری دروستکردن لە راوبۆچوون و گۆڕینی پتربوو، کاریگەرییەکی کەمتری دەبێت، هەرچەندە کەمتریش بەکاربێت کاریگەرییەکەی زۆرتر دەبێت.

* راگەیاندنی کاردانەوە و وەڵامدانەوە سەرکەوتووەکانی پەیامی راگەیاندن دەبێتە هۆی سەرهەڵدان و دروستکردنی کاردانەوە و وەڵامدانەوەی نوێی سەرکەوتووانەتر.

* پشتبەستن بە پێداویستییە دەروونییەکان و وەدیهێنانیان و پاڵنەرە دەروونییەکانی رەفتاری مرۆیی کردەی راگەیاندن ئاسانتر دەکەن، بەڵام دروستکردنی پێداویستیی نوێی دەروونی و هاندان بۆ وەرگرتن و فێربوونیان، زۆر قورستر دەبێت. گرنگترین پێوەرەکانی داوەریکردن لەبارەی سەرکەوتنی راگەیاندن (مامەڵە و کاردانەوەی جەماوەرە)، جا بۆ ئەوەی راگەیاندن سەرکەوتن وەدەستبێنێ، دەبێت پەیامەکەی وەدیهێنانی پێداویستییە دەروونییەکانی جەماوەر بێت کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- پێداویستیی بۆ بەخشینی زانیاری و کات بەسەربردن.
- پێداویستیی بۆ هەواڵ لەهەمبەر گرفتەکانی هەنووکەیی.
- پێداویستیی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاری و رۆشنبیریی گشتی.
- پێداویستی بۆ پاڵپشتیکردنی ئاراستەکانی دەروونی و پێوەرەکان و بەها و بیروباوەڕەکان و هەموارکردنەوەیان لەگەڵ هەڵوێستە نوێیەکاندا.

هەروەها راگەیاندن بۆ سەرکردایەتیکردن کاریگەری و گرنگیی خۆی هەیە، چوونکە ئامرازی گواستنەوەی زانیارییە لە سەرکردایەتییەوە بۆ بنکەی جەماوەری. سەرکردایەتی لەبارەی ئاراستەکانی بنکەکانی جەماوەری و جەماوەر و

پێداویستییەکانیان ڕاپۆرتی ورد بەرزدەکاتەوە، ئەرکەکانی ڕاگەیاندن بریتین لەمانەی خوارەوە:

* ئەرکی ڕۆشنبیرکردن.

* ئەرکی پەروەردەیی و فێرکردن.

ڕاگەیاندن دیالۆگ لەگەڵ ئەقڵی جەماوەر دەکات نەك ڕەمەکەکانی، ئامانجە ڕۆشنبیرییەکانیشی گەشەپێدانی بیرۆکە و بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە و پێشکەشکردنی زانیارییەکانە، ئامانجیشی پترکردنی زانیاری و باوەڕهێنان و تێکگەیشتنە. ڕاگەیاندن و ئامرازەکانی لەگشت کردەکانی پەروەردە و فێرکردندا دەتوانن یارمەتیدەری مامۆستا بن. بەرنامەکانی فێرکردنیش لە ئێستگە و تەلەفزیۆن و هتد تەواوکەری کاری مامۆستان، فێرکردنی بەرنامەداریش ڕوونترین پێشکەوتنەکانی فێرکردنی هاوچەرخن. ڕاگەیاندن کردەیەکی سەرەکییە لە پەخشکردنی هزرە پێشکەوتنخوازە نوێیەکان و ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان بە پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی هەیە و لە نەهێشتنی نەخوێندەواریشدا ڕۆڵی هەیە و ڕۆڵێکی گرنگیشی لە تەواوکردنی ڕۆشنبیریی ئەو کەسانەدا هەیە کە پێشکەوتنی فەرمی واز لێدێنن.

## پلاندانی ڕاگەیاندن

دەبێ ڕاگەیاندن لەسەر بنەمای پلانێکی تاوتوێکراوی زانستی و شرۆڤەکردنی ڕێکوپێك و ئەو لێکۆڵینەوە وردە زانستیانە دابڕێژرێت کە تایبەتن بە هەڵوێستی ڕاگەیاندن وەك گشتێك، هەروەها دەبێ پلان بۆ پەیامی ڕاگەیاندن و جەماوەر و ئامرازی ڕاگەیاندن و کردەی ڕاگەیاندن دابندرێت. دەبێ پلانەکە لەگەڵ پلانی سەرتاپاگیری نەتەوەییدا لەبوارەکانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی یەکتری

تەواو بکەن، هەروەها دەبێ شرۆڤەی دابونەریتەکان و بەها و ئاراستەکان و رای گشتی بکات، چوونکە ئامانجی وەدیهێنانی گۆڕانە لە رەفتاردا، دەبێ پلانەکەیش بکرێتە بەرنامەی جێبەجێکاری و چەند ستراتیژێك و بۆ زانینی ئاستی سەرکەوتن و کەموکورتییەکان و وەدیهێنانی ئامانجە خواستراوەکان بچێتە بەر هەڵسەنگاندنی بەردەوام.

هەروەها لە دیاریکردنی ئامانجە کورتمەوداکاندا وردی بکرێتە پیشە، دەبێ ئامانجەکانیش وەدیهێنانیان کردەیی و رێتێچوو بن، پلانی راگەیاندیش پێویستی بە ژمارەیەکی زۆری زانا و شارەزا و هونەری و پسپۆڕان هەیە لە زۆربەی ئەو بوارانەی کە پەیوەندییان بە راگەیاندنەوە هەیە.

## راگەیاندکار

کەسی راگەیاندنکار کەسێکی بەرپرسە لە جێبەجێکردنی کۆی ئەو شتانەی پێشتر باسمانکردن ، هەروەها بەرپرسیاریەتیی گەیاندنی راستی و زانیاری و ئەو هەواڵانەی لەسەر شانە کە بەشێوەیەکی زانستی و هونەریی کاریگەرەوە راڤەکراون، ئەو زانیاری لە سەرکردایەتییەکانی دەنگی جەماوەرەوە دەگەیەنێت(ئەو رۆڵی نێوەند و کەسی سێیەم دەبینێت).

## ئامرازەکانی راگەیاندن

★ راگەیاندنی رۆژنامەوانی: بریتییە لە پەخشکردن و پێشکەشکردنی زانیاری و هەواڵ و راستی و پرس و هزرەکان لە رێگەی رۆژنامە و گۆڤارەکانی گشتی و تایبەت کە تیایدا سوود لە وشەی چاپکراو و وێنە وەردەگرێت. کۆنگرەکانی رۆژنامەوانی

رۆڵێکی مەزن و تایبەتیان هەیە بەتایبەت ئەگەر بەشێوەیەکی گونجاو پلانی بۆ دابندرێت. رۆژنامەوانیی ئازاد پێگەیەکی هێندە گرنگی داگیر کردووە کە زۆر کەس پێیدەڵێن دەسەڵاتی چوارەم.

لە تایبەتمەندییەکانی راگەیاندنی رۆژنامەوانی وەرزیبوون و دووبارەکردنەوە و بەخشینی سەربەستیی هەڵبژاردنی کاتی گونجاوە و لە هەر کاتێکدا ئەو دەرفەتە بە خوێنەر دەبەخشێت چاو بە بابەتەکاندا بخشێنێتەوە، ئەو توانایەشی پێدەبەخشێت ئەصلی مادە راگەیاندنیەکە بپارێزێت و دەتوانرێ بەشێوەیەکی بەربلاو پەخشبکرێت و تێچوونیشی هەرزانە. بەلام کەموکورتی و لایەنە نەرێیەکانی راگەیاندنی رۆژنامەوانی ئەوەیە کە پێویستی بە زانینی خوێندن و نووسین هەیە، جگە لەمەیش زۆربەی خوێنەران تەنها مانشێتەکان و هەندێ ناوونیشانی کورت دەخوێننەوە (مەبەست کردەی پەراوێزکردنە).

**راگەیاندنی رادیۆیی:** راگەیاندنی رادیۆیی بریتییە لە پەخشکردن و پێشکەشکردنی زانیاری و هەواڵ و راستی و بابەت و رووداو و هزر و بیروبۆچوونەکان لە رێگەی پەخشکەرەوە (رادیۆ). ئامانجیشی پەخشکردنی رۆشنبیری و پاراستنی بەهایەکانی زانستی و هونەری و نەتەوەیی و ئاکاری و ئاینییەکان و چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەڵایەتی و هاندانی بەهرە و داهێنانەکان و سەرگەرمکردنی جەماوەرە.

لە تایبەتمەندییەکانی راگەیاندنی رادیۆیش ئەو زیندوویەتییەیە کە دەنگی مرۆیی و مۆزیك و گۆرانی و نواندن و گفتوگۆیە راستەوخۆیەکان دەستەبەری دەکەن، هەروەها تایبەتمەندییەکی دیکەشی هەیە و گوێگر پێویستی بەهیچ لێکۆڵینەوەیەك و ئەزموونێکی پێشوو نییە. جۆراوجۆربوونی بەرنامەکانی رادیۆیی بەشێوەیەکە کە

خزمــەتی حــەز و ئاســتە جۆراوجۆرەکــانی رۆشــنبیریی دەکــات و لەگــەڵ گــشت تەمەنەکانیــشدا دەگونجێــت. بــەڵام لــە کەموکورتییــەکانی راگەیانــدنی رادیــۆیی جۆراوجۆربــوونی بەرنامەکانــە، ئەمــەیش لێناگــەڕێت بەدواداچــوون بــۆ پــەیامێکی دیاریکراوی راگەیاندن بکرێت. زۆرجاریش شەپۆلەکان تێکەڵ دەبن ئەمەیش ئاستی کوالیتیی پەخشەکە تێکدەدات و کردەی گوێگرتنەکەش شکست دێنێت. دیاریکردنی کاتی بەرنامەکانیش لەم جۆرە راگەیاندنەدا هەیە کە لەبەرچەندان هۆ خەڵك ناتوانێ گوێیان لێبگرێت.

**راگەیاندنی تەلەفزیۆنی:** بریتییە لە پەخشکردن و پێشکەشکردنی زانیاری و هەواڵ و راستی و بابەت و رووداوەکان لە رێگەی تەلەفزیۆنەوە.

لە تەلەفزیۆندا بەرنامەی رۆشنبیریی جۆراوجۆر و سەرتاپاگیر و ئاینی و منداڵان و ئافرەتان و ریکلام و ئاگادارکردنەوەی فێرکاری پێشکەش دەکرێت. بەهێزترین تایبەتمەندیی تەلەفزیۆن کۆکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی ئامرازەکانی بیستن و بینینە لە یەك کاتدا، ئەمەیش وەهای لێدەکات بەهێزترین ئامرازی راگەیاندن بێت لە رووی کاریگەرییەکەی لەسەر دەروون‌دا. کەموکورتیەکەیشی ئەوەیە تێچوونی زۆرە.

**راگەیاندنی سینەمایی:** پەخشکردن و پێشکەشکردنی زانیارییەکان و هەواڵ و راستی و بابەت و رووداو و هزر و بیروبۆچوونەکانە لە رێگەی سینەماوە.

لەتەك فیلمە ئاساییەکانیشدا فیلمی دیکۆمێنتاری و فێرکاری و ئاراستەکاری و زانیاریی گشتیش هەن. سوودەکانیشی ئەوەیە راگەیاندن و فێرکردن و سەرگەرمکردن بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، کەموکورتیەکەیشی ئەوەیە پێویستی بە کاتێکە دەبێ بۆی دیاریی بکرێت و رەنگە زۆرجار خەڵکان ئەو کاتەیان نەبێت.

**ریکلام:** بڵاوکردنەوە و پێشکەشکردنی زانیاری و هەواڵ و بابەتەکان و راستییەکان و هزر و بیروبۆچوونەکانە لە رێگەی هەر ئامرازێکی راگەیاندنەوە، بۆ راگەیاندنی پەیامێکی بازرگانی و هتد لە گشت بوارەکاندا کە ئامانجی دروستکردنی کاریگەرییەکی باشە لە دەروونی خوێنەران و گوێگران و بیسەران و بینەران. سوود و تایبەتمەندییەکانیشی ئەوەیە رۆڵێکی گرنگی لە دابەزاندنی نرخەکاندا هەیە. کەموکورتییەکانیشی ئەوەیە پێویستی بە پارەیەکی قەبەیە کە زۆربەی جار لەسەر حیسابی بەکاربەر و کرێکارانە. هەروەها رەنگە وێنەی کرچوکاڵ و رەنگی زۆر زەقی تیادا بەکاربێت کە ئەمەیش دەبێتە هۆی تێکدانی لایەنی ئاکاری و سەلیقە و چێژ.

**راگەیاندن بە پیشانگەکان:** بریتییە لە پێشکەشکردنی زانیاری و راستی و بابەتەکان لە رێگەی پیشانگەیەك کە لە شوێنێکی گونجاودا دەکرێتەوە، رەنگە گشت ئامرازەکانی دیکەی راگەیاندنیشی تیادا بێت وەك نامیلکە و پەخشکراوەکانی سەر دیوار و لافیتە و نموونەی بەرجەستە و ئاگادارییەکان، هەروەها رەنگە پیشانگەکە گشتی یانیش تایبەت و نێونەتەوەیی یانیش ناوخۆیی بێت.

★ **راگەیاندن لەرێگەی سەرکردەکانی راوبۆچووندار:** پێشکەشکردنی زانیاری و هەواڵ و بابەت و رووداو و هزرەکانە لە رێگەی راوبۆچوون و سەرکرد راستەوخۆیەکانی کۆمەڵەکانەوە، بەلام مەرجە ئەو کەسانە کاریگەرییەکی سەرکردەییان هەبێت وەك مامۆستا و پیاوانی ئاینی و سەرۆکی سەندیکا و دەستە و دامەزراوەکان.

# پەیوەندییەکانی گشتی Rublic Relation:

پەیوەندییەکانی گشتی: ئەو هەوڵ و کۆششە بەردەوامە پلاندارانەن کە بەڕێوەبەرایەتیی دەستگەیەك ئەنجامی دەدات بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنی دوولایەنە و پەیوەندیی دروستی نێوان دەستگەکە و ئەو جەماوەرەی کە لە دەرەوە و ناوەوە بەهۆی پەخشکردن و راگەیاندن و پەیوەندیی کەسییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، بەشێوەیەك لە کۆتاییەکەیدا هەماهەنگیی نێوان دەستگەکە و رای گشتی بێتەدی، ئەمەیش سێ لایەنی گرنگ دەگرێتەوە:

* هەڵسەنگاندن و پێوانی رای گشتی و روونکردنەوەی رەهەند و روخسارەکانی جەماوەر لەناوەوە و دەرەوەی دەستگەکەدا و هەماهەنگی کردن لەگەڵیدا.
* دانانی بەرنامەی چاك بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم مەبەستە.
* بەکارهێنانی ئامرازی کاریگەر بۆ کاریگەری دروستکردن لەسەر رای گشتی.

## سایکۆلۆژیای پەیوەندییەکانی گشتی:

پیاوانی کار گرنگیی بە شرۆڤەکردنی بیروبۆچوون و ئاراستەی تاك و کۆمەڵەکان و پاڵنەری رەفتارەکانی کۆمەڵایەتی و دروستکردنی کاریگەری و گۆڕان دەدەن.

گرنگترین لایەنەکانی دەروونی لە پەیوەندییەکانی گشتیدا ئەوەیە کە پسپۆڕەکانی لەگەڵ مرۆڤدا مامەڵە دەکەن (تاك و کۆمەڵەکان) کە لە رووی کەسێتی و بەها و پێوەرو بیروباوەڕ و پێداویستی و پاڵنەرەکانەوە جیاوازییان لەنێواندا هەیە. لەبەرئەوە لەسەر کەسانی بواری پەیوەندییەکانی گشتی پێویستە لەسەر بنەمای هاوکاری و خۆشەویستی بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانی مرۆیی بەشێوەیەکی زانستی و بابەتی

شرۆڤەی رەفتاری تاك و کۆمەڵەکان بکەن، هەروەها پیاوی سەرکەوتووی کار متمانە بەخۆی و زانستەکەی دەکات و متمانەی خەڵك وەدەستدەهێنێت، روونترین ئامانجەکانی پەیوەندییەکانی گشتیش رەچاوکردنی پەیوەندییە ساغ و دروستەکانی مرۆییە لە کۆمەڵگە و وەدەستهێنانی خۆشەویستیی جەماوەر و کاریگەریی دروستکردن لەسەر رای گشتی و وەدەستهێنانی پشتگیرییەکەی و رەخساندنی کەشێکی دروستی دەروونییە.

## ئەرکەکانی پەیوەندییەکانی گشتی

* لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی ئاراستەکانی رای گشتی و کاردانەوەکانی جەماوەر.

* پلانرێژی و کێشانی سیاسەتی پەیوەندیی گشتی لە دەستگە و پلاندانان و دامەزراندنی پەیوەندیی دروست و تێکگەیشتنی دوو لایەنەی نێوان دەستگەکە و دەستگەکانی دیکە هەروەها لەنێوان دەستگەکە و ئامرازەکانی راگەیاندن و پەیوەندیی نێوان دەستگەکە و دامەزراوەکانی حکومەتی.

* هەماهەنگی دروستکردن لەنێوان دەستگەکان و بەرژەوەندییەکانی جۆراوجۆر لەنێو کۆمەڵگەدا بۆ وەدیهێنانی هەماهەنگی لە کارلێکی کۆمەڵایەتیانەی کۆمەڵگە.

* پێشکەشکردنی راوبۆچوونی هونەری بە ئەنجوومەنی بەڕێوەبردن و بەشداریکردن لە دانانی پلان بۆ سیاسەتی دەستگەکە و ئاگادارکردنەوەی بەڕێوەبەرایەتیی دەستگەکە و راڤەکردنی خزمەتگوزارییەکانی و ئەو رۆڵەی کە ئەنجامی دەدات بەشێوەیەکی سادە و ئاسان و راستگۆیانە.

* بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵانەی پەیوەندییان بە دەستگەکەوە هەیە و پشتگیریی رای گشتی وەدەستدەهێنێ.

* دروستکردنی پەیوەندیی دۆستانە کە لەسەر بنەمای تێگەیشتنی دوولایەنەی نێوان دەستگەکە و تاکەکان و نێوان خودی تاکەکان و نێوان کۆمەڵەکانی ناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵەکەدا داڕێژراوە.

* خزمەتکردنی کارگەران و گرنگی پێدانیان لە رووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و تەندروستییەوە.

## بنەما و رێبازەکانی پەیوەندییەکانی گشتی:

★ دەستپێکردن لەنێو خودی دەستگەکە و کارکردن بۆ دۆزینەوەی تێگەیشتنی دوو لایەنە لەنێوان دەستگەکە و گشت ئەو کەسانەی کاری تیادا دەکەن.

* رەچاوکردنی راستگۆیی و دەستپاکی لە راڤەکردنی کۆی ئەو شتانەی کە لە دەستگەکە دەردەچن، ئەمەیش بۆ وەدیهێنانی متمانەی جەماوەرە.

* پابەندبوون بە شێوازی پیشەیی و ئامانجەکانی کار و گرتنەبەری بنەما و بەهایە بەرزەکان لە گشت رەفتارێکدا.

* دوورکەوتنەوە لە وەرگرتنی هەڵوێستی بەرگریکردن و داپۆشینی لایەنە خراپەکان و سەرلێشێواندن.

* پیشاندانی راستییەکان بەشێوەیەکی راشکاوانە و روون و نەشاردانەوەیان.

* بەشداریکردن لە خۆشگوزەرانیی کۆمەڵگە، ناشبێ تەنها بە پێشکەشکردنی زۆرترین قازانجی مادی دەست هەڵبگیرێت.

* هاوکاریکردن لەگەڵ دەستگەکانی دیکە و رەزامەندی و رێککەوتن لەسەر هێڵەسەرەکییەکان لە کەشی پەیوەندییەکانی گشتی بۆ وەدیهێنانی سەرکەوتن.

* پێڕەوکردنی ڕێبازەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی لە چارەسەرکردنی گشت گرفتێکدا بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی دروست کە لەسەر بنەمای واقیع داڕێژرابێت.

## ئەوانەی لە پەیوەندییەکانی گشتیدا کار دەکەن:

ئەو کەسانەی لە پەیوەندییەکانی گشتیدا کار دەکەن دەبێت چەندان سیفەتیان هەبێت، لەوانە:

* پێگەیشتن و کامڵی لە کەسێتیدا بەشێوەیەکی جەستەیی و ئەقڵی و کۆمەڵایەتی و هەڵچوونی.

* زیرەکیی گشتی و توانای داهێنان و نوێگەری و بیرکردنەوەی لۆژیکی و نووسینی باش و گوزارشتی روون و توانای باوەڕپێهێنان.

* هێمنیی هەڵچوونی و خۆگری و گەشبینی.

* توانای مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵك بە شێوازێکی هاوکارانە و متمانەکردن بە جەماوەر و پێکهێنانی پەیوەندیی باش لەگەڵ سەرۆکەکانی کار و توانای لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵایەتی.

* بەڕێزی و لێهاتوویی و راستگۆیی و دەستپاکی و دادپەروەری و قیافەی باش و ئاکاری جوان و ڕێکوپێکی.

* زانیارییەکی تەواو لە هەمبەر راگەیاندن و ئامرازە جۆراوجۆرەکانی و خوێندنی دەروونناسی بەتایبەتیش دەروونناسیی کۆمەڵایەتی.

## پلانی دانانی بەرنامەکانی پەیوەندییەکانی گشتی

دەبێ پلانی بەرنامەکانی پەیوەندییەکانی گشتی لەسەر بنەمای وەدیهێنانی ئەم ئامانجانە دابڕێژرێت:

* ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی سیاسەتی دەستگە و ئامانجەکانی بۆ جەماوەر.

* لادانی ئەو کۆسپوتەگەرانەی دەکەونە بەردەم دەستگەکە.

* وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی جەماوەر لەهەمبەر کاری دەستگەکە.

* بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوی و دابینکردنی هاوکاری بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکان.

* ئاراستەکردنی بەڕێوەبەرایەتیی دەستگەکە لەبارەی پلانی دەستگەکە.

* دەبێ شرۆڤەی جەماوەر لەناوەوە و دەرەوەی دەستگەکە بەشێوەیەکی تێروتەسەل ئەنجام بدرێت.

* دەبێ پلانەکە لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە دابنرێت.

* دەبێ پشت بە پەیوەندیی ڕاستەوخۆ ببەستی بە جەماوەرەوە.

* دەبێ ئەو بەرپرسیاریەتانە دیاریی بکات کە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵەوە پەیوەندییان بە جێبەجێکردنی پلانەوە هەیە.

* دەبێ ئامانجی سەرەکی ئەوە بێت سیاسەت و چالاکییەکانی کۆمەڵەکە بە جەماوەر بناسێنێت.

جۆرەکانی پلاندانانیش ئەمانەن:

* پلانی خۆپارێزیی کورتمەودا.

* پلانی خۆپارێزیی دوورمەودا.

* پلانی چارەسەرکار بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان.

* پلاندانان بۆ دۆخەکانی کتوپڕ و گرفتەکانی کتوپڕ.

## بوارەکانی پەیوەندیی گشتی

١. پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ جەماوەری ناوەخۆیی (لەگەڵ کارگەرانی نێو دەستگەکە).

٢. پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ جەماوەری دەرەکی (کڕێکاران و بەشداران و هاوبەشان و دابەشکاران و هتد.)

٣. پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ کۆمەڵگەی ناوخۆیی.

٤. پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ ئامرازەکانی ڕاگەیاندن.

٥. پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ دەستگەکانی حکومی.

| بوار | ئامانج | ئامرازەکانی وەدیهێنانی ئامانجەکان |
| --- | --- | --- |
| بواری پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ کۆمەڵگەی ناوخۆیی | -بەخشینی هەواڵ و سیاسەت و سیستمەکانی دەستگەکە.<br>- ڕاکێشانی زۆرترین کارگوزار و کارگەر لە ڕۆڵەکانی کۆمەڵگەی ناوخۆیی<br>-بەشداریکردن و وابەستەیی بە ژینگەی ناوخۆیی و بەشداریکردن لە پێشخستن.<br>- هاوکاریکردن و دروستکردنی پەیوەندیی چاك لەگەڵ دەستگەکانی | -پەیوەندییەکانی کەسی و سیاسەتی دەرگەی کراوە.<br>-سەردانیکردنی کەسێتییە گەورەکانی دەستگەکە.<br>- داوەتکردنی تاکەکانی کۆمەڵگە بۆ سەردانیکردنی دەستگەکە.<br>- ڕاگەیاندن بە ڕۆژنامە و گۆڤار و فیلم و چاپەمەنییەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| | دیکە.<br>– راستکردنەوەی ئەو زانیارییە نادروستانەی کە بەهۆی کێبڕکێکردنەوە لە مێشکی تاکەکان دروستبووە | – شرۆڤەکردنی پێکهاتەی کۆمەڵگەی نێوخۆیی لە رووی جۆری تەمەن و رەگەز و ئاستی بژێوی و رۆشنبیری و ئاراستەکان. |
| پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ ئامرازەکانی راگەیاندندا | – پتەوکردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ کەسانی رۆژنامەنووس و راگەیاندنکارانی نێو رادیۆ و تەلەفزیۆن و ئامرازەکانی دیکەی راگەیاندن.<br>– کۆکردنەوەی گشت ئەو شتانەی کە سەبارەت بە دەستگەکە و دەستگەکانی دیکە دەنووسرێن.<br>– پەخشکردنی زانیاری و داتاکان بۆ گەیشتن بە زۆرترین ژمارەی جەماوەر. | – دەرکردن و چاپکردنی رێنمای دەستگەکە.<br>– دەرکردنی گۆڤاری تایبەت بە دەستگەکە.<br>–سەرپەرشتیکردنی بەرهەمهێنانی فیلمەکانی راگەیاندنی تایبەت بە دەستگەکە.<br>– پەیوەندیی کەسی و داوەتکردنی خەڵك بۆ ئاهەنگەکان و لایەنەکانی دیکەی چالاکییەکان. |
| پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ دەستگەکانی حکومەت | –پاڵپشتیکردنی هەموو ئەو شتانەی کە پەیامی دەستگەکە لەپێناو خزمەتی نیشتمان وەدیدێنێت.<br>– ئاگادارکردنەوەی دەستگەکانی حکومەت لەهەمبەر چالاکییەکانی دەستگەکە.<br>– پاڵپشتیکردنی پەیوەندییەکانی کەسی لەنێوان دەستگەکە و دامەزراوە و بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکانەوە. | – پەیوەندیی راستەوخۆ بە کەسێتی و بەرپرسانی.<br>– بەخشینی بڵاوکراوەکان بە دەستگەکانی حکومەت.<br>– داوەتکردنی بەرپرسانی حکومی بۆ ئامادەبوون لە وانە و سیمینارانەی کە لە بۆنەی جۆراوجۆردا بەڕێوە دەبرێن. |

| | | |
|---|---|---|
| پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ جەماوەری نێوخۆیی | - کارکردن بۆ یەکگرتوویی ناوخۆیی کۆمەڵە و پەیوەندییە باشەکان.<br>- بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری لەنێوانیاندا و ئاگادارکردنەوەیان لەهەمبەر بەرپرسیاریەتیان بۆ کۆمەڵگە و گرنگیی رۆڵیان لە پێشکەوتنی نیشتمان.<br>- چاندنی تۆوی متمانە و دڵنیایی لە دەروونیان.<br>- بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری و رێنمایی بە ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاستیان.<br>-بەرزکردنەوەی توانای بەرهەمهێنان و هاندانی پەیوەندیی نێوانیان و نێوان بەڕێوەبەرایەتییەکەیان و دابینکردنی خزمەتگوزاریەکانیان.<br>- نۆژەنکردنەوەی بنەمای پیاوی گونجاو لە شوێنی گونجاو بۆ دابینکردنی سەقامگیری لە کاردا.<br>- نزیککردنەوەی نێوانی کارگوزاران لە بەشەکانی جۆراوجۆر و ئاگادارکردنەوەیان بەوەی کە یەک کۆمەڵەی یەکگرتوون.<br>- بەخشینی ئەو زانیاریانەی داوای دەکەن.<br>- هاندانیان بۆ پاڵپشتیکردنی | - بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەی خولی و دامەزراندنی لیژنەی هاوبەش لەنێوان بەڕێوەبەرایەتی و تاکەکان بۆ شرۆڤەکردنی حەزەکانیان.<br>- پەیوەندیی کەسی راستەوخۆ لە رێگەی چالاکییەکانەوە.<br>- بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەی تایبەت بە هەڵبژاردنی کارگوزاران و سیستمی پاداشت و سەرمووچە بەرزکردنەوە و دیاری و مۆڵەتەکان.<br>- ناردنی وتارەکانی کەسی و بیتاقەکان لە بۆنەکاندا.<br>- بەخشینی پاداشتی هاندەرانە.<br>- داوای نەخۆشەکان لە نەخۆشخانە و ماڵەکاندا.<br>- پێڕەوکردنی سیاسەتی دەرگەی کراوە لەنێوان بەڕێوەبەرایەتی و نێوانیان.<br>- سووربوون لەسەر سەروەریی یاسا لە مامەڵەکانیان. |

| | | |
|---|---|---|
| | ناوبانگی دەستگە لەلای جەماوەری دەرەکی. | – بەڕێوەبردنی ئاهەنگەکان و بەرنامەکانی خۆشگوزەرانی و گەشت و سەیران.<br>– بەشداریکردنیان لە بەڕێوەبردن و دانانی سیاسەتەکان.<br>– دامەزراندنی سیستمی دروستکردنی سکاڵا بۆ شرۆڤەکردنی گرفتەکانیان. |
| پەیوەندییەکانی گشتی لەگەڵ جەماوەری دەرەکی | – دروستکردنی پەیوەندیی باش و تێکگەیشتنی دوولایەنە.<br>– وەدەستهێنان و گەشەپێدانی متمانەی دوو لایەنەی نێوان دەستگە و نێوانیان.<br>– هاندانیان بۆ پاراستنی مامەڵەیان لەگەڵ دەستگەدا.<br>– شرۆڤەکردنی گروپەکانیان و ئاراستەکانیان و راوبۆچوونەکان و حەزەکانیان.<br>– شرۆڤەکردنی گرفتەکانیان و هەنگاونانی ئەرێیی بۆ چارەسەرکردنیان.<br>–دروستکردنیئەو پەیوەندییانەی کە هاوڕێیەتی و هاوکاری و یەکگرتوویی لەگەڵ رکابەرەکاندا دروستدەکەن. | – پەیوەندیی کەسی راستەوخۆ و چاوپێکەوتنە تاکەکەسی و بەکۆمەڵەکان.<br>– ئەنجامدانی سەردانەکان و رێکخستنی سەردانەکانی بەرپرسانی دەستگەکە بۆ گەورە بەرپرسان و داوەتکردنیان بۆ دەستگەکە بۆ وەدەستهێنانی متمانە.<br>– بەڕێوەبردنی ئاهەنگە تایبەتەکان لە بۆنەکان و داواتکردنیان.<br>– پێشکەشکردنی دیارییەکانی یادگاریی و بەخشینی دیارییە ماندەرەکان.<br>– ئەنجامدانی کۆبوونەوەی تایبەت بە دەستگە و داوەتکردنیان.<br>– بەڕێوەبردنی وانەی گشتی و |

| | | |
|---|---|---|
| | -گواستنەوەی هزرەکانیان و راوبۆچوونەکانیان بۆ بەڕێوەبەرایەتیی دەستگە .<br>- هاندانیان بۆ ئەوەی ئەو زانیارییانە پێشکەش بە دەستگە بکەن کە دەتوانن بیبەخشن. | بەشداریکردن لە سیمینارەکان.<br>- هاوکاریکردن لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتییەکانی دیکە لە دەستگەدا لە راهێنان پێکردنی کارگوزاران بۆ چۆنیەتیی پەیوەندی گرتن لەگەڵ جەماوەری دەرەکی |

# پڕوپاگەندە Propaganda

بڵاوکردنەوەی زانیارییە بەپێی ئاراستەیەکی دیاریکراو لە لایەن تاک یان کۆمەڵەوە وەك هەوڵدانێکی سیستماتیك بۆ کاریگەری دروستکردن لە رای گشتی و گۆڕینی ئاراستەکانی تاکەکان و کۆمەڵەکان بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی راگەیاندن و پەیوەندیی جەماوەرییەوە. ئامانجی پڕوپاگەندە سەرکردایەتیکردنی تاکەکان و کۆمەڵەکانە بۆ وەرگرتنی بیرۆکەیەك، یان ئەنجامدانی کارێك کە سەربەستیی ئەوەیان هەیە ئەنجامی بدەن یانیش ئەنجامی نەدەن. پڕوپاگەندە وتوێژ لەگەڵ تاك و کۆمەڵەکاندا دەکات بەمەبەستی ئاراستەکردنی هزر و رەفتار و وەدەستهێنانی دەرەنجامێکی دیاریکراو.

## بانگخواز

پیاوێکی گشتییە خۆی بەو پرسانەوە سەرقاڵدەکات کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵەوە هەیە، بەردەوامیش لەگەڵ جەماوەری کۆمەڵگەیەکدا لە پەیوەندی دایە. بانگخواز پێویستی بەوەیە رۆشنبیرییەکی گشتی و فراوان و شارەزاییەکی زۆر و کەسێتییەکی خۆشەویست و سەرنجڕاکێشی هەبێت و سایکۆلۆژیای جەماوەری خوێندبێتەوە، دەبێ وتاربێژ و نووسەرێکی کاریگەریش بێت.

## جۆرەکانی پڕوپاگەندە

١. پڕوپاگەندەی ئاینی: یەکەمین جۆری پڕوپاگەندەیە.

٢. پڕوپاگەندەی سپی: (ئاشکرا): ئامانجەکەی روون و بونیادنەرانەیە و تیایدا بانگخواز خۆی ئاشکرا دەکات و مەبەستەکانی بەدیاردەخات.

٣. پڕوپاگەندەی سیاسی:

٤. پڕوپاگەندەی بازرگانی: (بۆ پرۆژە و بەرهەمەکان).

٥. پڕوپاگەندەی رەش (دەمامکدار): لەسەر بنەمای بەرزکردنەوەی دروشمی بریقەداری وەك سەربەستی و شۆڕشگێڕی و هتد بونیاد دەنرێت و چەندان شێواز و قاڵب لەخۆ دەگرێت و دروستدەکات (دیکتاتۆرییەکان، سەهیۆنیزم، داگیرکەران، تیرۆرستان) هەروەها چەند هاوواتایەکی وەك (فیرعەونییەکان لە جیات میسرییەکان) بەکاردێنن و وێنەی کاریکاتێری و گاڵتە و لاقرتێش بەکاردەهێنن.

٦. پڕوپاگەندەی دژ: لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی پڕوپاگەندەی هەڵە و ئاشکراکردن و هێرشکردنە سەری بەشێوەیەکی راستەوخۆ بونیاد دەنرێت.

### ئامرازەکانی پڕوپاگەندە:

گرنگترین ئەو ئامرازانەی لە هێرشی پڕوپاگەندەدا بەکاردێن ئەمانەن:

١. ئامرازەکانی دەنگی: رادیۆ، سروودەکان، گۆرانییەکان، وتارەکان، دەنگۆ.

٢. ئامرازەکانی بینراو: پیشانگەکان، میهرەجانەکان، ئاماژەکانی تیشکی، رەنگەکان، پەیکەرەکان، پۆشاکەکان، نیشانەکانی سەر سنگ و مل، پەیکەری یادەوەری تذکاری، نیشانەکانی بازرگانی.

٣. ئامرازەکانی دەنگیی بینراو: فیلمەکانی سینەمایی، تەلەفزیۆن، شانۆگەرییەکان.

٤. چاپکراوەکان: رۆژنامەکان، گۆڤارەکان، کتێبەکان، بڵاوکراوەکان، لافیتەکان، هەڵوسراوەکان.

٥. دەستگە و شاندەکان: رۆشنبیری، وەرزشی ، ئەو شاندانەی دەنێردرێنە دەرەوە.

٦. کۆبوونەوەکان: کە لە هەڵمەتەکانی پڕوپاگەندەکانی هەڵبژاردندا ئەنجام دەدرێت.

٧. کۆنگرەکانی رۆژنامەوانی: لە پڕوپاگەندەکانی سیاسیدا ئەنجام دەدرێت.

## سایکۆلۆژیای پڕوپاگەندە

پڕوپاگەندە ورووژێنەرێکی دەرەکییە و کار لە رەفتاری تاك و کۆمەڵگە دەکات، گرنگترین ئەو شێوازانەی پڕوپاگەندە بەکاریاندەهێنێت سرووشبەخشین و دروستکردنی حەز و باوەڕپێهێنان و حەزی تاك بۆ لاساییکردنەوە بەکاردێنێت. گرنگترین شێوازە گرنگەکانیش دووبارەکردنەوە و بەردەوام راکێشانی سەرنج و هەمەجۆرکردن و کورتکردنەوەیە. پڕوپاگەندە کاریگەریی کۆمەڵەی مەرجەعی لە رەفتاری تاکەکان بەکاردەهێنێت، لێرەوە پشت بە پێداویستیی خەڵك بۆ خۆ گونجاندن لەگەڵ کۆمەڵە بەکاردێنێت. لە بنەمایەکانی پڕوپاگەندەش هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە راکێشانی سەرنجی زۆرترین ژمارەی جەماوەر و پشتبەستن بە حەز دروستکردن و جوولاندنی حەز و هاندان و هێنانەوەی نموونە و پێشکەشکردنی نموونەکان.

پڕوپاگەندە یارمەتیدەری پێکهێنانی بیروبۆچوون و گۆڕینی ئاراستەکان و هەموارکردنەوەی رەفتارە، لەبەرئەوە دەبێ شرۆڤەی رای گشتی و ئاراستەکان و رێگەکانی گۆڕین و هەموارکردنەوەی رەفتار بکرێت. پڕوپاگەندە قەرەبەقەرەی پێداویستییەکانی دەروونی دەڕوات، لەبەرئەوە دەبێ شرۆڤەی پێداویستییەکانی بانگهێشتراوەکانی وەك ئاسایش و پێگە و خۆشگوزەرانی و شارەزاییەکانی نوێ بکرێت. هەروەها کەسی بانگخواز جەخت لەسەر شتەکان دەکاتەوە بۆ وەدیهێنانی

پێداویستییەکانی وەك سەقامگیریی خانەوادەیی و ئابووری و ئاسایشی کەسی و نەتەوەیی و هتد، بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانیشی نەوازشی هەڵچوون و سۆزەکان دەکات و خۆشەویستی و دۆستایەتی و هەستوسۆزی جەماوەر دەدوێنێ، گوێڕتاوی جەماوەریش دەوروژێنێت و بەڵێنی وەدیهێنانی ئەو شتانە دەدات کە لە دەروونیدا خۆشەویستن.

گرنگترین شێوازەکانی پڕوپاگەندەی سەرکەوتوو شرۆڤەکردنی سایکۆلۆژیای جەماوەرە، گرنگترین بنەمایەکانیشی هەڵبژاردنی ساتە سایکۆلۆژییەکان و کاتە گونجاوەکانە بۆ پیشاندانی هزرەکان و بیروبۆچوون و ئەو راستییانەی پەیوەندییان بە پڕوپاگەندەکەوە هەیە. کەسی بانگخواز و پڕوپاگەندەکار سوود لە رووداوە گرنگەکانی وەك: وەك سەرکەوتنەکان و جێژنێکی نەتەوەیی و بۆنەیەکی ئاینی و هتد دەبینێ. سوود لە هەڵوێستە لێڵ و تەمومژاوییەکانیش دەبینێ. لێرەوە ئەو شتانە روونەکاتەوە کە لەلای جەماوەر لێڵ و شاراوەن، ئەمەیش بەشێوازێك بەڕێوەدەبات کە خزمەت بە ئامانجەکانی بکات.

## کاریگەریی پڕوپاگەندە لەسەر رەفتاری تاك و کۆمەڵ

بلاوبوونەوەی پڕوپاگەندە و کاریگەرییەکەی لەسەر رەفتاردا لەسەر کەس و کات و شوێن دەوەستێت، چوونکە پڕوپاگەندە لەو کەسانە دابڕاو نییە کەوا لە رووی ناوبانگو شارەزایی و هێزی کێشکردن و ئاستی متمانەی جەماوەر پێیان و ئامانج و ئامرازەکانیان کە ئاخۆ کارایە یان ناکارا، ئەنجامی دەدەن. هەروەها لەو کەسانەش دانابڕێت کەوا کەوتوونەتە بەر کاریگەریی پڕوپاگەندەوە لە رووی تایبەتمەندی و

پێداویستی و ئاراستە و ئاستی فێرکردن و رۆشنبیرییان کە ئاخۆ پروپاگەندە پەسند دەکەن یانیش نا، هەروەها لەو هەڵوێستە کۆمەڵایەتیانەش دابڕاو نییە کە تیایدا روودەدات لە رووی شوێن و پروپاگەندەکەوە کە ئاخۆ قبوڵی دەکەن یان نا. ئەگەر هاوسەنگیی کۆمەڵگە تێکچوو و شۆڕشی سیاسی تیایدا سەریهەڵدا یان گۆڕانێکی تەکنۆلۆژی و ئابووری و کۆمەڵایەتی تیایدا سەریهەڵدا، ئەوا کاریگەریی پروپاگەندە پتر دەبێت، بەڵام هەرچەندە گونجان و هاوسەنگی لە کۆمەڵگەدا پتر بوو، کاریگەرییەکەی کەمتر دەبێتەوە. پێویستیش نییە کاریگەرییەکەی راستەوخۆ بێت، بەڵام رەنگە کاریگەرییەکی دوورمەودای لەسەر رەفتاردا هەبێت. لەوانەشە ببێتە هۆی کاریگەرییەکی پێچەوانەیی، چوونکە رەنگە کەسی بانگخواز و پروپاگەندەکار ببێتە قوربانیی ئەو شتەی هیوای بۆ دەخوازێت، واتا درۆ بکات بۆ ئەوەی باوەڕ بەخۆی بهێنێت.

## شرۆڤەکردن و شیکردنەوەی پروپاگەندە

لە شرۆڤەکردن و شیکردنەوەی پروپاگەندەدا جەخت لەسەر هەڵمەتی پروپاگەندە و زانینی سەرچاوەکەی و ئامانج و ناوەڕۆك و ئامرازەکانی دەکرێتەوە، هەروەها جەخت لەسەر ئەو هەڵوێستانەش دەکرێتەوە کە لە چوارچێوەیدا بەڕێوە دەبرێن و جەخت لەسەر کاریگەرییە رەفتارییە کۆمەڵایەتییەکانیشی دەکرێتەوە، لە رووی:

– لەرووی سەرچاوەکەیەوە، دەبێ سەرچاوەکەی بزاندرێت و جەختی لەسەر بکرێتەوە ئەوەیش بزاندرێ کەوا کێ ئەنجامی دەدات.

- هەروەها لە رووی ئامانجەکەیەوە: دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئاخۆ لە پێناو بەرژەوەندیی نەتەوەیە یانیش لەپێناو سوودی دەستگە و تاك و کۆمەڵەیەکە یانیش پڕوپاگەندەیە بۆ هزرێکی نوێ و پارتێکی سیاسی.

- لە رووی ناوەڕۆکەکەیەوە، دەبێ شرۆڤەی ناوەڕۆکی بەرنامەکانی ئێستگەیی و تەلەفزیۆنی و بەدواداچوونەکانی رۆژنامەوانی و مادەی کتێبان و بڵاوکراوەکان بکرێت و ئەوە شیبکرێتەوە کە ئاخۆ چەندە فرۆفێڵی پڕوپاگەندەیی تیادایە.

- لە رووی ئامرازەکانیەوە: دەبێ شرۆڤەی گونجانی بکرێت لەگەڵ پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و بەهاکانی ئاکاری و ئاینی و هتد.

- لەرووی کاریگەرییە رەفتارییە کۆمەڵایەتییەکانییەوە، دەبێ شرۆڤەی ئاستی کاریگەرییەکەی بکرێت لەسەر تاك و کۆمەڵەکان و ئاستی گۆڕینی ئاراستە و رەفتارەکانیان و هتد.

# ئاگاداری وریکلام Advertising

ئاگاداری بریتییە لە پەخشکردنی زانیاری و داتایەکان سەبارەت بە هزر و کاڵا و خزمەتگوزارییەکان و ناساندنیان لە جۆرەها ئامرازی راگەیاندن لە بەرانبەر کرێیەکدا بەمەبەستی دروستکردنی پەسندکردنی جەماوەر لە هەمبەریدا.

ئەو کەسانەی لە ئاگادارییەکاندا کار دەکەن:

- راگەیەنەر: بریتییە لە بەرهەمهێنەری کاڵا و خاوەن بیرۆکەکە جا ئەگەر تاکەکەسێك بێت یانیش دەستگەیەك بێت.

- ئاژانسی ئاگادارکردنەوەکان: کۆمپانیا یان دەستگەیەکی پەخش و ئاگادارکردنەوەیە و زانیارییەکان لە راگەیەنەرەکان وەردەگرێت و لە ئامرازە جۆراوجۆرەکانی خۆیدا بلاْویاندەکاتەوە.

## ئامرازەکانی ئاگادارییەکان

رێگەی بەکارهاتوون بۆ گواستنەوە و گەیاندنی پەیامی راگەیاندن بە جەماوەر، گرنگترین ئامرازەکانی ئاگادارییەکانیش، وێنەکانی سەردیوار و تابلۆیەکانی ئاگادارییەکان و هەڵواسراوەکان و فلێکس و بلاْوکراوە تیشکییەکان و لافیتەی ئاسایین، هەروەها ئامرازەکانی هاتووچوو و پەنجەرەی شوێنە بازرگانییەکان و پیشانگەکان و رۆژنامە و چاپکراوەکان و سینەما و تەلەفزیۆن و رادیۆ و تیشێرتی یاریزانەکان، و یاریگەکانیش بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن.

## ئاگاداری و ریکلام و کاریگەرییەکەی لەسەر تاك و کۆمەڵە

ئاگاداری رۆڵی ئاراستەکردن و سەرنجڕاکێشان دەبینێت و پتر بەرەو رەمەك و پاڵنەر و هەڵچوونەکانی مرۆڤ دەچێت نەك هزر و ئەقڵ، ئەمەیش لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجەکانیەتی. ئامانجی هەموارکردنەوە و دەستکاریکردنی رەفتارەکانە وەك بڕیاردان لەسەر کڕینی شتێك یان وەرگرتنی بیرۆکەیەك یانیش سوود وەرگرتن لە خزمەتگوزارییەك. گرنگترین ئامانجی ئاگاداری و ریکلامەکانیش رەواجدانی راستەوخۆیە بە کاڵا و خزمەتگوزاریەك و هاندانی جەماوەر و راکێشانیەتی بەرەو راکێشانیان و بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەویی کڕێکاران، ئەمەیش بە زەقکردنەوەی سیفەتە باشەکانیان و رێگەکانی رەفتارکردنیان لەگەڵ خەڵکدا دێتەدی. دەبێ رەچاوی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و ئاراستەکانی دەروونی و رای گشتی بکرێت. هەروەها ئامانجی ئاگادارییەکان پێڕاگەیاندن و سوودبەخشین و باوەڕپێهێنان و هاندانی مرۆڤە بۆ ئەنجامدانی رەفتارێك لە ژێر تیشکی ئەو شتەی لە ئاگادارییەکەدا هاتووە.

## سایکۆلۆژیای ئاگاداری و ریکلام

ئاگاداری هەڵوێستێکی درککارییانەی گشتییە کە وەها لە تاك دەکات بەهۆی ئەو هەڵوێستەی لەلای دروستدەبێت و بەپێی کاریگەرییەکەی دواتر کاردانەوەی هەبێت ، گرنگترین ئەو یاسا درککارییانەی ئاگادارییەکان سوودی لێدەبینن، ئەمانەن:

**یاسای دووبارەکردنەوە:** چوونکە ئەو مادەیەی بوونەکەی لە درککردندا دووبارە دەکرێتەوە ئاسانتر وەبیری تاك دێتەوە و کاریگەرییەکەشی لە ئەوانی دیکە باشتر دەبێت.

یاسای سەرلیستی؛ چوونکە ئەو ئەزموونانەی تاك بۆ یەکەم جار گوزەریان پیادا دەکات گەڕاندنەوەی لەوانی دیکە ئاسانتر دەبێت.

یاسای توندی؛ هەرچەندە وروژێنەرەکان بەهێزتر بوون ئەوا کاریگەرییەکەی بەهێزتر دەبێت و یارمەتیدەری گەڕاندنەوەی دەبێت.

گرنگترین ئامانجەکانی ئاگاداریش وروژاندن و راکێشانی ئاگایی و سەرنجی زۆرترین ژمارەی تاکەکانە، گرنگترین ئامرازەکانی راکێشانی سەرنج لە ئاگادارییەکاندا ئەمانەن:

- فراوانیی ئەو پانتاییەی داگیری دەکات.
- درێژیی ئەو ماوەیەی تیایدا پێشکەش دەکرێت.
- سەرنجراکێشەرییەکەی بەهۆی رەنگەکانی ناوی و ئاسان بینینی.
- ئاگاداریی جوولەدار پتر سەرنج رادەکێشێت.
- باشیی شێوازی نمایشکردنی و روونیی گوزارشت لێکردنی بۆ ئاسانکردنی کردەی تێگەیشتن و وەرگرتنەوە.
- باشی دیزاین و دەرهێنانەکەی و رێکخستنی بەشەکانی بۆئەوەی وەك یەکەیەکی تەواو و یەکگرتوو بێتە بەرچاو.
- شوێنی گونجاو هەروەك لە لاپەڕەی یەکەم و کۆتایی رۆژنامە و زنجیرە درامایەکان و نێوان گۆرانییەکاندا دەخرێتە روو.
- میانڕۆیی لە مادەی ئاگادارییەکە و رێژەی ئاخنین و قەرەباڵغیی زیاد لەپێویست.
- بەکارهێنانی وردی ئامرازەکانی بیستن و بینین لەرووی رەنگ و دەنگ و هەڵبژاردنی کەسێتییەکاندا.

– نوێگەری و هەمەڕەنگکردن یارمەتیدەری ڕاکێشانی سەرنجە، جا ئەگەر لە رووی قەبارە و رەنگبێت، یانیش دەستەواژە و وێنەکانەوە بێت. ئاگاداری و ریکلامەکان سوود لە هەڵچوونەکان وەردەگرن، چوونکە هەوڵی دروستکردنی کەشێکی خۆش و پەسندکراو دەدات و سوود لە گۆرانی و سروود و مۆزیك و رەنگە بریسکەدارەکان و شێوە هونەرییەکان وەردەگرێت، هەروەها بەشێوەیەکی روون سرووش بەکاردەهێنێت.

ئاگاداری و ریکلام بۆ دەستەبەرکردنی رای جەماوەر پشت بە باوەڕپێهێنان دەبەستێت ، کەواتە دەبێ باوەڕپێهێنەر و لۆژیکی بێت. ئاگادارییەکان روو لە رەمەك و پاڵنەرەکانی مرۆڤ دەکەن و لەکاتی ریکلامکردن بۆ بۆن و پۆشاك سوود لە کۆمەڵێك رەمەك وەردەگرن، وەك وێنەی ئافرەتان، هەروەها مانشێتی سەرنجڕاکێش و ورووژێنەر بەکاردەهێنێت. هەروەها ریکلام سوود لە پاڵنەرەکانی وەك حەزی شتزانین و بە موڵککردن دەبینێت.

لەو بنەمایە سەرکییانەی کە دەبێ رەچاوبکرێن وەدیهێنانی پێداویستییە دەروونییەکانی جەماوەرە وەك: پێویستیی تاك بۆ ئاسایش و دڵارامی و حەسانەوە، بۆیە ئاگاداری و ریکلامەکان سوود لەو پێداویستییانە وەردەگرن، چوونکە بەردەوام تاکەکان جەخت لەسەر وەدیهێنانی ئاسایش و دڵارامی و حەسانەوە دەکەنەوە. جا ئاگادارییەکان بەبەکارهێنانی ئەو شتانەی پڕوپاگەندەیان لەبارەوە دەکات سوود لە پێداویستیی تاك وەردەگرێت بۆ ژیانێکی باشتر و بەختیارییەکی تەواوتر و تەندروستییەکی پتەوتر، بۆیە وەها پیشاندەدات کە بە کاڵایەکانی خۆی گەشبینی و تێڕوانینی رووناکتر بۆ ئایندەیەکی گەشتر فەراهەم دەکات.

# پەیوەندییە دینامیکییەکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی قوتابخانەیی

١. پەیوەندیی نێوان فێرخوازان: فێرگە کار بۆ گونجاندن و هەماهەنگی دروستکردنی نێوان فێرخوازان دەکات، ئەمەیش بە وەدیهێنانی پێداویستییەکانیان و پەسندکردنی فێرگە و هەستکردنیان بە پەیوەستبوون بە فێرگە دەبێت، ئەمەیش بەهۆی گفتوگۆیەکان و زۆرکردنی چالاکییەکان و کارکردن بۆ دابەشکردنی فێرخوازان لە پۆل بەپێی بنەمای گونجانی نێوانیان دەبێت.

٢. پەیوەندیی نێوان فێرخوازان و مامۆستایان: دەبێ ئەم جۆرە پەیوەندییە هاوسۆزی و ڕێزگرتنی دوولایەنە باڵی بەسەردا بکێشێت. مامۆستا ڕۆڵی خۆی وەك سەرکردەیەك دیاریی دەکات و بۆ گەیشتن بە ئامانجی ڕوون و دیاریکراو یارمەتیی فێرخوازان دەدات و لەکاریشدا دەرفەتی بەشداریکردنیان پێدەبەخشێت و بە ستایشکردنەوە ڕێزیان لێدەگرێت و بۆ تێکەڵبوون و برەودان بە شێوازی گفتوگۆکردن پتر هانیان دەدات.

٣. پەیوەندیی نێوان مامۆستایان: پشت بە ئاشنایەتی و هۆگری و گونجان و هاوکاریی نێوانیان و بیروراگۆڕینەوەیان دەبەستێت بۆ دانانی پلانی ئایندەیی و دابەشکردنی بەرپرسیاریەتییەکان و ئەرکەکانی نێوانیان.

## کەش لە کۆمەڵەی قوتابخانەدا

منداڵ لە فێرگەدا فێردەبێت، ئەم فێرگەیەش بریتییە لە چەند کۆمەڵەیەك وخۆی لە پۆلەکان و ئەو کۆمەلانەدا دەبینێتەوە کە فێرخواز دەچێتە ریزیانەوە. کۆمەڵەی فێرگەیش وەك کۆمەڵەکانی دیکەی مرۆیی رێبەر و سەرکردەیەکی هەیە و چەند تایبەتمەندییەکی تیادا دەبینرێت کە بۆ سەرکردایەتیکردنی کۆمەڵەکە رێگەی بۆ خۆشدەکات.

رۆڵی مامۆستا لە یارمەتیدانی گشت فێرخوازێك بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان و پەرینەوە لە قۆناغی پشتبەستن بە خەڵکانی دیکە بەرەو قۆناغی سەربەخۆیی و متمانەبەخۆکردنی فێرخوازەوە بەدیاردەکەوێت. هەروەها فێرخواز لە هەستکردن بە کەموکورتی و ئەو شڵەژانانە بەدوور دەخاتەوە کە سەرچاوە لە هەستی خۆ بەکەمگری دەگرن و بەجیا لە هەر فێرخوازێك دەنوارێت و ئەو ئەرکانەیان ناخاتە سەرشان کە لە سەرووی توانای خۆیانەوە بن. مامۆستا بە رەخساندنی ئەو چالاکییە جۆراوجۆرانەی کە تیایدا ئەم هەڵبژاردنەی تیادا شکلگیر دەبێت رۆڵی لە یارمەتیدانی فێرخواز هەیە بۆ ئەوەی هاورێیەکانی وئەو کەسانە هەڵبژێرێت کە لەگەڵی دەگونجێن.

## تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵەی فێرگەیی

- هەستی هاوبەش بە پەیوەستبوون، وەك هەستی فێرخوازی فێرگە بەوەی کە خۆیان و ئەو کۆمەڵەیەی دەیانگرێتە خۆ یەك شتن.

– بوونی حەز و گرنگیدان و بەهای هاوبەش کە تاکەکان لەنێوان خۆیاندا لەسەری رێکدەکەون بۆ کارلێکی کۆمەلایەتی پاڵنەریان دەبێت، واتا کاریگەربوون و کاریگەری دروستکردنی نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان.

- بوونی ئامانجێك یان چەند ئامانجێکی هاوبەشی کۆمەڵەکە کە تاکەکان هەوڵی وەدیهێنانیان دەدەن.

## پۆل وەك کۆمەڵە

کۆمەڵەی پۆل لە کۆمەڵگەی فێرخوازان پێکدێت، هەندێ هۆکار هەن کە یارمەتیدەری گەشپێدانی زۆربەی کارامەییە کۆمەڵایەتییەکانی فێرخوازن و گرنگترینیان ئەمانەن:

١.تەلاری فێرگە لە رووی قەبارە و فراوانی، چوونکە فێرخوازی نێو پۆلێکی قەرەباڵغ ناتوانێ پەیوەندیی کۆمەڵایەتیانە لەنێوان خۆی و هاوپۆلانی و نێوان خۆی و مامۆستایەکانی دروستبکات، هەروەها دەبینین کە کۆمەڵەی فێرخوازان لە ریزەکانی دواوە جیاوازن لە فێرخوازانی ریزی پێشەوە لە رووی گرنگیپێدان و بەشداریکردنیان لە گفتوگۆیەکاندا.

٢. ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتیی نێوان فێرخوازانی پۆل، ئەم هۆکارە رۆڵێکی گەورەی لە گەشەپێدانی کارامەیی ئەو فێرخوازانەدا هەیە کە سەر بە چینە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە جۆراوجۆرەکانن، فێرخواز لە هەڵبژاردنی کۆمەڵەی هاورێیاندا پشت بە گونجانیان دەبەستێت لەگەڵ ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتیاندا.

٣. جیاوازی زۆر گەورەی نێوان فێرخوازان لە تەمەندا، ئەم هۆکارە لەکاتی تێکەڵبوونیان لەگەڵ فێرخوازانی قۆناغەکانی سەرووتردا کەشێکی نائاسایی بۆ فێرخوازانی پۆلە سەرەتاییەکان دروست دەکات وەك: بەشداریی گەورەترەکان لە چالاکییەکاندا.

## ئەرکی کۆمەڵەی پۆلی فێرگەیی لە کارلێککردندا

لە کۆمەڵەی پۆلی فێرگەییدا چوار ئەرك هەن کە کار بۆ کارلێککردنی نێوان تاكو کۆمەڵەکان دەکەن:

١. کۆمەڵەی پۆلی فێرگەیی دەتوانێ کار بۆ گەشەپێدانی پێداویستیی تاك بکات بۆ فێربوون لە کۆمەڵەی پۆل، چوونکە فێرخوازان رووبەڕووی چەندان گرفت دەبنەوە کە ناتوانن بەتەنیا چارەسەری بکەن و هەردەبێ چارەسەرێکی بەکۆمەڵی بۆ بدۆزنەوە، چوونکە مامۆستا یارمەتیی فێرخواز دەدات بۆ ئەوەی لەگەڵ هاوپۆلانیدا لە هەڵوێستو چالاکییە جۆراوجۆرەکاندا کارلێك بکات.

٢. فێرخواز لەمیانی کارلێکی لەگەڵ هاوپۆلانیدا و لەرێگەی چالاکییەکان و کارەکانی بەکۆمەڵدا

دەتوانێ خودی خۆی بدۆزێتەوە و بەرهەمی هەبێت و داهێنان و بکات

٣. پۆلی فێرگەیی بە تاقیگەیەکی تاقیکردنەوەی فێرخواز دادەندرێت، چوونکە تێڕوانین و تێگەیشتنی بۆ ژیان و رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی و پەیوەندییەکانی بەخەڵکانی دیکەوە دەبێتە هۆی ئەوەی فێرخواز بتوانێ بۆ هەڵبژاردنی تێڕوانینەکان لەهەمبەریاندا دەرفەتێکی گونجاو بدۆزێتەوە.

٤. لەمیانی کاریگەریی کۆمەڵەی پۆل و فشارەکانی لەسەر فێرخوازدا بۆئەوەی خۆی لەگەڵ ئەو سیستم و پێوەرانەدا بگونجێنێت کە لەگشت بوارەکانی چالاکییەکەیدا پەسندی کردووە، بۆئەوەی فێرخواز بتوانێ ئاشنای چۆنیەتیی پێکهاتنی ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتییانە بێت کە هەوڵ دەدات خۆی لەگەڵیاندا بگونجێنێت، هەروەها دەتوانێ لە رەفتاری هاوپۆلانی تێبگات و بتوانێ پەیوەندییە

باوەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵەکە دەستنیشانبکات و ئەو پاڵنەرانەی بۆ روونبێتەوە کە خۆیان لەپشت رەفتاری تاکەکانیدا مەڵاس داوە.

## رۆڵی بەڕێوەبەرایەتیی فێرگە لە کارلێکی کۆمەڵەی پۆلیدا

١. دەبێ وەها لە فێرخواز بنواڕدرێت کە یەکەیەکی بایۆلۆژیی دەروونییە و پێداویستیی تایبەت بەخۆی هەیە، واتا لە رووی زیرەکی و حەز و ئاراستەدا جیاوازیی تاکەکەسیی لەنێوان خۆی و هاوڕێکانیدا هەیە و لەسەر بەڕێوبەرایەتیی فێرگە پێویستە گرنگیی تایبەتیی پێبدات.

٢. دەبێ وەها لە فێرخواز بنواڕدرێت کە یەکەیەکی کۆمەڵایەتییە و لەگەڵ گشت یەکەکانی دیکەدا کارلێك دەکات(مەبەست لە فێرخوازانی دیکەیە).

٣. رۆڵی مامۆستا لە کارلێکی کۆمەڵەی پۆلدا لە قبولکردنی گشت گرفتەکانی تاکەکانی پۆلەکەدا بەدیار دەکەوێت کە هەوڵی چارەسەرکردنی بدات و دەبێ لەپەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ فێرخوازاندا بابەتی بێت و ئەو چارەسەر بەکۆمەڵە پێشکەش بکات کە زۆرینە سوودی لێ وەردەگرن.

## بەڕێوەبەری فێرگە و کۆمەڵگەی ناوخۆیی

بە رەچاوکردنی ئەوەی کە بەڕێوەبەری فێرگە سەرکردەیەکە و سەرکردایەتیی کۆمەڵێك تاك دەکات و کاریگەریی لەسەریان هەیە و کارەکانیان ئاراستە دەکات، دەبێ کۆمەڵگەی بەلاوە گرنگ بێت

١. ئەگەر بەڕێوەبەری فێرگە حەز بەوە بکات لە کۆمەڵگەدا کارا و کاریگەربێت، دەبێ ئەمە لەمیانی کۆمەڵە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەی ناوخۆیی و پەیوەندییە ئاڵۆزکراوەکانی نێوان خۆی و ئەندامانی ئەم کۆمەڵانە وەربگرێت و هەڵیبهێنجێ.

٢. لەمیانی ئەم کارلێکەوە یارمەتیی بەڕێوەبەر دەدرێت بۆ ئەوەی پلانەکانی جێبەجێ بکات، بۆئەوەی فێرگە بگاتە ئەو ئامانجانەی کە لەپێناو خزمەتکردنی کۆمەڵگەی ناوخۆییدا دایناوە.

٣. سەرکەوتن و گونجانی بەڕێوەبەر لە کارەکانیدا و ئەو رووداو و گرفتانەی کە چوار دەوریان تەنیوە، نەك هەر لە فێرگە بەڵکو لە کۆمەڵگەی ناوخۆیی چواردەوری فێرگەشدا کە زۆربەی کەسانی نێو فێرگە لەگەڵ خۆیاندا هێناویانە.

٤. دەبێ ئەوە رەچاو بکرێت کە هەڵسانی فێرگە بە رۆڵی پەروەردەییانە لە کۆمەڵگەدا تەنها ئەرکی فێرگە نییە و بەتەنها بەو ناکرێت، بەڵکو دەبێ نێوەندی دیکە هەبن و کاریگەریی پەروەردەییانە لە تاکەکان بکەن، وەك ماڵ و شوێنەکانی پەرستن و هتد، دەبێ کۆی ئەم نێوەندانە بۆ ئەم مەبەستە دەست لەنێو دەستی بەڕێوەبەر بنێن.

٥. دەبێ بەخێوکاران و بەڕێوەبەران و مامۆستایان ئەوە رەچاوبکەن کە بەستنەوەی فێرگە بە ژینگە تەنها لەمیانی پلانی چاکترکردنی گەشەکردنی فێرخوازدا دەبێت.

٦. بەڕێوەبەری فێرگە دەتوانێ ئەم هۆکارانەی خوارەوە بەکاربێنێ بۆئەوەی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگەی ناوخۆیی پتەوتر بکات.

- سەردانیکردنی دایباب بۆ فێرگە و سەردانیکردنی مامۆستایان بۆ ماڵی فێرخوازان‌و کەسانی شارەزای نێو کۆمەڵگە.

- کردنەوەی فێرگە بۆ فێرکردنی گەوران بۆئەوەی هاووڵاتیان هەست بە بەهای فێرگە بکەن.

- دانان و ئامادەکردنی بەرنامەی ئاشناکردن و ناساندن بۆئەوەی ئەوە بە کۆمەڵگەی ناوخۆیی پیشان بدەن کە فێرگە خەریکی چییە و چ چالاکییەك ئەنجام دەدات.

- ئەنجامدانی چەند چالاکییەك کەوا خەڵکانی نێو کۆمەڵگەی ناوخۆیی لە کۆمەڵگەدا هەست بە کاریگەرییە بەهێزەکەی بکەن، وەك بەشداریپێکردنی فێرخوازان لە خاوێنکردنەوەی شار و نەمام چاندان و هەفتەی هاتووچوو و هتد.

## پەیوەندیی نێوان ماڵ و فێرگە

ماڵ بەشێکی کۆمەڵگەیە، بەڵام پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان ماڵ و فێرگە کە بەڕێوەبەری گشتیی دەیوروژێنێ، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە زۆر گرنگە:

١. رەنگە ئەو ماڵەی فێرخواز تیایدا گەورە بووە سەرچاوەی زۆربەی ئەو تەنگوچەڵەمانە بێت کە لە فێرگەدا بەسەر فێرخواز دێت و بەڕێوەبەر ناتوانێت چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە ئاشنای گشت هەلومەرج و کاریگەرییەکانی ماڵی فێرخوازەکە بێت.

- بەڕێوەبەر ئەو بڕیارانە دەردەکات کە پەیوەندییان بە فێرخوازانەوە هەیە، جا بۆ ئەوەی کارایی و کاریگەریی هەبێت، هەردەبێت ماڵی فێرخوازان ئەم بڕیارانە بزانن، بۆ ئەوەی ئەوانیش ڕێز لە بڕیارەکانی فێرگە بگرن و بچنە واری کردارییەوە.

- دەرکردنی ڕێکار و ئاراستەکاری و ڕێنمایی لەهەمبەر زەرورەتی پەیوەندیی ئۆرگانەکانی فێرگە بە ماڵەکانەوە، بۆئەوەی بتوانێ زانیاری و ڕێنمایی ببەخشێتە بەخێوکاری فێرخوازان و ئەو توانایەیان پێببەخشێت منداڵانیان هەڵسەنگێنن و بزانن لەبواری رەفتار و خوێندندا چ کەموکورتییەکیان هەیە.

٤. بۆئەوەی داوەریکردن و بڕیاردانەکانی فێرگە لەسەر رەفتاری فێرخوازان و چالاکییەکانیان ڕاست و دروست بن، هەردەبێ بەڕێوەبەرایەتیی فێرگە هەلومەرجی ماڵەوەی فێرخوازەکە رەچاو بکات.

# ئەو سەرچاوە عەرەبیانەی سوودیان لێوەرگیراوە.

١. ابراهيم أبو عمشة: ١٩٨١، الثقافة و التغير الاجتماعي، بيروت، دار النهضة العربية.

٢. ابراهيم احمد أبو زيد: ١٩٨٧، سايكولوجية الذات و التوافق النفسي، الاءسكندرية، دار المعرفة الجامعية.

٣. أبراهيم عثمان: ١٩٩٢. مبادىء علم الاجتماع، عمان، منشورات جامعة القدس المفتوحة.

٤. ابراهيم ناصر: ١٩٨٥، الانثربولوجيا الثقافية، عمان، منشورات جامعة الاردنية.

٥. أحمد ابو زيد: ١٩٦٨، سايكولوجية الرأي العام ورسالة الديمقراطية، القاهرة، دار النهضة.

٦. أحمد عبد العزيز سلامة: ١٩٧٧، علم النفس الاءجتماعي، القاهرة، دار النهضة العربية.

٧. احمد لطفي بركات: ١٩٨٢، القيم و التربية، الرياض، دار المريخ.

٨. اوتوكلينبرغ: علم النفس الاجتماعي، ترجمة، حافظ الجمالي، بيروت، دار المكتبة الحياة، ١٩٦٧.

٩. بروان: ١٩٦٠، علم النفس الاجتماعي في الصناعة، ترجمة محمد خيري وأخرون، القاهرة، دار المعارف.

١٠. توفيق مرعي، ١٩٨٤، احمد بلقيس: الميسر في علم النفس الاجتماعي، ط٢، عمان، دار الفرقان.

١١. جابر عبد الحميد جابر: ١٩٦٤، عماد الدين سلطان، الفرد وسيكولوجية الجماعة، القاهرة، دار النهضة العربية.

١٢. حامد عبد السلام زهران: ١٩٩٤، علم النفس النمو، القاهرة، عالم الكتب.

١٣. حامد عبد السلام زهران: ١٩٧٧، علم النفس الاجتماعي، القاهرة ، عالم الكتب.

١٤.حامد الفقي : ١٩٨٤، سايكولوجية الفرد في المجتمع، الكويت، دار القلم.

١٥. حسن محمد خيرالدين: ١٩٦٩ ، العلاقات العامة، القاهرة، مكتبة عين شمس.

١٦. حمزة مختار: ١٩٨٢، أسس علم النفس الاجتماعي، ط٢، القاهرة، دار البيان العربي.

١٧. خليل صابات: ١٩٦٩، الاعلان، تاريخه، أسسه، و قواعده، فنونه وأخلاقياته، القاهرة الانجلو المصرية.

١٨. زهير غزاوي: ١٩٩٣، نمو القيم و الاتجاهات عن الطفل ما قبل المدرسة.، بيروت، دار المبتدأ.

١٩. سعد جلال:١٩٨٥، المرجع في علم النفس الاجتماعي، القاهرة، دار الفكر العربي.

٢٠. سناء الخولي: ١٩٨٦، الأسرة و الحياة العائلية، الاسكندرية، دار المعارف.

٢١. سيد احمد عثمان: ١٩٧٠، علم النفس الاجتماعي التربوي، ج١ ، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٢٢.سيد أحمد عثمان: ١٩٧٤، علم النفس الاجتماعي،ج٢، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٢٣. سيد غنيم: ١٩٨٧، سيكولوجية الشخصية، القاهرة، دار النهضة العربية.

٢٤. شاكر مصطفى سليم: ١٩٧٥، مقدمة في الانثروبولوجيا، بغداد، مطبعة بغداد.

٢٥. شارل بلوندل: ١٩٦٢، المدخل الى علم النفس الاجتماعي، ترجمة حكمة هاشم، القاهرة، دار المعارف.

٢٦. صالح محمد أبو جادو: ١٩٩٨، علم النفس التربوي، عمان، دار المسيرة للنشر و التوزيع.

٢٧. صالح محمد أبو جادو: ١٩٩٨، سايكولوجية التنشئة الاجتماعية، ط١، عمان، دار المسيرة للنشر و التوزيع.

٢٨. صلاح مخيمر و عبدة ميخائيل رزق: ١٩٦٠، المدخل، الى علم النفس الاجتماعي، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٢٩. ضياء زاهر: ١٩٨٤، القيم في العملية التربوية، القاهرة، مؤسسة الخليج العربي.

٣٠. عادل حسين: ١٩٦٢، العلاقات العامة، الاسكندرية، منشأة المعارف.

٣١. عباس محمد عوض: ١٩٨٠، فى علم النفس الاجتماعي، بيروت، دار النهضة العربية.

٣٢. عبدالله الرشدان، ١٩٨٥، علم الاجتماع التربوي، جدة، دار الشروق.

٣٣. عبد الله عبد الحي: ١٩٨١، المدخل الى علم النفس، القاهرة، مكتبة الخانجي.

٣٤. عبد التواب هديب: ١٩٦٢، و السيد محمود زكي، القيادة، القاهرة، دار الفكر العربي.

٣٥. عبد الحليم عباس قشطة: ١٩٨٠، الجماعات والقيادة، العراق، وزارة التعليم العالي و البحث العلمي.

٣٦. عبد الحميد لطفي: ١٩٨٢، علم الاجتماع، القاهرة، دار المعارف.

٣٧. عبد الرحمان عدس، محي الدين توق: ١٩٩٨، مدخل الى علم النفس، عمان، دار الفكر.

٣٨. عبد الرحمان محمد عيسوي، ١٩٧٤، دراسات في العلم النفس الاجتماعي، القاهرة، النهضة العربية.

٣٩. عبد الستار ابراهيم: الانسان و علم النفس، الكويت، سلسلة عالم المعرفة.

٤٠. عبد اللطيف محمد خليفة: ١٩٩٢، ارتقاء القيم، دراسة نفسية، الكويت، المجلس الوطني للثقافة و الفنون والآداب.

٤١. عطوف محمود ياسين: مدخل الى علم النفس الاجتماعي، بيروت، دار النشر، ١٩٨١.

٤٢. فؤاد البهي السيد: علم النفس الاجتماعي، القاهرة، دار الفكر العربي، (د،ت).

٤٣. فوزية ذياب: ١٩٦٦، القيم والعادات الاجتماعية، القاهرة، دار الكتاب العربي.

٤٤. فهمي سليم الغزوي واخرون :١٩٩٢، المدخل الى علم الاجتماع، عمان، دار الشروق.

٤٥. كمال محمد المغربي: ١٩٩٥، السلوك التنظيمي، عمان، دار الفكر.

٤٦. كمال دسوقي: ١٩٧٧، الاجتماع ودراسة المجتمع/ ط١ ، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٤٧. كمال دسوقي: ١٩٦٩، دينامية الجماعة فى الاجتماع و علم النفس الاجتماعي، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٤٨. لويس مليكة: قراءات في علم النفس الاجتماعي، المجلد الأول، القاهرة، الدار القومية للطباعة (دت).

٤٩. لويس مليكة : ١٩٨٩، سيكولوجية الجماعات و القيادة، ج١، القاهرة، الهيئة المصرية العامة للكتاب.

٥٠. محمد أحمد الزعبي: ١٩٧٩، التغير الاجتماعي بين النظرية والتطبيق، عمان، دار المجدلاوي

٥١. محمد الدقس: ١٩٩٧، التغير الأجتماعي.

٥٢. محمد عاطف غيث وأخرون: ١٩٨٨، الانثروبولوجيا الثقافية، الاسكندرية، دار المعرفة الجامعية.

٥٣. محمد عمادالدين اسماعيل واخرون: ١٩٨٢، كيف نربي أطفالنا، القاهرة، دار النهضة العربية.

٥٤. محمد عودة الريماوي: ١٩٩٣، في علم النفس الطفل، عمان، دار زهران للنشر و التوزيع.

٥٥. محمد فرج: ١٩٨٠/ البناء الاجتماعي و الشخصية، القاهرة، دار النهضة.

٥٦. محمد الهادي عفيفي، ١٩٧٥، التربية والتغير الثقافي، ط٤، مكتبة الانجلو المصرية.

٥٧. محمد وليد البطش، هاني عبد الرحمن:١٩٩٠، البناء القيمي، لدى طلبة الجامعة الاردنية، مجلة دراسات.

٥٨.محمود السيد أبو النيل: ١٩٨٥، علم النفس الاجتماعي، ج١، ج٢، القاهرة، دار النهضة العربية.

٥٩.مختار التهامي: ١٩٦٧، الرأي العام و الحرب النفسية، القاهرة، دار المعارف.

٦٠. معن خليل عمر: ١٩٨٤، نحو علم اجتماع تربوي، بغداد، منشورات وزارة الثقافة والاءعلام.

٦١. مصطفى فهمي: مجالات علم النفس المجلد الأول، القاهرة، مكتبة مصر.

٦٢. مصطفى فهمي ، محمد القطان: فى علم النفس، المجلد الأول، القاهرة، مكتبة المصر.

٦٣. مصطفى سويف: ١٩٨٧/ الأسس النفسية للتكامل الاجتماعي، القاهرة، مكتبة انجلو المصرية.

٦٤. مصطفى سويف: ١٩٦٦، مقدمة في علم النفس الاجتماعي، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٦٥. مها زحلوق، علي وطفة، ١٩٩٥، الشباب و قيم واتجاهات و مواقف، دمشق، مطبعة الاتحاد.

٦٦. منيرة حلمي: ١٩٨٧، التفاعل الاجتماعي، القاهرة، مكتبة الانجلو المصرية.

٦٧. منير المرسي سرحان: ١٩٨٧، في اجتماعات التربية، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٦٨. نواف كنعان: ١٩٨٠، القيادة الاءدارية، الرياض، دار العلوم.

٦٩. نازلي صالح: ١٩٨٧، التربية والمجتمع، القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية.

٧٠. وصفي عاطف: ١٩٧٥، الانثروبولوجيا الثقافية، مصر، دار المعارف.

لەگەڵ چەندان سەرچاوەی دیکەی ئینگلیزی.

ئیمەیلی وەرگێڕ: salah_sana١٩٧٤@yahoo.com

مۆبایلی وەرگێڕ: ٠٧٥٠٣١٠٧٩٨٣

# ناوەڕۆک

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی | ٥ |
| **بەشی یەکەم: بابەتەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی** | ٧ |
| دەروازە: | ٩ |
| پێناسەی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی: | ١٠ |
| کارلێککردن | ١٤ |
| کارلێکی کۆمەڵایەتی و کاریگەریی کۆمەڵایەتی: | ١٤ |
| پێشکەوتنی مێژووییانەی شرۆڤەکردنی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی | ١٩ |
| دامەزرێنەرانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی: | ٢٢ |
| قۆناغەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لە ١٩٤٠-١٩٨٠ | ٢٣ |
| گرنگیی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لە بوارەکانی ژیاندا: | ٢٥ |
| کۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتی: | ٣٠ |
| دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و ئەو زانستانەی پەیوەندییان پێیەوە هەیە | ٣١ |
| دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لەنێوان دەروونناسی و کۆمەڵناسیدا | ٣٧ |
| **بەشی دووەم: ڕێباز و بەرنامەکانی لێکۆڵینەوە لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و بیردۆزە ئاراستەکراوەکان بۆ توێژینەوە لەم بوارەدا** | ٤١ |
| ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی | ٤٣ |
| ڕێباز و بەرنامەی ئەزموونی | ٤٤ |
| - ڕێبازی وەسفی (نا ئەزموونی) | ٤٦ |

ڕێبازی مێژوویی ........................................ ٤٧

ئەزموونگەریی مەیدانی. ........................................ ٤٨

ڕێگەکانی کۆکردنەوەی زانیاری ........................................ ٤٩

هۆکارەکانی لایەنگری (تحیز) لە لێکۆڵینەوەکانی دەروونیدا ........................................ ٥٣

ئەو بیردۆزە دەروونیانەی بەشداری لە لێکدانەوەی ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا دەکەن.. ٥٤

یەکەم: بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی/ فرۆید........ ٥٤

دووەم: بیردۆزی وروژاندن و کاردانەوە و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی (ڕەفتاری) ..... ٦٤

سێیەم: بیردۆزی بوار و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی (کیرت لیڤین) ........................................ ٦٨

چوارەم: سۆسیۆمەتری لەلای جاکوب مۆرینۆ........................................ ٧٨

پێنجەم: بیردۆزی نمایش و ناساندنی کۆمەڵایەتی Social Representation ........................................ ٨١

شەشەم: سایکۆلۆژیای گەلان و مۆرکی نەتەوەیی........................................ ٨٥

حەوتەم: بیردۆزی سایکۆلۆژیای جەماوەر........................................ ٨٩

هەشتەم : بیردۆزی ڕەمەکەکان لەلای ماکدۆگل........................................ ٩٠

نۆیەم: بیردۆزی کرچفیلد........................................ ٩٣

دەیەم: بیردۆزەکانی دانە پاڵ: ........................................ ٩٦

**بەشی سێیەم: شیاندن و پەروەردەی کۆمەڵایەتی** ........................................ ١٠٣

شیاندن و پەروەردەی کۆمەڵایەتی ........................................ ١٠٥

پێناسەی شیاندنی کۆمەڵایەتی: ........................................ ١٠٥

ئامانجەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی........................................ ١٠٨

شێوە و جۆرەکانی شیاندنی کۆمەڵایەتی........................................ ١٠٩

رۆڵی شیاندنی کۆمەڵایەتی لە پێکهێنانی بونیادی دەروونیدا .................. ١١٠
ئامرازەکانی راگەیاندن: ........................................................ ١٢٧
دەستگەکانی ئاینی ............................................................ ١٢٩
**بەشی چوارەم: چەمکەکانی خود** ....................................... ١٣١
خود: .......................................................................... ١٣٣
چەمکی خود: .................................................................. ١٣٣
رێزو بەهای خود Self -esteem............................................ ١٣٦
ئەو بیردۆزانەی باسیان لە مەسەلەی رێز و بەهای خود کردووە.............. ١٣٨
شێوە و جۆرەکانی چەمکی خود............................................... ١٤١
تایبە تمەندییەکانی چەمکی خود.............................................. ١٤٤
سروشتی کۆمەلایەتیانەی خود ............................................... ١٤٦
کاریگەرییە کۆمەلایەتییەکان لە چەمکی خود: ............................. ١٤٧
**بەشی پێنجەم: کۆمەڵە**................................................... ١٥١
چەمکی کۆمەڵە................................................................ ١٥٣
تایبە تمەندییەکانی کۆمەڵە.................................................... ١٥٣
هەندێ تایبە تمەندیی کۆمەڵە .............................................. ١٥٤
گرنگیی کۆمەڵە .............................................................. ١٦٠
جۆرەکانی کۆمەڵەکان......................................................... ١٦١
دینامیکییەکانی کۆمەڵە Group Dynamics.................................. ١٦٣
بنەمایەکانی دینامیکیەتی کۆمەڵە .......................................... ١٦٤

ڕێگەکانی لێکۆڵینەوە: شێوازەکانی لێکۆڵینەوە لە دینامیکیەتی کۆمەڵەدا ...... ١٧١
یەکەم: توێژینەوەی بواری: ........................................ ١٧١
دووەم: ئەزموونگەریی سروشتی: ........................................ ١٧٢
سێیەم: ئەزموونگەریی بواری: ........................................ ١٧٤
چوارەم: ئەزموونگەریی کرداری ........................................ ١٧٥
پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی ........................................ ١٧٨
پێکهاتن و کاریگەریی پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی ........................................ ١٨٠
پێوەرەکانی پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە: ........................................ ١٨٧
ئەو هۆکارانەی کار لە پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە دەکەن: ........................................ ١٨٨
پێکهاتەی دیموکراسی و ئۆتۆکراتیی کۆمەڵەکان ........................................ ١٩٤
کۆمەڵەکانی مەرجەعی و پتەوی و یەکگرتوویی کۆمەڵە ........................................ ١٩٦
جۆرەکانی کۆمەڵەکانی مەرجەعی ........................................ ١٩٧
کارلێکی کۆمەڵایەتی ........................................ ١٩٩
چەمکی کارلێکی کۆمەڵایەتی ........................................ ١٩٩
مەرجەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی ........................................ ٢٠٠
ئامرازەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی ........................................ ٢٠٢
قۆناغەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی ........................................ ٢٠٣
هۆکارە کاریگەرەکانی نێو کارلێکی کۆمەڵە ........................................ ٢٠٤
کردەکانی کۆمەڵایەتی وەك ڕەهەندێکی کارلێکی کۆمەڵایەتی ........................................ ٢٠٥
ئەو هۆکارانەی وەدیهێنەری بەکێشکردنن ........................................ ٢٢٥

گونجان و وێکچوون ........................................ ٢٣٨
جۆرەکانی گونجان و وێکچوون........................................ ٢٣٩
ئەو هۆکارانەی کار لە هەڵوێستی وێکچوون و گونجان دەکەن ........................................ ٢٤٠
**بەشی شەشەم: چەمکە سەرەکییەکان لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا** ........................................ ٢٤٩
ئاراستە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان Social Attitudes ........................................ ٢٥١
پێشەکی ........................................ ٢٥١
پێناسەکردنی ئاراستە ........................................ ٢٥٢
تایبەتمەندییەکانی ئاراستە ........................................ ٢٥٣
پێکهاتەکانی ئاراستە ........................................ ٢٥٤
پەیوەندیی نێوان پێکهاتەکانی ئاراستە ........................................ ٢٥٥
سەرهەڵدانی ئاراستەکان ........................................ ٢٥٩
پایەداریی ئاراستەکان ........................................ ٢٦١
پێکهاتنی ئاراستەکان ........................................ ٢٦٣
ئەو هۆکارانەی کاریگەرییان لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا هەیە: ........................................ ٢٦٨
جۆرەکانی ئاراستەکان: ........................................ ٢٧٢
سروشتی ئاراستە دەروونییەکان و ڕەهەندەکانی ........................................ ٢٧٨
لایەنە ئەرکییەکانی ئاراستەکان (ئەرکی ئاراستەکان) ........................................ ٢٨٠
هەموارکردنەوە و دەستکاریکردنی ئاراستەکان ........................................ ٢٨٢
گۆڕینی ئاراستەکان بە باوەڕپێهێنان: ........................................ ٢٨٥
بیردۆزی نەگونجان و دژبوونی مەعریفی Cognitive Dissonance ........................................ ٢٩٠

بەهاکان Values ........................................ ٣٠٩
چەمکی بەهاکان ........................................ ٣٠٩
لێکدانەوەی بەهاکان ........................................ ٣١٢
پۆلینکردنی بەهاکان ........................................ ٣١٧
تایبەتمەندییەکانی چەمکی بەها ........................................ ٣١٨
ئاراستە و بەهاکان و پەیوەندیی نێوانیان ........................................ ٣١٩
وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئاراستە و بەهاکان ........................................ ٣٢١
بنەماکانی فێربوون و وەرگرتنی بەها و ئاراستەکان ........................................ ٣٢٣
ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی ........................................ ٣٢٦
چەمکی ڕۆڵ ........................................ ٣٢٦
سیستمی ڕۆڵەکان لەلای پارسۆنز: ........................................ ٣٢٨
سروشتی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی: ........................................ ٣٣٠
ناوەڕۆکی ڕۆڵ: ........................................ ٣٣١
گێڕانی ڕۆڵ: ........................................ ٣٣٣
گرنگیی گێڕانی ڕۆڵەکان ........................................ ٣٣٤
ڕەفتاری ڕۆڵ: ........................................ ٣٣٥
دیاریکەرەکانی ڕۆڵەکان: ........................................ ٣٣٧
جیاوازیی ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی ........................................ ٣٣٨
هەمەجۆریی ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی ........................................ ٣٣٩
فێربوونی ڕۆڵەکانی کۆمەڵایەتی ........................................ ٣٤٠

دابەشکردنی رۆڵەکانی کۆمەڵایەتی ........................ ٣٤٠
کێشمەکێشی نێوان رۆڵەکان ........................ ٣٤١
پەیوەندییەکان لە کۆمەڵەدا لەمیانی ئەو رۆڵە جۆراوجۆرانەی کە تاك لەکاتی کاری بەکۆمەڵدا ئەنجامیان دەدات ........................ ٣٤٥
رای گشتی Public opinion........................ ٣٥٤
چەمکی رای گشتی : ........................ ٣٥٤
جۆرەکانی رای گشتی: ........................ ٣٥٦
تایبه تمەندییەکانی رای گشتی........................ ٣٥٩
پێکهاتنی رای گشتی........................ ٣٦٠
ئەرکەکانی رای گشتی........................ ٣٦١
توێژینەوە و پێوانی رای گشتی........................ ٣٦٤
گۆڕین و هەموارکردنەوەی رای گشتی ........................ ٣٦٥
دەمارگیری و رەگەزپەرستی: ........................ ٣٦٧
چەمکی رەگەزپەرستی ........................ ٣٦٧
سەرهەڵدانی رەگەزپەرستی ........................ ٣٦٨
لێکدانەوەی دەمارگیری و رەگەزپەرستی........................ ٣٧٢
کەمکردنەوەی رەگەزپەرستی و بەرپەرچدانەوەی ........................ ٣٧٧
بەشی حەوتەم: سەرکردەیی........................ ٣٧٩
چەمکی سەرکردەیی ........................ ٣٨١
سەرکردەیی و سەرۆکایەتی Leader Ship and presidency ............ ٣٨٢
رەفتاری سەرکردەییانە ........................ ٣٨٣

بیردۆزەکانی سەرکردەیی ........................................ ٣٨٧
جۆرەکانی سەرکردایەتی و کەشی کۆمەلآیەتی ........................ ٣٩٣
خۆ راهێنان لەسەر سەرکردەیی و سەرکردایەتی ........................ ٣٩٨
**بەشی هەشتەم: دەوروبەر و رەفتاری کۆمەڵایەتی** ................ ٤٠١
دەوروبەر و رەفتاری کۆمەلآیەتی ........................................ ٤٠٣
کاریگەرییە دەروونییەکانی شوێن ........................................ ٤٠٦
دیاردەی چڕیی دانیشتوان و قەرەباڵغیی شوێنی ........................ ٤١٢
**بەشی نۆیەم: پیادەکارییەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی** .... ٤٢١
راگەیاندن: Information ........................................ ٤٢٣
پەیوەندییەکانی گشتی Rublic Relation: ........................ ٤٣٢
پروپاگەندە Propaganda ........................................ ٤٤٢
ئاگاداری وریکلام Advertising ........................................ ٤٤٨
پەیوەندییە دینامیکییەکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی قوتابخانەیی ........ ٤٥٢
ئەو سەرچاوە عەرەبییانەی سوودیان لێوەرگیراوە. ............................ ٤٥٩
ناوەرۆك ........................................ ٤٦٥

